# مێژووی

# زانایانی کورد

دانراوی

مەلا طاهیر مەلا عبد الله بەحرکەیی

بەرگی یەکەم

# مێژووی زانایانی کورد

دانراوی

مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی

بەرگی یەکەم

- ناوی کتێب: مێژووی زانایانی کورد.
- ناوی دانەر: مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی.
- ژمارەی بەرگ: بەرگی یەکەم.
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم.
- ساڵی چاپکردن: ٢٠١٠ز
- ناوی چاپخانە: چاپخانەی ئاراس.
- لەسەر ئەرکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی چاپ کراوە.
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
- نەخشەسازی بەرگ: أحمد فاتح.
- خەتی بەرگ: عبد الباسط ملا مسعود.
- دیزاین و سەرپەرشتی چاپ وپێداچوونەوە: أبوبکر مەلا طاهیر.

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ
حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ
وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

سورة يوسف

# پێشکەش بێ

- بەگیانی پاکی بابی بەڕێزم کە بە خۆشەویستی خوا و ئایین و زانست و زانایان فرچکی دام، وە دایکی لە خواترسم، کە هەمیشە خوای گەورەی لە یاد بوو.

- بەو گەورە زانایانەی کە فەرهەنگ و کولتوریان بۆ ئێمە دامەزراند.

- بە هەموو کوردێکی دڵسۆز کە خزمەتی ئایین و نەتەوەکەی بە ئەرکی سەرشانی دەزانێت.

# سوپاسگوزاری

- كاكم (مەلا طيب)، ژياننامەی ئەو مامۆستايانەی كە بە خزمـەتيان گەيشـتيە يـان بيسـتيتی زۆری لەبـەرە، سـودم لـە زانيايـەكانی وەرگرتيە، وە لە هەموو كاتێك پرس ورام پێكردیە.

- هەموو ئـەو بەڕێزانـەی هاوكاريـان كـردم بـەناردنی ژياننامـەی خزمـەكانيان، ئـەوان لـە هـەموو كـەس باشـتر شـارەزاييان لـە پێبلقـەی ژيانيانيـان هەيـە، وە لـە كۆتـايی ژياننامـەكان نـاوم تۆماركردينە.

- ئـەو بەڕێزانـەی بـە نـاردنی كتێـب و كۆكردنـەوەی سەرچـاوە يارمەتيان دام، زۆرن، تۆماركردنی ناويان زەحمەتە.

- كۆڕبەندی هـزری ئيسـلامی، ئـەركی چـاپی ئـەو كتێبـەی گرتـە ئەستۆی خۆی.

## پەسندکردنی ئەم مێژووە، لەلایەن مامۆستای پایەدار:

## جەنابی مەلا طیب مەلا عبداللە بەحرکەیی

بەناوی یەزدانی تاك و بێ وێنەو بێ هاوتا

بارانی درورد بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری مەزن، محمد المصطفی، وە هەم بۆ کەس و کارەکانی و یارەکانی، بێ پسانەوە، تا ژیانی بێ پایان، لەپاشان، ئەمەیە:

گەلی کورد هەر لەکۆنەوە زاناو ماقوول و خانەدان و ڕۆشنبیرو کاربەدەستی زۆربووە، بەڵام بەداخەوە کەسی وا هەڵنەکەوتووە، کە لە مێژوو کۆیان بکاتەوە، بەس یەك یەك دەدیترێن لەمێژووانی خەڵك، تا ئەم دوایە هەندێك لە زانایانی کورد، وەکو ئیبراهیم فەصیح حەیدەری، ئەمین زەکی بەگ، مامۆستا عبدالکریمی (مدرس)، شێخ محمدی خاڵ، هەستیان بەو بێ کەسیەی کوردان کرد، هەستان بە نووسینی مێژووی هەندێ لە زاناو ڕۆشنبیرانی کورد، ئەم کارە زۆرکارێکی پەسندو پیرۆزبوو، خوای گەورە پاداشیان بداتەوە، بەڵام نووسینەکان زۆر کورت بوون، وەك بلێی (مێوژەك لە کەویژەك) بێت وابووە.

دوای ئەوان سوپاس بۆ یەزدان مەلا طاهیری مەلا عبداللە ی بەحرکەیی کە برای خۆشەویستمە، هەستا بە نووسینی مێژووی زانایانی کورد، بەنووسینێکی زۆر فراوان پاش کۆکردنەوەی گەلێ زۆر سەرچاوان، تا لەدەستی پیرۆزی دەرچوو، چەند بەرگی گەورە لەمێژووی (١٧٧١) هەزار و حەوت سەدو حەفتاو یەك زانای کورد لە صەدەی یەکی کۆچی، تا کاتی ژیانی خۆی، ناوینا (مێژووی زانایانی کورد) داوام وایە لە خودای گەورە، کارەکەی مەلا طاهیر ڕاست بێ، وە بۆ لەچاپدانی ئەم مێژووە هەوڵبدات، بەلای منەوە ئەم کارە زۆر پیرۆزە، چونکە هەم خزمەتی ئایینە، و هەم خزمەتی نەتەوە، خودا

پاداشی بداتەوە بەچاکە، بۆی بکاتە زادو زەخیرەی ڕۆژی دوایی، خودا تەمەنی درێـژ بکـا بۆ ئەم جۆرە خزمەتانە، لەکۆتاییـدا سـوپاس بـۆ خـودای مـەزن، درود بـۆ خۆشەویسـتی نازدارو کەس و کارو یارەکانی.

مەلا طیب مەلا عبدالله بەحرکەیی
پێش نوێژو وتار خوێن و دەرس بێژ
لە مزگەوتی گەورەی ناحیەی بەحرکە / هەولێر
١٠/٧/٢٠٠٧ز

## پەسندکردن

### بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

چەند بەرگێکی کێبی (مێژووی زانایانی کورد)م خوێندەوە کە دانراوی مامۆستای بەڕێز (مەلا تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی)یـە، کـە لەڕاسـتیدا دانراوێکـی هێـژاو بـەنرخ و دانسقەیە و کۆکراوەیەکی پوخت و بەپێزی ژیاننامەی زانایانی کوردە لە کایەی شارستانی ئیسلامیدا لەهەردوو بواری عەقلی و نەقلی، بۆیە هـەموو کـارێکی لـەم شـێوەیە جێگـای دەست خۆشیەو پشت بەخوا کاری باشترو زانستی تری بەدووودا دێت. ئەوەی ئەم کتێبەی بخوێنێتەوە بەڕوونی تێدەگات کە کورد لەمێژووی ئیسلامیدا چ ڕۆڵێکی گێڕاوەو لـەبوارە

جیاجیاكانی زانستدا زانایانی چۆن ئەسپی خۆیان تاوداوەو لێبڕاوانە لە پێناوی فێربوون و فێركردندا بەماڵ و حاڵی خۆیان قوربانی یان داوە.

جێی ئاماژەیە ئێمە لەبواری نووسین و توێژینەوە لەبارەی ڕۆڵی كورد لە شارستانی ئیسلامیدا هێشتا هەر لەسەرەتادا‌ین و پێویستیمان بەنووسەرو پێتۆڵی زۆر هەن كە قۆڵی لێ هەڵماڵن و چاكی مەردایەتی لێ بەلاداكەن و بەكاری بە بڕشتانە، لەو بوارەدا كتێبخانەكانمان ئاوا كەن.

لەكۆتاییدا دەڵێم: هەر كارێكی بە ئاقاری بوژاندنەوەی فەرهەنگی مێژووییمان بكرێت، جێی ڕێزو ستایش كردنەو دەبێتە مەلۆی سەر خەرمانی دیرۆكی قووڵ و بێ نازمان، بریا زۆر مەلای دیكەی لە گوێن مامۆستا مەلا تاهیرمان هەبان، وێڕای خزمەت لە مەیدانەكانی پەرستن و دەرس گوتندا، لەبواری نووسین و توێژینەوەشدا چالاكیان نواندباو تۆزێ سەر یادەوەری و سەربوردەی زانایانی دێرینمانیان تەكاندباو وەكو جاران بەڕۆشنایی خامەكانیان تارمایی سەر ڕابردوومانیان تاراندبا، گەورەیی هەر بۆ خواوەندی تاك و تەنیاو درووود و سەلام لەسەر گیانی پێغەمبەری هەتا هەتا.

د. قادر محمد پشدەری
مامۆستای مێژووی كورد و شارستانی ئیسلامی
بەشی مێژوو/ كۆلێژی ئاداب/ زانكۆی سەلاحەددین

# پەسندکردن

کاتێــك دەستنووســی کتێبــی (مێــژووی زانایــانی کــورد)م خوێنــدەوە زۆر بەختەوەربووم، چونکە دانەری ئەم کتێبە پڕ بایەخە (مـە طـاهیر مـەلا عبـدالله بەحرکـەیی) سەرەڕای ئەوەی خزمەتێکی زۆری ئاینی ئیسلامی کردووە لەڕێگای کۆکردنـەوەی نـاوی ئـەو زانـا کوردانـەی لەکوردسـتان و دەرەوەی کوردسـتان خزمـەتی زانسـت و ئـاینی ئیسلامیان کردووە، لەهەمان کاتدا خزمەتێکی باشی مێژووی کـوردی کـردووە، چـونکە کەرەستەیەکی باشی لەبەردەست مێژوونووسانی کورد داناوە بـۆ ئـەوەی توێژینـەوەی پـتر لەسەر مێژووی ڕۆشنبیری و شارستانی کورد بکەن. بەتایبەتی کە تـاکو ئێسـتاش زۆربـەی ئەو نووسینانەی لەسـەر مێـژووی کـورد نووسـراون لـەبواری مێـژووی سیاسـی بوونـە، لەکاتێکدا کورد مێژووی ڕۆشنبیری و شارستانی کەمتر تۆمارکراوە، کە ئەمەش لایـەنێکی زۆر گرنگی مێژووی هـەر نەتەوەیەکـە، بەداخـەوەش چ لەکوردسـتان و چ لـە دەرەوەی کوردستان نەك هەر لەنێو خەڵکی ئاسایی بەڵکو تەنانەت لەنێو ڕۆشنبیرانیش شارەزاییەکی باش دەربارەی مێژووی ڕۆشنبیری کوردی نیە کە ئاین بەتایبەتی ئاینی ئیسـلام یـەکێك لـە توخمـە پێکهێنـەرە سـەرەکییەکانی ئـەو ڕۆشـنبیرییە، بەڕادەیـەك هـەر کتێبێـك دەربـارەی ڕۆشنبیری کوردی بنووسرێ بەبێ جەخت کردنەوە لەسەر ڕۆڵی مەلاکان لـە ڕۆشـنبیری سەرەکی سەردەمی خۆیان بوونە، قوتابخانەکان هەر قوتابخانەی ئاینی بوونە، ئەم دیاردەیـەش هەر تایبەت نیە بە کوردستان بەڵکو لە ئـەوروپاش خوێنـدنی ئـاینی چـەندین سـەدە پـێش خوێندنی مۆدێرن تاکە بواری خوێندن بووە، هەر لـەم ڕووەوەش زانکۆیـەکی بـەناوبانگی وەکو سۆربۆن لەفەرەنسـا بـەناوی قەشـە (سـۆربۆن)ەوە نـاونراوە، تەنانـەت ئەگـەر پـتر قوڵبینەوە لەمێژووی دەبینین لەشارستانیەتی دۆڵی نیل و دۆڵـی ڕافیـدەین لـەپێش زاینـەوە کاهینەکان (زایۆنەکان) یەکەمین (مامۆستاکان) و پەرسـتگاکانیش یەکـەمین قوتابخانـەکانی ئەو دوو شارستانیەتە دێرینە بوونە.

لەخوێندنی ئاینی لە کوردستان پتر گرنگی بەجۆری نەك بڕی خوێندەواران دراوە، ڕاستە ژمارەی خوێندەوارانی ئاینی لەکوردستان سنوورداربووە، بەڵام جۆری خوێندەواریەکەیان بەرزبووە، تەنانەت ئەگەر سەیری مەلاکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیست بکەین دەبینین ژمارەیەکی بەرچاو لەئەوان لەڕووی زمانەوە (کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی) یان زانیوە، لەکاتێکدا دەرچووانی زانکۆی سەدەی بیست و یەکەم لە کوردستان بەدەگمەن دوو زمان دەزانن، ئێستا لەخوێندنی مۆدێرن بڕی خوێندەواران زۆربووە بەڵام جۆرەکەیان بەشێوەیەکی گشتی باش نیە، بەهەرحاڵ بابەتی خوێندەواری ئاینی و مۆدێرن هەریەکە لایەنی ئەرێی و نەرێی خۆی هەیە، نووسینی یەکجار زۆر هەڵدەگرێ، گرنگی ئەم کتێبە زۆرە یەکێك لە لایەنە هەرە گرنگەکانی کەرستەیەکی دەوڵەمەندی بۆ چەندین کتێبی تر خستۆتە بەردەست، هیوادارین نووسەر هەر بەردەوام بێ لە نووسین و بەرهەمی بەپێزتریش بخاتە کتێبخانەی کوردی.

د. محمد عبدالله کاکەسوور

سەرۆکی بەشی مێژووی ئێواران/ کۆلێجی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەددین

جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژووی کوردستان

سەرنووسەری گۆڤاری مێژوو

## پێشەکی

### بسم الله الرَّحمن الرَّحیم

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان، دانـەری ئـەرزو ڕاگـری ئاسمـان، ڕێژنـە بـارانی ڕەحمەت لەلایەن یەزدان، برژێتە سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئاخیر زەمان، لـەسەر خـۆی و لـەسەر کۆمەڵی یاران، ئێمەش لـەگەڵ سەرجەمی بڕواداران.

پاشان ئەوەی حەز دەکەم بەجـەنابتان ڕابگەیـەنم ئەمەیـە: گـەلی کـورد هـەروەکو گەلانی جیهان، لەکۆنەوە خاوەنی ئایین و زانست و زایناری و بیرو ڕاو ئەندێشەو ڕەوشتی پەسەندو کاری ڕەواو خودی جوان و ئەخلاقی چاك بووە، چەندان مرۆڤی ئـایین پـەروەرو خاوەن ئەو پەڕی پلەی بەرزو کاری ڕێکی لێ هەڵکەوتووە، چەندان شـێخانی تەریقـەت و ئەهلی تەسـەووف و پـیاوانی دڵپـاك و دەرۆن سـافیان هـەبووە، توانیتیـان بـەهێزو دڵ و کردەوەی شەرعی مێشکی خەڵکان ئاوبدەن بەزەمزەمی بڕوایی دەستیان ڕاکێشنە سەرجادە ڕاستی خواناسان، هەروەها چەندان شاسـواری پانـەگۆڕۆ مەیـدانی ڕەوانبێـژییان هـەبووە، مەردو وعەگیـدی بـەناوبانگیان هـەبووە، مێـژووناس و ئەسـتێرەناس و ئاشـناو شـارەزایی وڵاتانیان هەبووە، بـەڵام داخەکـەم، ئاخەکـەم، هـەموویان بزربـوون لـەناو تـەم و تـۆزی ستەمکاری، شرانەوە لەژێر پەردەی بێ دەسەڵاتی و کەسادی، نەنووسـران و نەزانـدران و نەبیسـتران، ڕۆژەك لەڕۆژان نووسەرەك نەبوو نامـەکی تێـرو تەسـەل بنووسـێت لـەژیانیان، مێژووناسەك نـەهات بەتـەواوی بـدوێ لـە باسـیان، دەزگایـەك هەڵنەسـتا بەلەچـاپدان و بڵاوکردنەوەی هەموو بەرهەمەکانیان، جگە لەشتێکی کەم ئەویش نابێتە شیفای ئـەو دەردە گرانە.

حەیفە زانایانی وەك (ابن الحاجب) و (ابن الأثیر) و (زین الدین) ی فەرمودەناس، ناسراو حافزی عێراقی و (ابو زەرعە)ی کوڕی و (ابن الصلاح)ی شارەزوری و (عەلی ئەحمەد هەکاری) ناوبانگیان نەمێنێ، ئەبوبەکری (مصنف) و یوسفی (أصم) و ئەبو سعودی ئامێدی نەزاندرێ چیان دانایە، (ابن الحاج) و (ابن أدم) و (عبدالرحمن)ی جەلی و موفتی زەهاوی و مەلا محمدی خەتێ و ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی و مەلا جەرجیسی هەولێری بخرێنە پشت گوێیان، مخابن نەزاندرێ بێتووشی و شێخ مەعروف و نالی و شێخ ئەحمەدی جزیری و خانی چیان گۆتییە، حەیدەرییەکانی ماوەرانێ ماوەی سێ صەد سالْ خەریکی نووسین و دەرسدانەوەبوون ئیجازەی زانستی هەموو کوردستان دەگەڕێتەوە لای وان، باسیان نەکرێ و لە بیر بکرێن، قزلجی و پێنجوێنی و مەزناوەیی و مەلا ئەفەندی هەولێرو مەلا محمد ئەمینی کونە فلوسەو شێخ طاهای بالیسانی و سەعیدی نورسی کێ بوینە؟ شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی و شێخ مصطفای نەقشبەندی و سەید عبدالرەحیمی مەولەوی و مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) دەربارەی مێژووی ئەو زاتانە هیچ نەزاندرێت.

ئێمە گەلێکین خاوەن هەست و بیر خاوەن دەسەلات، نوسەر ڕۆشنبیر<br>
چەند زاناو دانا، پیری تەریقەت هەلگری نامەی، شەرع و حەقیقەت<br>
چاك و چاکەخواز، کردارو ڕەفتار هەموو ئەندام پاك، جان و دل و زار<br>
دلّی ڕۆناکیان، شەوقیدا جیهان لەدەشت و لەشار، چیا بەرزی کوردان

لەبەر ئەو هۆیانەو چەند هۆیانی تر، بەیارمەتی خوای گەورە دەستم کرد بە نووسینی مێژووی زانایانی کورد، لەکوردستان و لەدەرەوەی کوردستان لەسەرەتاوە لەلام وابوو نووسینی ئەم جۆرە مێژووە کە تا ئێستا بەم شێوەیە دانەندراوە کارێکی زۆر گران و قورسە، پاشان خوای گەورە یارمەتی دام بۆم ئاسان بوو، دەوری سێ صەد سەرچاوەی

بڕواپێکراوی کوردی و عەرەبی و فارسی م چەنك کەوت، جگە لەو زانیاریانەی وەرم گرت لەچەند مامۆستایانی بەتەمەن و شارەزا لەمێژووی زانایان کە هاتووچۆم دەکردن و دەچوومە خزمەتیان، وە بەشێکی زۆرم زانیاری لەکاکم مامۆستا مەلا (طیب) وەرگرت، بەم جۆرە توانیم ژیاننامەی (١٧٧١) هەزارو حەفت صەدو حەفتاو یەك زانای کورد کۆبکەمەوەو ڕێك بخەم و بیخەمە پێش چاو، لەصەدەی یەکی کۆچی، بەرانبەر بە صەدەی حەوتی زایینی، تاکو صەدەی پازدەی کۆچی، بەرانبەر بە صەدەی بیستی زایینی.

لەم نووسینە هەوڵم دایە، بەوردی تەماشام کردیە، دیقەتم کردیە، تاکو زانیاریەکانم ڕاست بێت، لەگەڵ ڕووداوەکان بەرانبەربێت، پێچەوانە نەبێت، زانای کورد نەبوێرم و کەسێك کورد نەبی بەکوردی دانەنێم، بۆیە وادەزانم - خوا بکا هەرواش بی - نووسینەکەم دروست و ڕاست و تەواوە، وە هەر زانایەك لە چەند سەرچاوە ناوی هاتبی هەر هەمووم تۆمار کردیە، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك بیەوێ بەدوای دا بگەڕێ لە سەرچاوەکاندا بە ئاسانی چەنگی بکەوی، دوای تەواوبوونی مێژووەکە، ناوەکانم خستنە سەر شێوەی (أبتث) أ ب ت ث ئەلف و بێ... تاد بۆوەی بە ئاسانی بدیترێنەوە، خوێندەوارەکان ماندوو نەبن.

هیوادارم ئەم مێژووە سوودبەخش بی بۆ گەلەکەمان، بۆشاییەکی گەورە پڕبکاتەوە لەپەرتوکخانەکەمان، جێی ڕەزامەندی زاناو نووسەرو بیسەران بی، لەلایێکەوە بەچاوی سەرو چاوی دڵ، بڕوانە ئەو کردارو ڕەفتارانەی ئەو زاتانە ئەنجامیان دایە، چ خزمەتێك و کۆششێکیان کردیە، چ ڕەنجێکیان کێشایە، بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆز و گەل و نیشتمان، چ هەوڵ و تەقەلایەکیان دایە، بۆ فێرکردنی کوڕانی ئەو گەلە، بەم جۆرە ڕێ و ڕێبازیان بکرێتە سەرمەشقی ژیان، بە ئاوی زێڕ خۆشنووسان، تۆماری بکەن و ڕاست گۆیان بانگەواز بکەن و بیانخەنە سەرزار، بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ چاویان لێ بکەن (لقد کان

لكم فيهم أسوة حسنةٌ لمن كان يرجو الله واليومَ الآخر وَمن يتولّ فإن الله هو الغنيّ الحميد) (الممتحنة / ٦).

لەلایەکی ترەوە وەفاداری و بەئەمەکی بنوێنن، بەرانبەر ئەو پیاوە ماقولانە کە لەزۆر بواری زانیاری یارمەتی ئێمەیان داوە، پێمان نەدەکرا و لەهێزو توانامان نەبوو، ئەوان بوون ئەرکەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان، ئەوان بوون ئێمەیان دەوڵەمەندکرد، ئەوان بوون ئێمەیان فێرکرد، ئەوان بوون ئێمەیان حەساندەوە خوا بیان حەسێنتەوە، بەم بۆنەیە پێویستە چاو بەرزبکەنەوەو دەستەکان بلّند بکەن، لەبەر یەزدانی پاك بپارێنەوە و دوعای خێریان بۆ بکەن (والذين جاؤا من بعدهم يقولون ربّنا اغفرلنا ولأخواننا الذين سبقونا بالأيمان ولا تَجعلْ في قلوبنا غِلاً للذين أمنو ربّنا إنك رؤفٌ رحيم) (الحشر / ١٠).

طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی

کوردستان / هەولێر

١/٩/٢٠٠٧م

– أ –

## ئادەم ئەفەندی هەولێری (١)

ئەو زانایە پاش ئەوەی لــە (هــەولێر) خوێنــدنی تــەواوکرد، رووی کــردە شــاری (ئەستەمبۆل) لەوێ نیشتەجێ بوو، لەبەر ئەوەی زاتەکی لێ هاتو بــوو چــەند پلــەو پایــەیان پێدا، لەوانە ئەوەبوو کە لەبەرواری ١٢١٨ ك ١٨٠٣ ز کردیانە (قازی) شــاری قودســی پیرۆز، ماوە تا ساڵی ١٢١٩ ك ١٨٠٤ ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١١٢

٢. الأكليل في محاسن أربيل ١٣٣.

## ئیبراهیم ئەبو حەرەنەصیبی (٢)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی ئەبو حەرەیە خەڵکی شاری (نوصــەیبینە) لــەوڵاتی خــۆی باری کرد، بۆ شاری (مەککە)ی پیرۆز، لەوێ نیشــتەجێ بــوو، دەرســی فــەرموودەی لــە سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهیدی کوڕی جەبر گێڕایتەوە، هەروەها مەنصوری کــوڕی موعتەمیرو سوفیانی کوڕی عویەینەش لەویان وەرگرتووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٥/ ٣٩٤

٢. اللباب ٣/٣١٢

## ئیبراهیم ئەحمەد حصکەفی (٣)

ناوی تەواو: ناوی ئیبراهیمە، کــوڕی ئەحمــەدی، کــوڕی محمــدی، کــوڕی عــەلی، کوڕی یوسفە، خەڵکی شــاری (حصــن کیفا)یــە لــەنێوان دیاربــەکرو جزیــرە، حصــکەف کورت کرایەوەی حصن کیفایە، مامۆسـتا ناســراوە بــە (ابــن المــلا)ی شــافیعی، لەشــاری (حەلەب) هاتووتە دنیا، لەخزمەت باوکی و مەلایــە چــاکەکانی ئــەو ســەردەمی خوێنــدنی تەواوکرد، ساڵی ٩٥٥ ك ئیجازەی لە (محب الــدین)ی قــازی دیمشــق وەرگــرت، ســاڵی

١٠٠٠ ك چووە سەفەری حەج، پاشان گەڕاوە حەلەب خەریکی دەرسدانەوەو خواپەرستی بوو، تا ساڵی ١٠٣٠ ك کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا لەو بابەتانە کتێبی دانراوی خۆی هەیە: أصول الفقه، الفقه، البلاغه، المنطق، النحو، الصرف، التأريخ، الأدب، الأدعية.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الأثر ١/١١
٢. الأعلام ١/٢٤
٣. كشف الظنون ١/١٨٣، ٢/٢٨٨
٤. هدية العارفين ١/٣٠، ١٠/ ٥ – ٦
٥. معجم المؤلفين ١/٦
٦. مشاهير الكورد ١/ ٦٢
٧. معجم أعلام الكورد ٨ – ٨.

## ئیبراهیم ئەحمەد سەلماسی (٤)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی محمدی، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (سەلماسە) لە باکوری (ورمێ)، ساڵی ٤٣٣ ك ١٠٤١ ز هاتوتە دنیا زانایەکی مەزن و بەتوانابووە بەتایبەت لە تەفسیری قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ)، لەزمانی عەرەبی شارەزابووە، لە ئامۆژگاری دەستی باڵابووە، زاتەکی زۆر بەدین و ڕاست گۆبووە، لەبەرواری ٤٩٦ ك ١١٠٤ ز لەشاری (خوی) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: طبقات المفسرين ١/٣.

## ئیبراهیم ئەدهەم زەهاوی (٥)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی ئەدهەمی، کوڕی صەلاحە، خەڵکی (زەهاو)ـە، ساڵی ١٩٠٢ ز لە (بەغدا) چاوی خۆی هەڵێناوە لەدنیا، هەر لەوێ لەزانکۆی (آل البيت) خوێندنی تەواوکردووە و دەرچووە، زانایەکی بەرزو زمان ڕەوان و شاعیربووە، دیوانی

(النفثات)ی هەیە، هەروەها کتێبی (إبطال اللا نهایة)ی لەبابەتی فەلسەفەوە داناوە، ساڵی ١٩٤٧ ز لە چاپخانەی سەعادەت چاپ کرا، وە لەساڵی ١٩٦٢ ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ـ ٨ ـ

## ئیبراهیم ئیسحاق دیاربەکری (٦)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی یەحیای، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیلی دیاربەکرییە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لەشەوی عاشورای ساڵی ٦٩٥ ك ١٢٩٥ز هاتووتە دنیا دەرسی لەلای مەلایە چاکەکانی ئەو سەردەمی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لە (بەغدا) و (دیمشق) و (میسر) دەرسی داوە، لەمانگی مەولودی ساڵی ٧٧٨ ك ١٢٧٦ ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢٥٥

٢. الدرر الکامنة ١/١٧

٣. مشاهیر الکورد و کوردستان ٦٨

٤. علماءنا في خدمة العلم والدین ١١

٥. معجم أعلام الکورد ٩

## ئیبراهیم ئیسماعیل بیارەیی (٧)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەلا ئیسماعیلی (بیارە)یە، باوك و باپیرانی لەکۆنەوە مەلای بیارەی بوینە، ساڵی ١١٨٥ ك ١٧٧١ ز لەبیارە چاوی خۆی هەڵێناوە لەدینا، دەستی کرد بەخوێندن، ماوەکی زۆر خەریکی خوێندن بوو، بەڵام هێشتا لەخۆ نەبۆوە باوکی کۆچی دوایی کرد، کە تازیەی باوکی کۆتایی پێهات، گوێی لێ بو خەڵکان دەیان گوت: دوای کۆچی دوایی مامۆستا ئیسماعیل، دەبێ ئیبراهیمی کوڕی توانای دەرسدانی فەقێیانی هەبێت؟ ئەو قسە کاری لێ کرد، دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندن، چووە

(سلێمانی) لە مزگەوتی بابا عەلی لای مەلا سەید عبدالکریمی بەرزنجی بەخۆو بەدەستەك فەقێیان، ئەمجا (پاشا)ی بابان فەرمانی دەرکرد لەجێی باوکیان دانا و وەقفی دیارکرد بۆ قوتابخانەکە.

ئەویش درێغی نەکرد بۆ جێ بەجێ کردنی کاروباری ئایینی پیرۆز، مامۆستا هاوچەرخ بوو لەگەڵ مەلا شێخ عبدالله ی خەرپانی و مەلا جەلالی خورمالی، دەستی باڵا بوو لەزانستی بەلاغەو وەضع، بۆ خوێندنی کتێبی (عصام الدینی وەضع) فەقێیان تایبەت دەچوونە خزمەت ئەو بۆ خوێندن، یەك لەو فەقێیانە جەنابی مەولانا خالید بوو، جا ئەگەر فەقێ ئەو تەرزە سوارچاکەبێ، دەبێ مامۆستا چ عەگیدەك بێ؟

لەدەوروبەری ساڵی ١٢٥٠ ك ١٨٣٤ ز لەبیارە کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لەپاش بەجێما: مەلا حوسێن و مەلا طاهیر، مەلا حوسێنیش دوو کوڕی لەپاش بەجێما: مەلا مصطفا و مەلا طیب. مەلا مصطەفا کوڕێکی هەبوو ناو مەلا عەزیر، کرا جێگری (قازی) لەگول عەنبەر سەر بە (سلێمانی). وە لێرەوە کۆتایی بە مەلایەکانی ئەو بنەماڵە هات.

هەروایە دنیا کاروان سەرایە ئێمەش لەدوو وان دەڕۆین وەك بایە
ئەو کاتەت کاتە خودات لەیادە ئیدی سەر پاکی غەوغاو هەرایە

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٤٢٢ – ٤٢٦
٢. یادی مەردان ٢/٥١١ – ٥١٢
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤/٢٥.

## ئیبراهیم حەسەن عەبدالانی (٨)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حەسەنە، خەڵکی گوندی (عەبدالان)ـە، زانایەکی مەزن و بەناوبانگ بووە، زۆر بەدین بووە، خەتێکی خۆشی هەبووە، ساڵی ١٢٩٦ ك ١٨٧٩ ز

کتێبی (الجمع الأوفي في الصلاة على المصطفى)ی نوسیەوە، دانەرەکەی مامۆستا عبدالقادری عەبدالانیە، ناوبراو کۆچی دوایی کرد، مەلا محمدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٢٧٤ – ٢٧٥

## ئیبراهیم حەسەن گۆرانی (٩)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حەسەنی، کوڕی شەهابەدینی شارەزوری گۆرانیە، ناسراوە بە بورهانەددین، لەمانگی شەوالی ساڵی ١٠٢٥ ك ١٦١٦ ز لە (شاران)ی چیایەکانی کوردانی لای مەریوان هاتوتە دنیا، لەوڵاتی خۆی خوێند، دوایی بۆ پەرەپێدانی زانیاریەکەی سەفەری دیمشقی کرد، پاشان چووە (میصر) لەوێ چووە حیجاز ماوەك لەلای مەلا محمد شەریفی گۆرانی و مەلا عبدالکریمی گۆرانی خوێند، پاشان لە مەدینەی پیرۆزکرا (مدرس) لەمزگەوتی خۆشەویست (د. خ)، هەروەها خەریکی فەتوادان و دەرسدانەوە بووە چەند، زانا لەسەر دەستی ئەو پێ گەیشتوونە، لەوانە: شێخ ئیلیاسی کوردی و سەید محمد عبدالرسول بەرزنجی و مەلا محمدی کوڕی لەگەڵ زۆرانی تر.

بەرهەمەکانی:

١- إمداد ذوي الإستعداد لسلوك مسلك السداد.

٢- الأمم لإيقاظ الهمم.

٣- تكميل التصريف لە ١٠٥١ ك لە مەریوان تەواوی کردووە.

٤- مسلك التعريف بتحقيق التكليف.

٥- اسعاف الحنيف لسلوك مسلك التعريف.

٦- مشروع الورود الى مطلع الجود.

٧- إبداء النعمة في تحقيق سبق الرحمة.

٨- جلاء النظر في بقاء التنزيه مع التجلّي في الصور.

٩- كشف المستور عن جواب سؤال عبدالشكور.

١٠- التوصيل إلى أن علم الله بالأشياء أزلا على التفصيل.

١١ـ شموس الفكر المنقذة عن ظلمات الجبر والقدر.
١٢ـ جلاء الأنظار بتحرير الجبر في الأختيار.
١٣ـ إيقاظ القوابل: لە ١٠٨٩ ك تەواوی کردووە.
١٤ـ الردّ المتين عن الشيخ محيي الدين، ساڵی ١٠٩٣ ك لە مەدینەی پیرۆز تەواوی کردووە.
١٥ـ مطلع الجود بتحقيق التنزيه في وحدة الوجود، ساڵی ١٠٨٨ ك لە مەدینەوەی پیرۆز تەواوی کردووە.
١٦ـ تكميل الجرجاني
١٧ـ فتاوى.
١٨ـ رسالة في الجزء الإختيار.
١٩ـ الأسفار عن أصل استخارة أعمال الليل والنهار.
٢٠ـ تنبية العقول على تنزيه الصوفية عن إعتقاد التجسيم والعينية والأتحاد والحلول، لەگەڵ نزیکەی سی دانراوی تر، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) لە (علماؤنا) لاپەڕەی (١٧) لیستی بۆ کردون.

کۆچی دوایی: مامۆستا ئیبراهیم ساڵی ١١٠١ ك ١٦٨٩ ز لە مەدینەی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بەقیع) بەخاك سپێردرا.

سێ کوڕی لەدوا بەجێمان: ١ـ مەلا محمد: دانراوی هەیە. ٢ـ مەلا عبدالله: دانراوی هەیە. ٣ـ عیسا، ئەویش کوڕێکی هەبوو ناوی محمد مەلایەکی چاك بوو.

منیش دەڵێم:

ئێمەش گەلێکین خاوەن هەست و بیر    خاوەن دەسەڵات نووسەر ڕۆشنبیر
چەند زاناو دانا، پیری تەریقەت    هەڵگری نامەی شەرع و حەقیقەت
چاك و چاکەخواز، کردارو ڕەفتار    هەموو ئەندام پاك جان و دڵ و زار
دلی ڕووناکیان، شەوقیدا جیهان    لەدەشت و لەشار، چیا بەرزی کوردان

به قەلەمی تیژ، وەك نووکی خەنجەر دەیبڕی جەرگی، دوشمنی بەدفەڕ
داخەکەم ئێستا مەلا نەماوە لەژێر پای نەزان، قەلەم شکاوە
جا من چی بکەم، خۆڵ لەکوێ بینم؟ بەسەرخۆم بکەم، رێ بدا دینم
(طاهیر) چ ناکرێ ئاخیر زەمانە بۆ سانەوەی سەر ببڕە زمانە

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٦/٦٠/٩٧/٦/٢٨/١
٢. معجم اعلام الكورد ١٠-١١-٦٤٣
٣. مشاهير الكورد و كوردستان ٧٤ – ٧٥
٤. البدر الطالع ١/١١ – ١٢
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦ – ١٨ – ٤٠ – ٤١
٦. هدية العارفين ٥/٣٥ – ٣٦
٧. مشاهير الكورد ١/٦١ – ٢٦٠
٨. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٢١٥ – ٢٢٥ – ٤/٢٠٦ – ٢٦٤ / ٦١ – ٢٦٠
٩. ايضاح المكنون ٣/١٢٦ – ٣٢٦ – ٣٣٦
١٠. معجم المؤلفين ١/٢١ .
١١. سلك الدرر ١/٥ – ٦

## ئیبراهیم حوسین دیاربەکری (١٠)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حوسێنە، خەڵکی شاری (دیاربەکر)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، پلەی (مدرس)ی پێدراوە، لەدەورووبەری ساڵی ١٢٥٥ ك ١٨٣٩ ز کۆچی دوایی کرد، کتێبی (الولدیة) ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/٢٣

٢. مشاهير الكورد ١/٥٩
٣. هدية العارفين ٥/٤٤
٤. معجم أعلام الكورد ٩

## ئیبراهیم حوسێن رمکی (١١)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حوسێنە، خەڵکی (رمکان)ـە، گوندێکە نزیك (ڕانیە)، هەروەها (رمك) تیرەکە لە عەشیرەتی (بلباس) مامۆستاش لەو تیرەیە، شیخ ئیبراهیم فەصیح دەڵێ: (زانایەکی پایەدارو بەدین بوو، خەریکی خواپەرستی بوو، ڕوو لەخوا بوو، دنیاداری نەدەکرد، دەرسی لەلای مەلا محمدی خەتێ و مەلا عەلی روستێ خوێندووە، زانستەکانی لەلای مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی تەواوکردووە، ماوەی چەند ساڵ لەخزمەتی بووم، لەو ماوە چەندان کتێبی فیقە و نەحو و صەرف و مەنتیق و ئاداب و بەلاغەم لەلا خوێند، لەگەڵ مامۆستا ئەحمەدی گەلالی پێکەوە دەرسیان دەدا، ئەگەر یەکیان دیار نەبا دەچوومە خزمەت ئەوی تر).

ناوی کتێبەکانی لەلای خوێندووە، بەدرێژی نووسیون، ناوبراو چووە سەفەری حەج، پاشان چووە (میصر) لەوێوە چووە (حەلەب) لەوێ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١١٩ – ١٣٩ – ١٤٠
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢ – ٢٣

## ئیبراهیم حوسێن سروجی (١٢)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حوسێنی، کوڕی موسای، کوڕی ئیبراهیمە، لەلایەن چەندان زانایانی خوێندووە، خۆشی دەرسی داوە، هبةالله ی شیرازی لە لیستی مامۆستایانی خۆی ناوی ئەو زاتەی تۆمار کردووە، ناوبراو لە (سروج) ووتارخوێن بووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ٣/٢١٧

٢. الأنساب ٣/٢٧٣

٣. اللباب ٢/١١٤

## ئیبراهیم حوسێن سیواسی (١٣)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حوسێنە، خەڵکی شاری (سیواس)ـە، زانایەکی ئەهلی تەصەووف بووە، لە ٨٨٧ ك ١٤٨٢ ز کۆچی دوایی کردووە کتێبی (گولزاری مەعنەوی) لە بابەت تەصەووف بەزمانی تورکی داناوە.

سەرچاوە: هدیة العارفین ١/٢٣

## ئیبراهیم حەیدەر حەیدەری (١٤)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی حەیدەری، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەیدەرە، مامۆستا جەمیل ڕۆژبیانی دەڵێ: {ئەوەش هەر لەلای باوکی خۆی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە}، لەبنەماڵەی حەیدەریان زێتر لەهەموویان ناسراوە زانایان ڕویان تێکردووە، قورسی زانستی وەك چیایەکانی کوردستان بووە، میوەی باغی زانینی هەردەم خۆراکی ڕۆشنبیران بووە، مەرجان و دوڕی دەریای زانیاری کۆتایی نەدەهات.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ١١٥٧ ك ١٧٤٤ ز کۆچی دوایی کرد، بەلێکدانەوەی ئەبجەدی ڕستەی (گل باغ جنان) یان بۆ داناوە: (گل) = ٥٠، (باغ)= ١٠٠٣، (جنان)= ١٠٤، کۆ= ١١٥٧.

مێژوونووس عیصامەدین عومەری لە کتێبی (الروض النضر) دەڵێ: {لەهەموو جۆرە زانستەکان کتێبی دانراوی خۆی هەیە}

بەشێك لەو کتێبانە ئەمانەن:

١ـ ملهمات ربانیة في أسرار ذوقیة وجدانیة ساڵی ١١٥١ ك لەگوندی (ماوەران) دایناوە.

٢ـ شەرحی قەسیدەی (بانت سعاد).

٣ـ تەفسیری قورئانی پیرۆز، دوو بەرگە.

٤ـ حاشیە لەسەر (تحفة)ی ئیبن حەجەر.

٥ـ شەرحی (تشريح الأفلاك).

٦ـ حاشیە لەسەر شەرحی (جمع الجوامع).

٧ـ حاشیە لەسەر شەرحی (عصام الدين) زانستی بەیان.

٨ـ حاشیە لەسەر (الكواكب الدرية في القواعد الجفرية).

٩ـ شەرحی (زەوراء)ی جەلالەددینی دەووانی، ساڵی ١١٠٧ ك ١٦٩٥ ز دایناوە، ساڵی ١٣٩٢ ك ١٩٧٢ ز نوسخەکم لەسەر دەستخەتی دانەر لە بەحرکە نوسییەوە، ئێستا لەلامە.

١٠ـ حاشیە لەسەر (قول ئەحمەد)ی فەنناری مەنتیق نوسخەکی دەستنووسمان لەلایە، لە ١٢٧٤ ك ١٨٥٧ ز نووسرایتەوە.

١١ـ حاشیە لەسەر حاشیەی (ئولوغ بیگ) ئاداب

١٢ـ حاشیە لەسەر حاشیەی (میرزاجان) لەسەر حاشیەی سەید شەریفی جورجانی.

١٣ـ حاشیە لەسەر حاشیەی سەیلەکوتی لەسەر شەرحی (شەمسیە)ی مەنتیق

١٤ـ شەرحی دیوانی (ابن الفارض) بەزمانی فارسی ساڵی ١١٠٧ ك ١٦٩٥ ز تەواوی کردووە.

١٥ـ شەرحی (رباعیات)ی خۆی بەزمانی فارسی.

١٦ـ اللمعة الرجبية، تەفسیری سورەتی (الأخلاص)ـە ساڵی ١١٠٤ ك تەواوی کردووە.

١٧ـ (الرسالة القدسية الطاهرة) شەرحی (الدرة الفاخرة)ی مەولانا عبدالرحمانی جامی یە، ساڵی ١١٠٦ ك تەواوی کردووە.

١٨ـ حاشیە لەسەر حاشیەی (خطائي) لەسەر (مختصر)ی تەفتازانی، لەکوردستانی داناوە، پێشکەشی بە باوکی کردووە لە (بەغدا).

١٩ـ حاشیە لەسەر (رسالة العضدية) لە زانستی (وضع).

٢٠ـ شەرحی (رباعیات)ی جەلالەدینی دەوانی، لە (ئەستەمبۆل) دایناوە.

کورەکانی: ئیسماعیل و عاصم و فتح الله و فضل الله و صبغه الله و عبدالله و عارف، ئەوەیان ساڵی ١١١٢ ك ١٧٠٠ ز لەدایك بووە.

سەرچاوەکان:

١- عنوان المجد ١٢٣ – ١٢٧
٢- إيضاح المكنون ١/٥٦٧
٣- معجم المؤلفين ١/٢٧
٤- علماء و مدارس في أربيل ٤٦
٥- معجم اعلام الكورد ١١
٦- علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨ – ١٩
٧- بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٦٥ – ٢٧٨
٨- کاروان (٨٧) ساڵی ١٩٩٠ ز.
٩- بنەماڵەی زانیاران ٢٢٩ – ٢٣٠

## ئیبراهیم داود دیاربەکری (١٥)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی داودە، خەڵکی شاری ئامەدی دیار بەکرە، پاشان چویتە (دیمشق) لەوێ باری کردووە، بۆ (قاهیرە) لەسەر دەستی تەقیەدین ئیبن تەیمیە ئیسلام بووە، دەرسی لەلای فەقێیانی ئەو خوێندووە، تابویتە مەلا، لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی ڕۆیشتووە، بیروبڕوای ئیمامی ئەحمەدی لەلا پەسندبووە، بەسە بۆ گەورەیی ئەم زاتە، کەیەك بووە لە مامۆستایەکانی شێخ ئەحمەدی کوڕی حەجەری عەسقەلانی فەرموودەناس. ساڵی ٧٩٧ ك ١٣٩٤ ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١- شذرات الذهب ٦/٣٤٧
٢- معجم أعلام الكورد ١٣

## ئیبراهیم دۆغرەمەچی (١٦)

(دۆغرمە) وشەکی تورکییە، بەمانا تێکوشینی شیو (چێشت)ە، وادیارە یەك لە باب و باپیرانی ئەو زاتە چێشتخانەی هەبوبێت، بۆیە ئەو بنەماڵە ناسراون بەو ناوە، ئەوانە بەرە بابەکی دیارن لە هەولێر، خاوەنی گوندانی (کەسنەزان) و (حەسارۆکان)ن، ریش سپیەکەیان ناوی عەلی پاشا بوو، پاشان زۆریان چونە (ئەستەمبۆل).

مامۆستا لەلای شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی لە عومەرئەفەندی باوکی مەلا ئەفەندی هەولێر وەرگرتووە، پاشان بویتە مەلا لەمزگەوتی (شێخان) لە قەڵات، کە بەسەرکەوتی کەمەك بەلای ڕاستە بڕۆی ئەوێ شوێنیتی، لەوێ بەردەوام بوو لەسەر جێ بەجێ کردنی کاروباری ئاینی و دەرسدانەوەی فەقێیان، جەنابی شێخ مصطەفای نەقشبەندی هەولێر یەکە لە فەقێیانی ئەو زاتە، بۆیە زۆر باسی بەدینی و مەلا چاکی دەکرد، مامۆستا خەتی خۆش بووە، لەبەرواری ١٢٨٨ ك ١٨٧١ز کتێبی (تشریح الأفلاك)ی نووسیتەوە، ئێستا لەلامانە، لەکاتی خۆی کاکم مەلا (طیب) نیشانی شێخ مصطەفایدا کە تەماشای کرد، یادی مامۆستای کردەوە دەستی کرد بەگریان.

منیش دەڵێم:

ئیخلاص کێوەچو، کێوەچو وەفا؟ هەموو ڕۆیشتن وەك شێخ مصطەفا

ئاخەکەم لەبۆ ئاینی پەروەران داخەم لەبۆ زاناو سەروەران

کوا ئەهلی تەقوا؟ کانی شەرع زان؟ فەرموودەناس کوا؟ کوا ئەهلی قورئان؟

نەزان زانایە، جاهیلە دانا ئەوەی ڕاست دەڕوا نیتی توانا

ئاین بەردرا، گیراوە (پارە) چارەمان بکە خوایە هاوارە

(طاهیر) چ ناکرێ بەس خۆت لەدەستە ئاگات لەخۆ بێ، ئەوەندە بەستە.

سەرچاوەکان:

١ـ أربيل في مختلف العصور ١٠٨ ـ ١٠٩ ـ ١٣٣

٢ـ النجم الزاهر ٥٠

## ئیبراهیم شیبان قرمیسینی (١٧)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی شیبانە، نازناوی ئەبو ئیسحاقە، خەڵکی شاری قورمیسین – کەرمانشا – یە، یەکەم شێخی دەوری خۆی بووە، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، لەلایەن چەند مامۆستایانی خوێندووە، لە (دینەوەر) دابەزیوە، ماوەك لەوێ دەرسی داوە، چەند زانای پێ گەیاندون، ساڵی ٣٣٠ ك ٩٤١ ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١ البداية والنهاية ١١/٢٥١

٢ اللباب ٣/٢٨

٣. الأنساب ٤/٤٥٨.

٤. حلية الأولياء ١٠/٣٦١

## ئیبراهیم صالح دۆلەبەکری (١٨)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی صالحی، کوڕی مصطەفایە، ساڵی ١٨٩٧ ز لەگوندی (سەعدوناوە) چاوی خۆی هەڵێناوە لەدنیا.

خوێندنی: لەلای مەلای گوندەکە دەستی کرد بەخوێندن، دوایی چووە حوجرەکانی فەقێیان، تا قۆناغی سوختەیی بڕی، ئەمجا چووە مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر لە (هەولێر) لەلای مەلا مەعروف دەرسی دەخوێند، دوایی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، دوایی چووە (شەقلاوە) لای مەلا طاها، ماوە لەخزمەت ئەو تا کۆتایی بەخوێندن هێنا. گەڕاوە خانەقا و مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر لە هەولێر، لەوێ یەك لەکوڕانی شێخ ناوی عبدالرحمان بوو، ناسرابوو بە شێخ ئاوڕەحمان ئامۆژگاری کرد، بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان واباشە ببێت بەمەلا.

بووە مەلا لەگوندی (قولتەپە) زۆر لەوێ نەماوە، باری کرد، بۆ گوندی (دۆلەبەکرە) دوایی هاتە (هەولێر) بووە پێش نوێژ لەمزگەوتی صالح چەلەبی، پاشان چووە مزگەوتی حەیدەر أغا لە گەڕەکی (ئازادی) لەوێ ماوە، تا ساڵی ١٩٦٥ ز کۆچی دوایی

کرد، لەگۆڕستانی شێخی چۆلی بەخاك سپێردرا. مامۆستا عبدالکریمی کوڕی مەلایەتی تەواوکرد، دوایی بۆ خوێندن چووە (قاهیرە) گەڕاوە (هەولێر) ماوەك بەڕێوەبەری ئەوقاف بوو، دوایی بووە بەڕێوەبەری پەیمانگای ئایینی سەر بە ئەوقاف، ئێستا ئەندامی لێژنەی فەتوایە لەیەکیەتی زانایانی کوردستان.

سەرچاوە: کەشکۆلی دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی

**ئیبراهیم صبغة الله حەیدەری (فەصیح) (١٩)**

ناوی تەواوی: ناوی ئیبراهیمە، کوڕی صبغة الله ی کچگەیە، کوڕی ئەسعەدی، کوڕی عبدالله ی، کوڕی صبغة الله ی گەورەیە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی حەیدەری، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری، کوڕی محەممەدی کوڕی حەیدەری پیرەدینە.

ساڵی ١٢٣٥ك – ١٨١٩ز لە شاری (بەغدا) چاوی خۆی هەڵهێناوە لە دنیا نازناوی (فەصیح) بووە، ناسراوە بە (حەیدەری زادەی بەغدایی) لە زانایە بەرزەکانی حەیدەریان بووە، دەرسی فەقێیانی داوە، ماوەك جێگری (قازی) بووە لە (بەغدا)، ئەدیب و نووسەر و ڕۆشنبیر و مێژووناس بووە، خوێندنی وەك خۆی باس دەکات: {چەند ساڵ لە (بەغدا) لە خزمەت مامۆستا ئەحمەدی گەلالەم خوێند، لێی دانەدەبڕام، لە دوای نوێژی بەیانی، تا دوای نوێژی مەغریب مامۆستا ناوە ناوە خۆی لێ دەشاردمەوە، بۆ خواپەرستی دەچووە مزگەوت، منیش بە دوویدا دەچووم لەوێش وازم لێ نەدەهێنا، هەر پرسیارم لێ دەکرد، مەلا و فەقێیان گازەندەیان لێ دەکرد، پێیان دەگوت: مامۆستا بۆچ ئەوەندە لەگەڵ ئەوە خۆت ماندوو دەکەی دەگەڵ ئێمەش واناکەی؟ مامۆستا وەڵامی دەدانەوە: (ئەوە هەقەکەی باوك و باپیرانیەتی لەسەر هەموومانی هەیە، چی بۆی بکەم هەر کەمە)}.

شێخ ئیبراهیم فەصیح ئەم کتێبانەی لە لای مامۆستا ئەحمەدی گەلالەیی خوێندوونە بەم شێوەیە باسیان دەکات:

١. مغني اللبيب.
٢. الكتاب ی سيبويه.

٣. خلاصة الحساب.

٤. تحفة ی ابن حجر لە سەر منهاج.

٥. حكمة العين لەگەڵ حاشیەی (سەيید)

٦ بەشێك لە (مطول) لەگەڵ حاشیەی سەیلەکوتی.

٧ أشكال التأسيس.

٨. جمع الجوامع لەگەڵ حاشیانی (ابن أبي شريف) و (شێخ زەکەریا)

٩. شەرحی (مختصر المنتهي) لەگەڵ حاشیەی (سەيید).

١٠ خەیالی و عبدالحکیم.

١١ اثبات الواجب.

١٢ تەفسیری بەیزاوی.

١٣ شەرحی عەقایدی دەوانی و حاشیەی (محاکمات).

١٤ شەرحی (مطالع) لەگەڵ حاشیەی (سەيید).

١٥ شەرحی دەوانی لەسەر (تهذیب) لەگەڵ (میر أبوالفتح).

١٦ شەرحی (الأندلسية)ی عەروز و قافیە.

١٧ شەرحی ئیساغۆجی لەگەڵ حاشیەی محیّدین.

١٨ شەرحی الفیەی سیوطي.

١٩ بەشێك لە (جامی).

٢٠. شەرحی تەسریف (سەعدینی).

هەروەها لەلای مامۆستا ئیبراهیم حوسێن ڕەمکی ئەو کتێبانەی خوێندووە:

١ فناري وقول ئەحمەد لەگەڵ حاشیەی عبدالله و ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

٢ محەممەد ئەمینی جهة وەحدة، لەگەڵ حاشیەی غیاسەدین.

٣. عبدالله یزدي لەگەڵ حاشیەی عبداللطیف.

٤. عیصامەدینی ئیستیعارە لەگەڵ حاشیانی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر و محەممەد حوسێن و شەرانشی.
٥. عصام الدین وە صنع لەگەڵ حاشیانی حەیدەری کوڕی ئەحمەد و شەرانشی.
٦. میر أبو الفتح ئاداب لەگەڵ حاشیەی عبداللەی کوڕی حەیدەر و محەممەد حوسێن.
٧. شەرحی مەسعوودی لەگەڵ ئۆلۆغ بێگ و عبداللطیف.
٨. شەرحی شەمسیە لەگەڵ حاشیەی سەیید و داود خەوافی.
٩. ئەشباە و نەظائیری (سیوطي).
١٠. بەشێك لە شەرحی مەنهەج.
١١. شەرحی (المقدمة الحضرمیة).
١٢. بەشێك لە (تحفە).
١٣. (الفوائد المدنیة).
١٤. حاشیانی میصری و (إبـن قاسـم) و بـەرزنجی و مـەلا ئەحـمـەدی گـەرەوی لەسـەر سەعدینی.
١٥. حاشیانی عبدالغفور و عبدالحکیم و عصام لەسەر (جامی)
١٦. چارەپەردی لەگەڵ حاشیەی (ابن جماعة).

مامۆستاکانی:

١. مەلا ئەسعەدی باپیری، ماوەی نـۆ سـاڵ لـە خزمـەتی خوێنـد، چـونکە بـاوکی گەڕابۆوە کوردستان بۆ خوێندن.
٢. محەممەد سەعید موفق (الحلبی).
٣. مەلا محەممەدی ڕۆژبیانی.
٤. مەلا عبداللە ی داغستانی.
٥. مەلا یـەحیای مـزوری بوخـاری شـەریف و شـەرحی نخبـە الفکـر و (الأشـباە والنظائر)ی سیوطي لەلا خوێند ئیجازەشی لێ وەرگرت.

٦. مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی.
٧. مەلا ئەحمەدی مەلا رەسولی گڕاوی.
٨. ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلای هەولێری.
٩. مەلا مەحموودی ئۆمەر گومبەتی.
١٠. داود پاشای والی (بەغدا).

مامۆستا ئیبراهیم فەصیح دەستێکی بالآی هەبووە لە نووسین، ئەو کتێبانەی لەسەردەمی ئەو دەخوێندران، زۆربەی حاشیەی لەسەر نووسینە یا شەرحی کردوونە.

بەشێك لە دانراوەکانی:

١. فصيح البيان في تفسير القرآن.
٢. أعلى الرتبة في شرح نظم النخبة.
٣. إمداد القاصد في شرح المقاصد للنووي.
٤. فك الاشتباك في شرح تشريح أفلاك.
٥. راحة الأرواح في شرح الاقتراح للسيوطي.
٦. عنوان المجد.
٧. المجد التالد في مناقب مولانا خالد.
٨. سنوحات في التصوف.
٩. الحسب والنسب.
١٠. أحسن الكلام في مدينة السلام.
١١. كامل التوقيع في البديع.
١٢. الصراط المستقيم في الرد على النصارى.
١٣. منظومة الآداب.
١٤. إمعان الألباب في الاسطرلاب.
١٥. امعان الفكر.

١٦. النكت الشنيعة في الخلاف بين الله والشيعة.

١٧. شرح المقامات الحريرية.

١٨. شرح ديوان أبي تمام.

١٩. شرح المقامات الطيفية للسيوطي.

٢٠. حاشية على كتاب سيبويه.

٢١. احسن المقال في شرح رسالة خلق الاعمال.

٢٢. نفح الرند في شرح سقط الزند.

٢٣. حاشية على الچارەپەردی.

٢٤. حاشية على شرح الفية أبن المالك.

٢٥. حاشية على شرح السراجية للسيد شريف في الفرائض.

٢٦. حاشية على المجلد الاول من تحفة المحتاج.

٢٧. حاشية على الاشباه والنظائر للسيوطي.

٢٨. غوص البحار لإخراج الدرر المنتقي الى الأمصار.

٢٩. حاشية على مغني اللبيب.

٣٠. حاشية على حكمة العين.

٣١. حاشية على مختصر المنتهي.

٣٢. حاشية على ئولوغ بێگ.

٣٣. حاشية على الفاكهي.

٣٤. حاشية على قول أحمد في المنطق.

٣٥. حاشية على المصري.

٣٦. حاشية على القرەباغي.

٣٧. حاشية على مير أبو الفتح.

٣٨. حاشية على اللاري في علم الحكمة.

٣٩. حاشية على محمد حسين مير أبو الفتح.
٤٠. التلميحات الى معاني المحاكمات.
٤١. حاشية على السيلكوتي في النحو.
٤٢. حاشية على السيلكوتي في المنطق.
٤٣. حاشية على السيلكوتي في البلاغة.
٤٤. حاشية على حاشية جده على السيلكوتي.
٤٥. أصول الخيل والإبل.
٤٦. رسالة في الوقت.
٤٧. رسالة في البيع.
٤٨. تعليقات في الإفتاء.
٤٩. النوادرالحكمية في شرح الرسالة الإغريقية.
٥٠. تذكرة الأذكياء وتبصرة الأغبياء في عصمة الأنبياء.
٥١. حسن الوفاق في مكارم الأخلاق.
٥٢. الرسالة الجفرية.
٥٣. إلقاء الحجر في فم من هذي وفجر.
٥٤. شرح ألغاز عبدالله ئەفەندی العمري الموصلي.
٥٥. نهاية المراد في أحوال بغداد.

كۆچی دوایی: لە بەرواری شەوی دووشەممەی (٥)ی مانگی سەفەر ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لە (بەغدا) كۆچی دوایی كرد، لە گۆڕستانی شێخ جونەیدی بەغدایی لە گەڕەكی (كەرخ) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەكان:

١ عنوان المجد ١٣١– ١٣٣
٢ الأعلام ١/ ٣٧ – ٣٨ ، ٥/ ٣٤٩، ٨/ ٦٤ – ٦٥

٣. علماء ومدارس في أربيل ٥٦.
٤. هدية العارفين ١/ ٤٢ – ٤٣.
٥. إيضاح المكنون ٢/ ١٢٨
٦ علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩ – ٢٢
٧ معجم المؤلفين ١/ ٤٠.
٨. معجم أعلام الكورد ١٢
٩ بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٨٢ – ١٧٤ – ٢٧٩ – ٢٨٤
١٠ بنەماڵەی زانیاران ٢٤١ – ٢٥٦

## ئیبراهیم عاصم ئیبراهیم حەیدەر حەیدەری (٢٠)

ناوی تەواوی: ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عاصمی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی مەلا حەیدەری دووەمە، یەکە لە مەلایە چاکەکانی حەیدەریەکانی (ماوەرانیّ) شەرحی (رسالة الأعمال)ی جەلالەدینی دەوانی کردووە ساڵی ١١٩٨ك حاشیەی عبدالحکیمی سەرخەیالی نووسیتەوە، هەر لەو ساڵەدا حاشیەی خەیالی سەر شەرحی عەقائیدی نوسیتەوە وە لە ساڵی ١١٩٢ ك – ١٧٧٨ز شەرحی عیصامەدینی سەر (عضدیة)، لە خزمەت مامۆستا عاصمی باوکی تەواوکرد.

سەرچاوەکان:

١ عنوان المجد ١٢١ – ١٢٦
٢ علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣ – ١٤
٣. علماء ومدارس في أربيل ٤٨.
٤. معجم المؤلفين ٥/ ٥١.
٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٢٥٠ ٦/ – ١٩٤ – ٢٩٤
٦ بنەماڵەی زانیاران ٢٣٤ – ٢٣٥

## ئیبراهیم عاصم ئیبراهیم صبغه الله حەیدەری (٢١)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عاصمی کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی صبغه الله یە، ساڵی ١٢٨٢ك – ١٨٦٥ز لە (هەولێر) لە دایکبووە، زانایەکی زیرەك و لێهاتوو بووە، حاشیەی لەسەر سەیلەکوتی سەر خەیالی هەیە، شەرحی نامیلکەی (خلق الاعمال)ی جەلالەدینی دەوانی کردووە، مێژووی ئاینەکانی نووسیتە، لە فەلسەفە نووسینی هەیە، شیعری بە کوردی و عەرەبی و تورکی هەیە، نازناوی شیعری (حەقی)یە چەند پلە و پایەی میری پێدراوە، ماوەیەك (قازی) بەغدا بوو، پاشان کرا سەرۆك لیژنەی (دارالخیر)ی پاشایی لە (ئەستەمبوڵ) ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز، دوایی کرا بەڕێوەبەری گشتی، ماوەی هەشت ساڵ ئەندامی ئەنجومەنی باڵا بوو، پاشان کرا (قازی) ناوچەی دیاربەکر، ساڵی ١٣٣٣ك – ١٩١٤ز لە ئەستەمبوڵ کرا سەرۆکی کاروباری ئاینی لە مەکتەبی پاشایەتی.

دوایی کرا ئەندامی (دارالحکمة)ی ئیسلامی، وە لە ساڵی ١٣٣٤ك – ١٩١٥ز کرا (شێخ الاسلام)، وە ئەو پلەی هەر مابوو تاکو حکومەتی عوسمانی مابوو، لەو کاتەدا زۆرجار حاجی قادری کۆیی مێوانی دەبوو. ساڵی ١٩٢٣ کە حکومەتی عێراق دامەزرا، گەڕاوەتەوە (بەغدا) کرا ئەندامی کۆڕی دامەزراندن، لە ١٩٢٤ز کە یەکەم وەزارەت دامەزرا مامۆستا کرا وەزیری ئەوقاف، پاشان کرا ئەندامی (مجلس الأعیان) لە جیاتی پەرلەمانی ئێستایە.

کۆچی دوایی: لە ٢/١/١٩٣١ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ عبدالقادری گەیلانی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١ علماء ومدارس في أربيل ٥٨.
٢ مشاهیر الکورد ١/ ٥٤ – ٥٥.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٢٩٢ – ٢٩٦
٤. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٥

٥. معجم اعلام الكورد ١٤.

٦. محمد بن عبدالله لجلي ١٣١ – ١٣٢.

## ئیبراهیم عبدالرحمان ئامێدی (٢٢)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی محەممەدە، خەڵکی شاری (ئامێدی) یە ساڵی ١٠١٢ك – ١٦٠٣ز هاتوتە دنیا. دەرسە سەرەتاییەکانی لە خزمەت باوکی خوێندووە، پاشان چووە (شام) لە لای مەلا چاکەکانی ئەوێ کۆتایی بە خوێندن هێنا، کرا (مدرس)، دووجار سەفەری ماڵی خوای کرد بە نیازی (حەج). پاش کۆچی باوکی شامی بە جێ هێشت، ڕوی کردە وڵاتی (ڕۆم)، دوایی گەڕاوە، مامۆستا جگە لە مەلاچاکی شاعیرێکی چاکیش بووە، شیعرەکانی زۆر بە تام و پڕ مانانە، بۆ نمونە بە عەرەبی دەڵێت:

لا تَخْشَ مِنْ شِدَّةٍ وَلاَ نَصَبِ ... وَثِقْ بِفَضْلِ الإلهِ وَابْتَهِجِ

وارْجُ إذا اشْتَدَّ هَمٌّ نَازِلَةٍ ... فَآخِرُ الْهَمِّ أَوَّلُ الْفَرَجِ

کۆچی دوایی: لە بەرواری (١٠)ی مانگی ربیعی دووەم ساڵی ١٠٧٨ك – ١٦٦٧ز لە شاری (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغیر) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ١٥ – ١٦ – ٢٠.

٢. مشاهير الكورد ١/ ٦١.

## ئیبراهیم عبدالرحمان شارەزوری (٢٣)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عبدالرحمانە، خەڵکی وڵاتی شارەزوورە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، لە کۆتایی ساڵی ٨٨٣ك – ١٤٧٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١/٥٤.

## ئیبراهیم عبدالله ئەخلاطی (٢٤)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (ئەخلاطە) لە دەوری ساڵی ٧٢٠ك – ١٣٢٠ز هاتوتەدنیا. لە وڵاتی خۆی دەستی کرد بە خوێندن، تازەریف شارەزای زانستەکان بوو، ئەمجا رووی کردە شاری (حەلەب) لەوێ ناوبانگی ڕۆیشت، دەنگوباس بڵاوبۆوە کە ئەم مامۆستایە دختۆرە، کیمیا دەزانێت، هەروەها (لازیوەرد) درووست دەکات، ئیشی زێر دەکات، خەڵکان بە جارەك ڕوویان تێکرد، سامانەکی زۆری کۆکردەوە، لەو هەموو زانیاریانە شاگردی نەبوو، کەسی فێرنەکرد تا جێی بگرنەوە.

کۆچی دوایی: لە مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٧٩٩ك – ١٣٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١ شذرات الذهب ٦/ ٣٥٦ – ٣٥٧

٢ علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤ – ١٥

## ئیبراهیم عبدالله خەتی (٢٥)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەلا عبدالله یە، بنەماڵەی (سینگوڕە)یە، ساڵی ١٨٨٤ز لە گوندی (خەتە) هاتوتە دنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، چووە لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ ماوەك لە خزمەتی ماوە، دوایی چووە لای خاڵی مەلا شێخ طاهای بالیسانی، لەوکاتە مەلا ئەحمەدی برای لەگەڵ شێخ مصطەفای نەقشبەندی لەوێیان دەخوێند، دوای چووە لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی لە (ڕواندز) ئەمجارە چووە (گرتك) لای مەلا عبدالله ی ئیبن ئادەم، کۆتایی بە خوێندن هێنا.

مەلایەتی: یەکەمجار بووە مەلا لە گوندەکەی خۆیان (خەتە) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا طاهیری سوسەیی و مەلا عومەری تەرجانی، مەلا محەممەدی قیرژەی و مەلا مەسعودی ئاشۆکانی و مەلا جەمیلی کاوانی و مەلا عەلی سۆفی و مەلا بەهائەدینی برازای و مەلا صادیقی کوڕی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٧ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی:

١. مەلا عبداللە: باوکی مابوو جوانەمەرگ بوو.

٢. مەلا ئەحمەد: ساڵی ١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

٣. مەلا سەلام.

٤. مەلا سولەیمان، ئەویش کوڕێکی هەیە مەلایە ناوی ئیبراهیمە.

٥. مەلا صادیق: پێشنوێژ و ووتارخوێنە لە مزگەوتی شێخ محیەدین لە گەڕەکی برایەتی لە (هەولێر).

سەرچاوە: نامەی مەلا بەهائەدین ئەحمەد خەتی.

## ئیبراهیم عبداللە یوسف ئورمەوی (٢٦)

ناوی ئیبراهیمە، نازناوی (ئەبو ئیسحاقە) کوڕی شێخ عبداللە ی، کوڕی یوسفی، کوڕی یونسی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی سەلمانە، خەڵکی شاری (ورمێ)یە، لە کێوی (قاسیون) دانیشتووە، یادی خوا و خواپەرستی کردووە، خەڵکان زۆریان خۆش ویستووە و ڕێزیان لێ گرتووە، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٩٢ك – ١٢٩٢ز کۆچی دوایی کرد، هەر لەو چیایە لە تەك باوکی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/ ٣٣٧.

٢. شذرات الذهب ٥/ ٤٢٠.

## ئیبراهیم عبدالکریم کوردی (٢٧)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عبدالکریمە، خەڵکی شاری (حەلەب)ە یەکەم جار لە وڵاتی عەجەم دەرسی دەدا، پاشان لە شاری (مەککەی پیرۆز) نیشتەجێ بوو، زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، لە زانستی مەعان و بەیان دەستی درێژبوو، تاکە زانای سەردەمی خۆی بوو لە بە دینی و ئەخلاقی چاك، ساڵی ٨٤٠ك – ١٤٣٦ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١ بغية الوعاة ١/ ٤١٨.
٢ الضوء اللامع ١/٥٧
٣. درة الحجال في اسماء الرجال ١/ ١٨٩
٤. مشاهير الكورد ١/٦٠
٥. معجم أعلام الكورد ١٦

## ئیبراهیم عثمان ئەرضرۆمی (٢٨)

ناوی ئیبراهیمە، نازناوی حەقی یە، کوڕی دەروێش عوسمانی، کوڕی حەسەنە، خەڵکی شاری ئەرزەڕۆمە، زانایەکی ئەهلی تەسەووف بووە، لە ١١٩٥ك – ١٧٨٠ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون: الاعمال الفلكية، الأنساب الكامل، تحفة الكرام، ترتيب العلوم، تذكرة الأحباب، حصن العارفين من فتن الزمان في كل حين.

سەرچاوەکان:

١ معجم المؤلفين ١/٢٥ – ٥٧.
٢ ايضاح المكنون ١/٢٧٢ – ٤٠٦.
٣. هدية العارفين ١/٣٩ – ٤٠.

## ئیبراهیم عثمان مارانی (٢٩)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عوسمانی، کوڕی عیسای، کوڕی درباسی مارانی یە، (ماران): بەرەبابەکن لە (مروج) دادەنیشن، (مروج): دەشتی پانەگۆڕی خوار چیای (مەقلوبە) لەوانەیە دەشتی (ناوکوڕی) ئێستا بێت، ئەو زاتە لە ٥٧٢ك – ١١٧٦ز لە (میصر) لە دایکبووە، لە لای باوکی شەریعەتی مەزهەبی شافیعی خوێند، پاشان بە نیازی فێربوونی زانیاریەکانی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) زۆر شوێن گەڕا، چووە (دیمشق) و (عێراق) و (خوراسان) و (ئەصبەهان)، لە کۆتاییدا ئیجازەی لە مامۆستا مەلا ئەحمەد محەممەد سیلفی وەرگرت، ناوبراو زۆر هاتووچۆی (هەولێر)ی دەکرد.

کۆچی دوایی: مامۆستا لە (یەمەن) بەرێکەت بەنیازی سەفەری (هیند)، لە نێوان هەردوو ولآت ساڵی ٦٢٢ك – ١٢٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاریخ أربیل ١/٢١٥ (٢)٣٦٨.

٢. سیر أعلام النبلاء ١٣/ ١٥٤.

## ئیبراهیم عەلی خۆشنام (٣٠)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عەلی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی خۆشنامی، کوڕی ئەحمەدی کوردی حەلەبی حەنەفی یە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٢٩ك – ١٢٣٢ز هاتوتە دنیا، دەرسی شەریعەت و فەرمودەی پێغەمبەری (د.خ) لە لای ئەبو بەقا یەعیشی نەحوی و چەند کەسانی تر خوێند، پاشان کرا قازی (حمص)، دوایی کرا مەلای مزگەوتی گەورە، لە دەوری (تەتەرەکان) کرا قازی (خەلاط) ماوەی شەش ساڵ ماوە لەوێ، مامۆستا ناسرابوو بە زاتەکی ڕەشید و لێهاتوو، لە ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ١/ ٣٠

## ئیبراهیم عەلی دیاربەکری ( ٣١ )

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی عەلی، کوڕی مەحفوظی، کوڕی مەنصوری، کوڕی مەعازی، کوڕی یەحیایە، لە (بەغدا) دەرسی شەریعەتی خوێند، هەروەها لە فەرموودە، صەحیحی ئیمامی موسلیمی خوێند، پاشان هەر لەو کتێبە پیرۆزە دەرسی دا، مامۆستا ناسرابوو بە زانایەکی گەورە و قسەخۆش و زمان رەوان و چازان و زۆرزان، لە ئوصول و لە مەنتیق کەس نەیدەتوانی کێشەی لەگەڵ بکا، مێژووی کەونی زۆر لەبەربوو، ئەشعاری شاعیرانی زۆر لەبەربوو.

کۆچی دوایی: لە شەوی سێشەمەی (١٨)ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٥٧٢ك – ١١٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧ –٨.

## ئیبراهیم محەممەد ئامێدی ( ٣٢ )

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە بورهانەدین، لە (١٥)ی مانگی رەبیعی دووەمی ساڵی ٩٥٤ك – ١٥٤٧ز لە شاری (دیمشق) هاتەدنیا، لە لای مەلایە چاکەکانی ئەو سەردەمی زانستەکانی قورئانی پیرۆز و ئەوانی تری خوێند، ئەمجا چووە (میصر) ماوە لەوێ تا شارەزایی لە زمانی عەرەبی و ئەدەبیات و شیعر پەیدا کرد. ئەمجا گەڕاوە (شام) لەوێ کرا (مدرس) لە چەند قوتابخانان دەرسی دەدا، لە (٢) دووی مانگی ذیلقەعدەی ساڵی ١٠٠٨ك – ١٦٠٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ١٧.

٢. مشاهير الكورد ١/ ٦٠ – ٦١.

## ئیبراهیم محەممەد ئەحمەد وانی ( ٣٣ )

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی محەممەدە، خەڵکی شاری (وانە)یە، پاشان چویتە (ئەخلاط) دوایی چویتە (هەمەدان) دەرسی فەرمودەی خوێند

تا زەریف شارەزابوو، ئەمجا دەستی کرد بە دەرسدانەوە، بڕوانامەی بە چەند کەسانی لێهاتوو دەدا، مامۆستا دەنگی زۆر خۆش بوو، سەرۆکی بانگدەرانی مزگەوتی گەورەی (دیمشق) بوو، لە شەشی مانگی صەفەری ساڵی ٧٣٥ک – ١٣٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥.

٢. شذرات الذهب ٦/ ١٠٩.

## ئیبراهیم محەممەد ئەرضرۆمی (٣٤)

ناوی ئیبراهیمە، نازناوی (ملهمي)یە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی شاری ئەرزڕۆمە، لە قوتابخانەی (قەرەمصطەفا پاشا) لە ئەستانە دەرسی داوە، لە ١٠٦٠ک – ١٦٥٠ز کۆچی دوایی کردووە، هۆنراوەی شەهەنشا نامەی تورکی لە مێژووی سولتان مراد و فەرەنگەکان بە درێژی نووسیوە.

سەرچاوەکان:

١. ایضاح المکنون ٢/٦١.

٢. هدیة العارفین ١/ ٣١.

## ئیبراهیم محەممەد بابا رەسول (٣٥)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی سەید محەممەدی موفتی مەدینەی، کوڕی سەید بابە رەسولی بەرزنجی یە، لە (مەدینە)ی پیرۆز هاتوتەدنیا، لە خزمەت باوکی پەروەدە بووە و پێ گەیشتووە و زانستەکانی تەاوکردووە، زانایان ڕێزیان گرتووە، دەرسی فەرموودەی داوە، خەڵکان سوودیان زۆر لێ وەرگرتووە، ئەمجا گەڕاوە کوردستان. میری بابان لە (قەلاچوالان) قوتابخانەی بۆ دروست کرد، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ١١٥٠ک – ١٧٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: پێنج کوڕی هەبوون: محەممەد و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢.

## ئیبراهیم محەممەد ئیبراهیم بەرزنجی ( ٣٦ )

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیبراهیمی بەرزنجی یە، پێش نوێژ و ووتارخوێن و مدرس بووە لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی لە (بەغدا) لە گەڕەکی (باب الشیخ) دیوەخانەکی گەورەی هەبوو، بەردەوام کاروانسەرا بوو دەچوونە خزمەتی بۆ فەتوا و وەلامی پرسیارانی شەرعی، لە (١٢٧٠ک – ١٨٥٣ز) کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالله ی کوڕیان لە جێ دانا، ئەویش لە (١٣١٠ک – ١٨٩٢ز) کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕیان لە جێ دانا، ئەویش لە (١٣٤٧ک – ١٩٢٨ز) کۆچی دوایی کرد، ئەویش کوڕێکی هەبوو، ناسرابوو، بە سەید عبدالله.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٧٠ – ٧١.

## ئیبراهیم محەممەد جزیری ( ٣٧ )

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدی کوڕی مەهرانی جزیرییە، ناسراوە بە ئەبوطاهیر، ساڵی ٥١٤ک – ١١٢٠ز هاتوتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و بە دین بووە، بۆ خوێندن چویتە (بەغدا) لای مەلایە باشەکانی ئەو سەردەمەی خوێندووە، پاشان گەڕایتەوە (جزیرە) دەستی کردووە بە فەتوا و دەرس دان و کتێب دانان، چەندان مەلا لەسەر دەستی پێگەیشتوون.

کۆچی دوایی: لە شەوی پێنج شەمەی (١٥)ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٥٩٩ک – ١٢٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢٣.
٢. طبقات الشافعية ئەسنەوی ١/٣٦٩.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧.
٤. معجم اعلام الكورد ١٧.

## ئیبراهیم محەممەد زڤنکی (٣٨)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەلا محەممەدی زڤنکی بوطی یە، پێش نوێژ و ووتارخوێن بووە، لە مزگەوتی نوێی شاری (قامیشلی) لە (سوریا). ناوبراو برای مامۆستا مەلا ئەحمەدی زڤنکی یە، کە موفتی قامیشلی بووە، شەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری کرد بە عەرەبی، مامۆستا ئیبراهیم شەرع زان و تەسەووف زان بوو، ڕێزمانی عەرەبی و فارسی چاك دەزانی، زانایەکی قسەخۆش و ڕووخۆش و مەجلیس ئاوەدان بوو، بۆ زانیاری ئایین بەردەوام خەڵکان هاتووچۆیان دەکرد، ئاگاداربوو لە ناوەرۆکی کتێبان، پرسیارەك کرابا یەکسەر ئاماژەی دەکرد کەوا لە فلان بەرگە و شوێنەکەی دیاردەکرد. پێویستی بە فێرست نەدەکرد، خۆی فێرست بوو، لە ١٤١٥ك – ١٩٩٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: عقد الجوهر ١٧٠٧.

## ئیبراهیم محەممەد شارەزوری (٣٩)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عەقیلی شارەزوورییە، ناسراوە بە (ئەبو ئیسحاق)، زانایەکی مەزن بووە، لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی زۆر شارەزا بووە، بە زمانێکی پاراو و ڕەوان ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، بە تایبەت لە فەرائیز و دابەشکردنی میرات دەستێکی باڵای هەبووە، ماوەك لە (هەولێر) دانیشت پاشان چووە (دیمشق)، مامۆستا خاڵی جەمالەدین ئەبولحەسەنی کوڕی موسلیمە کە کتێبی (أحکام الخنثی)ی داناوە، مامۆستا خەریکی خوێندن و خوێندنەوە و دەرسدانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بوو، تا ساڵی ٤٨٤ك – ١٠٩١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية ٢/ ٩٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١١.

٣. الاكليل في محاسن أربيل ٥٧.

## ئیبراهیم محەممەد گۆران (٤٠)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە ئەبوطاهیر گۆرانە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ١١١٤ك – ١٧٠٢ز لە مەدینەی پیرۆز هاتوتە دنیا، لە خزمەت باوکی و چەند زانایانی خویندووە، لە مزگەوتی خۆشەویست (د.خ) دەرسی داوە، زۆر لە یارمەتی خەڵکان دابووە، ساڵی ١١٨٨ك – ١٧٧٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم اعلام الكورد ١٧.

## ئیبراهیم محەممەد هەولێری (٤١)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی محەممەدی، کوڕی یوسفی هەولێریە، شەریعەتی مەزهەبی شافیعی خوێندووە، کرایتە (قازی حسبان) ماوەی بیست ساڵان لە دادگا بووە، ناسراوە بە زاتەکی بە دین ساڵی ٧٥٥ك – ١٣٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ١/٤٦

## ئیبراهیم مەحمود کابلە (٤٢)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەحمودی کوڕی عبدالکریمی، کوڕی سەید عیسای بەرزنجی یە، لە گوندی (بەرزنجە) هاتوتەدنیا، کتێبە سەرەتاییەکانی لە قوتابخانەکانی کوردستان تەواوکرد، ئەمجا چووە (میصر) ماوەك لەوێی خوێند، دوایی چووە (ئەفغانستان) پاشان چووە (ئێران) لە گوندی (نولو)ی سەر بە (مەریوان) نیشتەجێ بوو، دوایی لە قوتابخانەی (سوور) کرا (مدرس) ماوە لەوێ خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی بوو، لە شەوی هەینی سەرەتای مانگی (محرم)ی ساڵی ٨٢٣ك – ١٤٢٠ز کۆچی دوایی کرد، لە سەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی دامەنی گوندی (دەرەتفی) بە خاك سپێردرا (کابلە) کورت کراوەی: (کاك ئیبراهیمە)، کورد زۆرجار دەڵێتە (کاك): کا، دەڵێتە (ئیبراهیم): برایم یان بلە، لێکدراوەکە بەمشێوەیە دەبێتە: (کابلە).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨ – ٩.

## ئیبراهیم مەحمود گردلانکەیی (٤٣)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەحمودی، کوڕی عبدالفتاحە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٩٢٤ز لە گوندی (شێخان) هاتوتەدنیا، لە زووەوە باوکی کۆچی دوایی کرد، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بۆ خوێندن ناردیانە گوندی (گردەشینە) لای مەلا شێخ عبدالقادر، پاشان چووە (باشتەپە) لای مەلا سەعید، پاشان چووە (قەپران) لای مەلا محەممەد، هەروەها ماوەکیش بۆ خوێندن چووە لای مەلا طاهیری (سوسە)ی، ماوەکیش چووە خزمەت مامۆستا مەلا شەریفی دووشیوانی، پاشان لای مەلا طەیبی دووشیوانی، پاشان چووە شاری (کەرکوك) لای مەلا عومەری ئۆمەر گومبەتی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٤٩ز ئیجازەی مەلایەتی پێدا.

مەلایەتی: یەکەم جار بووە مەلا لە (گردلانکە)، هەروەها مەلایەتی لەم شوێنانەش کردووە: (شێخانان)، (نەبیاوە)، (سەربیر)، (بشیریان)، (ڕەحیم ئاوا)ی کەرکوك، ساڵی ١٩٨٤ز دووبارە گەڕاوە کەرکوك دوایی لەگەڵ چەند خێزانانی کورد ڕژێمی بەعس لە کەرکوك دەری کردن، مامۆستاش ئاوارەبوو، بۆ (هەولێر) لە گەڕەکی موفتی کرا پێش نوێژ، لە بەرواری ٢٧/٩/١٩٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٦٢ – ٦٥.

## ئیبراهیم مەسعود مەسروری (٤٤)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەسعودی، کوڕی سەعیدە، ناسراوە بە: (ابن الجابي) ساڵی ٦٦٢ك – ١٢٦٣ز هاتوتەدنیا. خەڵکی (هەولێرە) دوایی چوویتە (قاهیرە)، لەوێ چووە (مەدینە)ی پیرۆز، مامۆستایەکی ڕەوشت چاك و ڕێك و بە سام بووە، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز دەرسی داوە، هەروەها پێش نوێژ و ووتارخوێن بووە، دوا عەمری چاوەکانی ڕۆیشتن، لە ٧٤٥ك – ١٣٤٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/٤٧.

٢. الإكليل في محاسن أربيل
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦.

## ئیبراهیم موسەللەم هەولێری (٤٥)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی موسەللەمی، کوڕی سەلمانی هەولێرییە، برای مامۆستا ئیسماعیلە، لە صەدەی شەشەم ژیاوە، لە (هەولێر) لە دایکبووە، هەر لەوێش پەروەردە بووە، زانایەکی بە دین و لە خوا ترس بووە، ڕووی خۆی نەدایتە دنیا، سەفەری (بەغدا)ی کردووە، لەوێ لە لای چەندان مامۆستایانی خوێندووە، پاشان گەڕایتەوە (هەولێر) لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: تاريخ أربيل ١/٢١٣ ، ٢/ ٣٦٤.

## ئیبراهیم مەولان سیسێری (٤٦)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی مەولانی وەزیرە، ناسراوە بە ئیسماعیل زادە، ساڵی ١٩٢١ز لە گوندی (سیسێر) سەر بە (سەردەشت) لە کوردستانی ئێران هاتوتەدنیا.

خوێندنی: لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، لە بەر خوێندنیان دانا، لە لای مەلا حوسێنی گوندەکە، قۆناغی سوختەیی و ناسکە موستەعیدی بڕی، ئەمجا چووە گوندی (قۆزلوو)، لای مەلا عبداللە ی محەممەدی شەرحی عەقایدی لەگەڵ (جمع الجوامع) تەواوکرد، لەوێوە چووە، گوندی (حەمامیان) لای مەلا عەلی وەلزی، لەوێ چووە (شێخلەر) لای مەلا حەسەنی شێخی، ئەمجا چووە (سابلاغ) لای مەلا محەممەدی ماوەرانی دوایی لەوێ هەرقەنا بۆ (گەناو) لای مەلا ساڵحی مەلا نەجیبی بێژەوی پاشان چووە (گەلاڵە) لای مەلا محەممەدی ڕەئیس، ماوە لە خزمەتی تا کۆتایی بە خوێندنەکەی هێنا و ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرت.

مەلایەتی: یەکەم جار لە گوندی (نستان) بووە مەلا، کاروباری مەلایەتی جێبەجێ دەکرد هەروەها دەرسی فەقێیان دەداوە، پاشان گەڕاوە (سیسێر) ماوەی سێ ساڵ لەوێ خەریکی دەرس دانەوە و فەتواداان بوو، پاشان لەوێش باری کرد، بۆ (سەدەشت) لەوێ

کرا (مدرس) ماوەکیش لەوێماوە، ئەمجارە چووە (سابلاغ)، تەمەنێکی درێژی لە تاعەت و خواپەرستی ڕابارد، ساڵی ٢٠٠٠ز ماڵ ئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەران کرد، کوڕێکی ئەندازیاری هەیە، ناوی عبدالرحمان، لە (سابلاغ) دادەنیشێ.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٧٣ – ٢٧٥.

## ئیبراهیم میکایل بەستی (٤٧)

شێخ ئیبراهیم، کوڕی میکایلە، خەڵکی گوندی (بەستە) نزیك (سنە)یە لە زانایە مەزنەکان و بە دینەکان بووە، دەوری ساڵی ١٠٨٠ك – ١٦٦٩ز دەرسی لە خزمەت شەهابەدین شازەلی خوێندووە، دوایی دەستی کردووە بە دەرس دانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان و جێبەجێ کردنی کاروباری موسڵمانان بە پێی شەریعەت.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤.

## ئیبراهیم هەدمە (٤٨)

شێخ ئیبراهیم هەدمە، لە کوردەکانی ڕۆژهەڵاتە، بە سەفەر چووە (شام) لە نێوان (قودس) و (خەلیل) نیشتەجێ بوو، خەریکی دارچاندن و ڕەز و کشتوکاڵ بوو، خەڵکان دەچوونە خزمەتی بۆ زیارەت، کەراماتیان لێ دەگێڕاوە، تەمەنی صەد ساڵ بوو، لە دوا عەمری ژنی هێنا، چەند کوڕی بە قسمەت بوون، ئەوانیش بوونە پیاوچاك، لە مانگی جیمادی دوومم، ساڵی ٧٣٠ك – ١٣٣٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: البداية والنهاية ١٤ / ١٥٨.

## ئیبراهیم یوسف کوردی (٤٩)

ناوی ئیبراهیمە، کوڕی یوسفی، کوڕی سواری کوردیە، مەزهەبی شافیعی بووە لە شاری (حەلەب) دابەزیوە، زانایەکی ئەهلی تەسەووف و دڵپاك بووە، حەزی لە زانیاری (کیمیا) بووە، ساڵی ٩٦٠ك – ١٥٥٣ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٣٢٥.

## ئەبوبەکر ئامێدی (٥٠)

مامۆستا ئەبوبەکری ئامێدی کوردی، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، زانایەکی دڵ نەرم و بەدین بووە، ڕووخۆش بووە، سوود بەخش بووە، خەریکی دانراو ونوسین و پەراوێز دانان بووە، دەرسی لە خزمەت مەلا ئەحمەدی کوردی خوێندووە، لە تەفسیری قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ) شارەزا بووە، لە (جامع الاموی) دەرسی داوە.

کۆچی دوایی: لە شەوی دوو شەممەی (١١)ی مانگی (محرم)ی ساڵی ١٠٣٦ك ـ ١٦٢٦ز لە تەمەنی سی ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الاثر ١/١١٠-١١١.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين٢١.
٣. معجم أعلام الكورد ٣١.
٤. تاريخ مشاهير الكورد ١/١٨٢-١٨٣.

## ئەبوبەکر ئیبراهیم جزیری (٥١)

ناوی ئەبوبەکرە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی محەممەدی، کوڕی عوسمان، جزیریە، لە (دیمشق) هاتوتەدنیا لە خزمەت باوکی پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی بە تەجویدەوە خوێند، پاشان شەریعەت و نەحو و عەروز و قوافی خوێند، کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی (صوفا)، مامۆستا شاعیرەکی چاك بوو.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی شەممەی (١٥)ی مانگی شەعبانی ساڵی ١١٩٨ك – ١٧٨٤ز کۆچی دوایی کرد، لە مزگەوتی (ئەمەوی) نوێژیان لەسەرکرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٢٧.
٢. سلك الدرر ١/٤٤ – ٤٥.

## ئەبوبەکر ئەحمەد ئامێدی (٥٢)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عێزەدینی، کوڕی ئیبکە، خەڵکی شاری (ئامێدی)یە، مەزهەبی حەنەفی یە، ساڵی ٧٩٣ك – ١٣٩١ز کۆچی دوایی کردووە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی داناوە، بەناوی (التلخيص بمدارك التنزيل).

سەرچاوە: هديه العارفين ٥/٢٣٥.

## ئەبوبەکر ئەحمەد گەلاڵی (٥٣)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی داودە، خەڵکی (گەلاڵە)یە، یا عەشیرەتی گەلاڵی یە، مەزهەبی شافیعی بووە، تەریقەتی نەقشبەندی بووە لە (دیمشق) دابەزیوە زانیاری لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) زۆربووە ئەهلی تەسەووف بووە، لە ١٢٤٠ك – ١٨٢٤ز کۆچی دوایی کردووە، (صفوة التفاسير) و (تنبيه الغافلين)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/٥٧.
٢. الآعلام ٢/٣٥.
٣. معجم أعلام الكورد ٢٧.
٤. یادی مەردان ١/٩٥ – ٥٦.

## ئەبوبەکر ئەییوب ژەنگاری (٥٤)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی ئەییوبی، کوڕی یەعقوبە، خەڵکی (سنجار– ژەنگار)ە، لە (دیمشق) دابەزیوە، زانایەکی چاك و بەدین بووە، خەریکی پێش نوێژی و پەروەردەکردنی منالان بوو، لە مانگی شەووالی ساڵی ٧٠٧ك – ١٣٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥.

## ئەبوبەکر داود عیسا (٥٥)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی داودی، کوڕی عیسای، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەیوبی، کوڕی شادی سەیفەدین مەلیکی عادیلە، زانایەکی مەزن بووە، شەرحی (الجامع الکبیر)ی کردووە لە چەند بەرگ، لە زانستی عەروز دانراوی خۆی هەیە، هەروەها دیوانی شیعری هەیە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٨٢ك – ١٢٨٣ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم المؤلفین ٣/٦١.

## ئەبوبەکر عەبباس خاپوری (٥٦)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی عەبباسی، کوڕی عبداللە ی (خاپور)یە، لە گەورەترین قوتابیەکانی شێخ تاجەدینی فەزاریە، لە شاری (بەعلەبەك) قازی بووە، لە شەوی شەمەی (١٧) مانگی جیمادی دووەم ساڵی ٧٢٣ك – ١٣٢٣ز لە قوتابخانەی (بادرانیە) کۆچی دوایی کرد، لە تەمەنی (٧٠) ساڵی لە کێوی (قاسیون) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: البدایة والنهایة ١٤/١١٤.

## ئەبوبەکر عبدالرحمان (جامی) (٥٧)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی عبدالرحمانە، ناسراوە بە (جامی) خەڵکی (حەریرە) زانایەکی لێهاتوو و وردبین بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، دەرسی بە ئەحمەد پاشای وەزیر داوە، بۆیە نابراوە بە: (معلم الوزیر)، پاشان لەگەڵ وەزیر چووە (ئەستەمبوڵ) دوایی گەڕاوە (دیمشق) لە قوتابخانەی (سەلیمیە) کرا (مدرس) هەروەها (قازی) بوو لە (صەیدا). دەرسی قورئانی پیرۆزیشی لە (جامع الاموی) دەداوە، مامۆستا ئیجازەی مەلایەتی بە چەند مەلایان داوە، بەردەوام دەهاتنە خزمەتی بۆ وەڵامی پرسیارانی گرینگ.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ساڵی ١٠٧٧ك – ١٦٦٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (فرادیس) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:
١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١ – ٣٢.
٢. خلاصة الأثر ١/٨٦ – ٨٧.
٣. تاريخ مشاهير الكورد ١/٢٠٦ – ٢٠٧.
٤. معجم أعلام الكورد ٢٨ – ٢٩.

## ئەبوبەکر عبدالله بیستانەیی (٥٨)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەحمەدە، ساڵی ١٩١٦ز لە گوندی (سۆربەش) چاوی خۆی لە دنیا هەڵهێناوە.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، ئەمجا چووە (دۆڵەسزە) لای مەلا عوسمان، دوایی چووە (کەسنەزان) لای مەلا محەممەد ئەمینی سوێری، ماوەکیش لە خزمەت مەلا ئیسماعیلی ناقیصی خوێند، دوایی چووە (هەرەجە) لای مەلا مەحمودی راجی، ئەمجا چووە (هەولێر) لە مزگەوتی (قەڵات)، ئیجازەی مەلایەتی لە عێزەدین ئەفەندی وەرگرت ئەمجا بووە مەلا لە (بیستانە)ی گەورە، پاشان باری کرد بۆ (بنەسراوە) دوایی هاتە (هەولێر).

کۆچی دوایی: لە ١٩٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: کەشکۆڵی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئەبوبەکر عثمان ئەفەندی (کچك مەلا) (٥٩)

ناوی تەواوی: ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەلا عوسمانی، کوڕی مەلا ئەبوبەکری، کوڕی مەلا عومەرە، لە بەر بەژن کورتی ناویان دەبرد بە (کچك مەلا) ساڵی ١١٩٢ك – ١٧٧٨ز لە هەولێر چاوی خۆی هەڵهێناوە لە دنیا.

خوێندنی: دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە، ماوەکیش چوویتە لای مەلا عبدالرحیمی زیارەتی، هەروەها ماوەکیش لە لای مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی خوێندووە،

ئەمجا چووە (بەغدا) ماوەك لە لای داود پاشای خوێند، پاشان چووە شاری (سلێمانی) ماوەی دوو ساڵان لە خزمەت مەولانا خالید ماوە، دەرسی شەریعەت و تەسەووف خوێند.

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز بووە، یەك بووە لە پیاوە ماقوولانی (هەولێر)، لە ناو خەڵکان و مەلایان و حوکمداران ڕێزی تایبەتی خۆی هەبووە، پەراوێزی لەسەر کتێبانی (تحفة) و (شەرحی مەطالیع) و (جمع الجوامع) و (سەیلەکوتی مەنتیق) و (سەیلەکوتی نەحو) هەیە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ ئیبراهیم فەصیح حەیدەری و مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی و مەلا مەحمودی دیمیلانی.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ساڵی ١٢٧٢ك – ١٨٥٥ز لە شاری (هەولێر) ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەر و فەقێیان کرد.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤١.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٣.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩ – ٣٠.

٤. علماء ومدارس في أربيل ٢٨.

## ئەبوبەکر عومەر ئەفەندی (مەلا ئەفەندی هەولێر) (٦٠)

ناو و نژادی: ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەلا عومەری، کوڕی مەلا ئەبوبەکری، کوڕی مەلا عوسمانی، کوڕی مەلا ئەبوبەکری، کوڕی مەلا عومەری، کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی شەمسەدینی، کوڕی شەهابەدینی، کوڕی مەلا خضری، کوڕی مەلا ئیلیاسە ناسراوە بە (کچك مەلا) واتە: مەلا گچکە، مەلا ئەفەندی گچکە نەبوو، بەلاّم مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی باپیری بەژنی کورت بووە، بۆیە پێیان گوتیە: کچك مەلا، ئەو نازناوە لە باپیری بۆ ئەو بەجێ ماوە. ئەو زاتە ساڵی ١٢٨٤ك – ١٨٦٧ز لە قەلاّتی (هەولێر) چاوی خۆی هەڵهێناوە لە دنیا.

خوێندنی: لە لای عومەر ئەفەندی باوکی پەروەردە بووە، هەر لە خزمەت ئەویشی خوێندووە، ئیجازەی مە لایەتیشی لیٚ وەرگرتووە، ساڵی ١٨٩٠ز.

هۆی هاتنی ئەو بنەماڵە بۆ هەولێر: مەلا ئیلیاسی باپیرە گەورەیان لە شاری (سولەت ئاباد)ی نزیك (سنە) دادەنیشت، شا ئیسماعیلی صەفەوی دەیویست پیاوە ناسراوەکانی ئاینی بە زۆری بیان کاتە شیعە، ناچار مەلا ئیلیاس لە دەستی ڕای کرد و وڵاتی ئێرانی بەجیٚ هێشت، لەگەڵ خزمەکی خۆی کە محەممەد کوڕی حەیدەر پیرەدینە، باپیرە گەورەی مەلایە حەیدەرییەکانی ماوەرانە، ئاوارە بوون، هاتنە کوردستانی عێراق، مەلا محەممەد لە (هەریر) دابەزی و مەلا ئیلیاس هاتە (هەولێر)، سوڵتانی عوسمانی لەوکاتە سولەیمان قانوونی بوو، زۆر ڕێزی لێنا.

بنەماڵەی مەلا ئیلیاس چونکە ناسرابوون بە خاوەن زانست و زانیاری، مەدرەسەی فەقێیانیان هەبوو، دەستە بە دەستە مەلایان لەسەر دەستی ئەوان ئیجازەیان وەردەگرت، مێوانداریەکی زۆر بیٚ ئەندازەیان دەکرد، پیاوانی بە دین و ماقوڵ و بیر و بڕوا دروست بوون، سوڵتانی عوسمانی ژمارەك گوندی پیٚ بەخشین، بۆوەی بەروبوومەکەیان خەرج بکرێت لە فەقێیان و مێوانان، ناوەکانیان ئەمانەن: باداوە، کونەگورگ، گردەڕەشەی گچکە، تەندورە، بەردێنە، بەشێك لە دارەتوو، چاروك، منارە، جدیدە، مەلاقەرە، کەپەنك ڕەش، حەسەن بەگ، شێخەلاس، بەشێك لە پۆڕیجە.

کەسایەتی مەلا ئەفەندی: مەلا ئەفەندی پسپۆڕ بوو لە هەموو زانستەکان، کە خوێندنیان باوبوو لە ناو چینی مەلا و فەقێیان، بە تایبەت لە ئەستێرەناسی دەستی باڵا بوو کتێبی دانراوی خۆی لەو بابەتە هەبوو، فەقێیان لە حوجرەکانی مزگەوتەکان کە کۆتایی یان بە قۆناغەکانی خوێندن دەهێنا، بۆ پەرەپێدانی زانیاری، دەهاتنە لای مەلا ئەفەندی، ماوەك دەمانەوە و ئیجازەی مەلایەتی پێدەدان، ڕەوانەی گوندەکی دەکردن، ئەویش لە لای سەرۆك عەشیرەتەکان و ڕیش سپییەکان، قسەی ڕەت نەدەکراوە، مەلا دادەمەزرا و قوتابخانە و مزگەوت و خانووی بۆ دابین دەکرا و خزمەت دەکرا.

مەلا ئەفەندی لەبەر ئەوەی سامانێکی زۆری هەبوو، جگە لە خوای گەورە ئیشی بە کەس نەبوو، داوای یارمەتی لە کەس نەدەکرد، خەڵکان ئیشیان بەو هەبوو، پێویستی خۆیان لە لا باس دەکرد، مەلایەکان، سەرۆك عەشیرەتەکان، پیاوە ماقوڵەکان، هەر هەموویان بۆ ئیشی گرنگ ڕوویان تێ دەکرد، خۆشی قەت هاتووچۆی دام و دەزگاکانی حکومەتی نەدەکرد، خزمەتکارەکی خۆی وەکو: (قادرە) دەنارد، یا تەلەفۆنەکی دەکرد، ئیشەکە بە ئاسانی دەکرا، لە جەنابی شێخ مصطەفای نەقشبەندی هەولێرم گوێ لێ بوو فەرمووی: {مەلا ئەفەندی عیلم و جاهـ و سەروەتی هەبوو، بەو هەرسێکانە خزمەتی ئایین و مەلا و فەقێیانی دەکرد، ئەوەی لۆ وی هەرکەت، لۆ کەسی سەردەمی وی هەرنەکەت}.

مەلا ئەفەندی: ڕیزی پیاوە ماقووڵانی زۆر دەگرت، بە تایبەت شێخەکانی (بیارە) و (تەوێڵە) و بنەماڵەی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی، هەر کەسایەتییەك ڕووداوێکی لێ قەومابا ڕووی کردبا ئەو زاتە چارەسەری دەکرد و یارمەتی دەدان، بۆ نموونە: ڕەشید عالی گەیلانی کە ساڵی ١٩٤١ز شۆڕشی دژی مەلیکانی بەغدا هەڵگیرساند، مەلیکە (عالیە) لەگەڵ (فەیسەڵی) کوڕی کە لەو کاتە منداڵ بوو، لە (بەغدا) نەحەوانەوە هەڵاتن لەگەڵ چەند کەسانی تر لەو بنەماڵە، هاتنە ماڵی مەلا ئەفەندی لە (باداوە)، هەروەها مەلیك (فەیسەڵی)ی یەکەم کە ساڵی ١٩٢٥ز یەکەم جار هاتە هەولێر، مێوانی مەلا ئەفەندی بوو، وە دووبارە ساڵی ١٩٣٠ز هاتەوە هەولێر دیسان هەر مێوانی مەلا ئەفەندی بۆوە.

ئەوانەی ئیجازەی پێداون:

مەلا ئەفەندی کە ساڵی ١٣١٧ك - ١٨٩٩ز باوکی کۆچی دوایی کرد، خۆی تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو، لە جێی دانیشت لەو بەروارەوە، وە لە پێشدا کە باوکی لە ژیاندا بوو تا کۆچی دوایی خۆی سێ سەد و حەفتا ئیجازەی مەلایەتی داوە، لیستەی ناوەکانی بەشێك لەو مەلایانە، بە پێی نووسینی مامۆستا مەلا عومەری تەرجانی، کە ئەویش خۆی یەکە لەو فەقێیانە، ئەمانەن:

١. مەلا محەممەد پەرچەمی ١٣٠٩ک.
٢. مەلا یوسفی سلێمانی ١٣١٠ ک.
٣. مەلا حەسەن رەسول سنەیی ١٣١١ک.
٤. مەلا عبدالفتاح خەتی ١٣١٢ک.
٥. مەلا عبالعزیز دەربازی ١٣١٣ک.
٦. مەلا سەعید سەقزی ١٣١٣ک.
٧. مەلا ئەحمەد قوم قەڵایی ١٣١٣ک.
٨. مەلا ئیبراهیم بێشەیی ١٣١٣ک.
٩. مەلا محەممەد ئەمین دوو شیوانی ١٣١٦ک.
١٠. مەلا محەممەد سەعید سمێلی ١٣١٤ک.
١١. مەلا عارف شنۆیی ١٣١٤ک.
١٢. مەلا ڕەشیدی بۆکانی ١٣١٤ک.
١٣. مەلا عبدالله ی مەریوانی.
١٤. مەلا سەعیدی نەهری ١٣١٦ک.
١٥. مەلا ئیبراهیم شیوەلوکی ١٣١٦.
١٦. مەلا ئەحمەدی وەردی ١٣١٦ک.
١٧. مەلا خدر سەید کەمال ١٣١٦ک.
١٨. مەلا عبدالسلام باشوری ١٣١٧ک.
١٩. مەلا محەممەد ئەمین سور سوری ١٣١٨ک.
٢٠. مەلا طاهای شەقڵاوەیی ١٣١٨ک.
٢١. مەلا عبدالله ی مەمیخەلی ١٣١٨ک.
٢٢. مەلا طاهای گاینجی ١٣١٨ک.
٢٣. مەلا محەممەدی پاراستی ١٣١٨ک.

٢٤. مەلا ئەمینی ڕەزایی ١٣١٨ك.

٢٥. مەلا محەممەدی هەبرۆیی ١٣١٩ك.

٢٦. مەلا ئیسماعیلی قوشتەپەیی ١٣٢٠ك.

٢٧. مەلا طاهیر کەرکوکی ١٣٢٠ك.

٢٨. مەلا طاهیر شێخ وەتمانی ١٣٢٠ك.

٢٩. مەلا ئەحمەدی شنۆیی ١٣٢٣ك.

٣٠. مەلا مصطەفای کەورگۆسکی ١٣٢٣ك.

٣١. مەلا محەممەد بادینی ١٣٢٣ك.

٣٢. مەلا هیبة الله ی ئاکرێ ١٣٢٤ك.

٣٣. مەلا سەعیدی شنۆیی ١٣٢٤ك.

٣٤. مەلا سەید عبدالله ی موکریانی ١٣٢٥ك.

٣٥. مەلا عبدالفتاحی شوان ١٣٢٧ك.

٣٦. مەلا عەلی شاوەیسی ١٣٢٧ك.

٣٧. مەلا عبدالرحمانی سینگوڕی ١٣٢٨ك.

٣٨. مەلا عوسمانی خورمەلەیی ١٣٢٨ك.

٣٩. مەلا ئیبراهیم بارانی ١٣٢٨ك.

٤٠. مەلا محەممەد تاجەدین طالشی ١٣٣٠ك.

٤١. مەلا عبدالله ی بورهانی ١٣٣١ك.

٤٢. مەلا عبدالقادر مزوری ١٣٣٢ك.

٤٣. مەلا ئیسماعیل بانەیی ١٣٣٣ك.

٤٤. مەلا محەممەد صادق صدر ئابادی ١٣٣٤ك.

٤٥. شێخ محەممەد عارف طالشي ١٣٤٢ك.

٤٦. مەلا محەممەد باقرتەیی١٣٤٢ك.

٤٧. مەلا صالح کۆزە پانکەیی ١٣٤١ك.

٤٨. مەلا عبدالله ی شەنەغە ١٣٤٣ك.

٤٩. شێخ مصطەفای نەقشبەندی ١٣٤٤ك.

٥٠. مەلا ئیسماعیل جدیدەیی ١٣٤٥ك.

٥١. مەلا محەممەد مەخوری ١٣٤٥ك.

٥٢. مەلا صادقی شەقلاوەیی ١٣٤٥ك.

٥٣. مەلا طەیبی دووشیوانی ١٣٤٥ك.

٥٤. مەلا سەعیدی باشتەپەیی ١٣٤٧ك.

٥٥. مەلا عوبێدی سالەیی ١٣٤٨ك.

٥٦. مەلا حوسێن مەلا عومەر ١٣٤٨ك.

٥٧. مەلا سەید ئیسماعیل مائیلی ١٣٤٩ك.

٥٨. مەلا محەممەد ڕەشید دەشتیّ ١٣٤٩ك.

٥٩. مەلا شێخ عەلی بالیسانی ١٣٤٩ك.

٦٠. مەلا خالید دەشتیّ ١٣٤٩ك.

٦١. مەلا محەممەد سابلاغی ١٣٥١ك.

٦٢. مەلا طاها قورشقلی ١٣٥٠ك.

٦٣. شێخ عبدالکریم بەرزنجی ١٣٥١ك.

٦٤. سەید عەلائەدین چەنتەوەری ١٣٥٢ك.

٦٥. مەلا وەیسی گرتکی ١٣٥٢ك.

٦٦. مەلا مصطەفای جەوانڕۆیی ١٣٥٢ك.

٦٧. مەلا شێخ محەممەد سلێمانی ١٣٥٢ك.

٦٨. سەید حەسەن طالشی ١٣٥٢ك.

٦٩. مەلا محەممەد موکریانی ١٣٥٢ك.

٧٠. مەلا محەممەد ئەمین وەلزی ١٣٥٣ك.
٧١. مەلا محەممەد ئەمین گردمامکی ١٣٥٣ك.
٧٢. سەید عبدالله ی تەوەکەلی ١٣٥٣ك.
٧٣. شێخ عومەری بالیسانی ١٣٥٣ك.
٧٤. مەلا عبدالرحمانی وەلزی ١٣٥٤ك.
٧٥. مەلا محەممەد صالح سەقزی ١٣٥٥ك.
٧٦. مەلا صالح لۆلانی ١٣٥٤ك.
٧٧. مەلا عەلی تلکاشی ١٣٥٤ك.
٧٨. حاجی محەممەد سۆدانی ١٣٥٥ك.
٧٩. مەلا عومەری تەرجانی ١٣٥٥ك.
٨٠. مەلا عبدالقادر زەنگیدەری ١٣٥٥ك.
٨١. مەلا عبدالمجید خەلخالی ١٣٥٦ك.
٨٢. مەلا عەلی عەباسی.
٨٣. مەلا حەسەن مزوری ١٣٥٧ك.
٨٤. مەلا محەممەد سارتکەیی ١٣٥٨ك.
٨٥. مەلا محەممەد ئەمین سوێری ١٣٥٨ك.
٨٦. مەلا صادق فەرهادی ١٣٥٨ك.
٨٧. مەلا سەعید فەرهادی ١٣٥٨ك.
٨٨. مەلا عبدالقادر گردەشینی ١٣٦٠ك.
٨٩. مەلا عبدالکریم شۆڕە زەرتکە ١٣٦٠ك.
٩٠. مەلا عوسمان شەقلاوەیی ١٣٦٠ك.
٩١. مەلا مصطەفا باریك ئاوا ١٣٥٥ك.
٩٢. عێزەدین مەلا هەولێری ١٣٦٠ك.

٩٣. مەلا یەحیا گرد عازەبانی ١٣٥٦ك.

٩٤. مەلا حوسێنی (مفسر) ١٣٣٣ك.

٩٥. مەلا یوسفی سلێمانی ١٣١٠ك.

٩٦. مەلا محەممەد ئەمین دووشیوانی ١٣١٦ك.

٩٧. مەلا حەسەن ڕازانی ١٣١٨ك.

٩٨. مەلا ئەحمەد بانەیی (ڕەش) ١٣٤٣ك.

٩٩. مەلا ئەحمەد بانەیی ١٣٥١ك.

مەلا ئەفەندی لەبەر ئەوەی ناوبانگی مەلایەتی ڕۆیی بوو، فەقێیان لە دووڕا دەهاتن لەلایان دەخوێند، زاتەکی ناسراوبوو، مێوانی زۆری دەهاتن، بەردەوام یا دەرسی دەدا یا مێوانی بەخێر دەینا، کاتی ئەوەی نەبوو خۆی خەریك بکا بە نووسین و کتێب دانان بەڵام جار جاریش نووسین و پەراوێزی هەنە، بۆ نموونە:

١. سوانح القريحة في شرح الصحيفة.

٢. الفوائد الحسينية في الربح المجيب.

٣. تەرجومەی (البديعة) لە تورکی بۆ عەرەبی.

٤. حاشية على الاسطرلاب.

٥. حاشية على التشريح.

٦. حاشية على حاشية (منه) للمصنف، على التشريح.

٧. حاشية على مبحث (الأمور العامة) في شرح المواقف.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی پێنج شەممەی (٢٢) مانگی ذی الحجە ساڵی ١٣٦١ك – ٣١/١٢/١٩٤٢ز ماڵئاوایی یەکجاری لە دنیا و دۆست و برادەران کرد، شاد بوو بە ڕەحمەتی بارەگای خودای تاك و تەنیا، لە (گۆڕستانی باداوە) بە خاك سپێردرا، زۆر سەر دولکەی کوردی و عەرەبی پێدا هەڵگوتراوە لەوانە هۆنراوێکی عەرەبی شێخ نیعمة اللّٰه‌ی (النعمة)یە، ئەوەی خوارەوە دەقەکەیتی:

ثوى في جوار الله علامة العصر (أبوبكر) المفضال والطيب الذكر
وكان جواداً لا يشق لجوده غبار وعن ناديه ينبيك من يدري
مرب رشيد يبذل النصح جهده ويرتاح للمعروف في العسر واليسر
وجوزيتَ ياذا الراحل! الجنَةَ التي أعِدت لأرباب التقى و ذوي البر
وكرمت في أنهارها، يوم أرخوا (رحلت الى نهر النعيم أبابكرِ)

٦٣٨+٤١+٢٥٥+٢٠١+٢٢٦ =١٣٦١ك

منیش ئەو هۆنراوەم کردە دیاری بۆ گیانی پاکی بەڕێز جەنابی مەلا ئەفەندی:

سَمِيُّ رَفِيقِ الْغَارِ عَلاَّمَةُ الْعَصْرِ أَبُو الْفَضْلِ وَالْمَجْدِ الأَفَنْدِي أَبُوبَكْرِ
وَيُحْيِي ظَلاَمَ الْلَيْلِ شُكْراً لِرَبِّهِ بِتَسْبِيحِ رَبِّ الْعَالَمِينَ إِلَى الْفَجْرِ
تَوَاضَعَ مِنْ أَجْلِ الآلهِ فَزَادَهُ شَهَامَةَ عِلْمٍ قَدْ تَجُلُّ عَنِ الْحَصْرِ
فَلَمَّا بَدَا الصُّبْحُ تَهَيَّأَ للدَّرْسِ كَأَنَّهُ سُلْطَانٌ يَقُومُ مِنَ الْقَصْرِ
وَلَمْ يَأْلُ جُهْداً فِي تَعَلُّمِ قَوْمِهِ عُلُومَ الْكِتَابِ وَالْحَدِيثِ الْمُطَهَّرِ
فَيَا رَحْمَةَ الرَّبِّ الرَّؤُوفِ تَحُفُّهُ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ، نَعِيمٌ بِلاَ حَسْرِ
جَزَاهُ الْكَرِيمُ دَارَ خُلْدٍ وَنِعْمَةٍ عَلَيْهِ ثِيَابُ الْعِزِّ مِنْ سُنْدُسٍ خُضْرِ
هَنِـيئاً لَهُ الْفِرْدَوْسُ مَأْوىً وَمَسْكَناً فَيَا حُسْنَ وِلْدَانٍ تَطُوفُ بِكَوْثَرِ

**عێزەدین ئەفەندی کوڕی:**

لەو کاتەدا کە مەلا ئەفەندی کۆچی دوایی کرد، عێزەدین ئەفەندی کوڕی لە (هەولێر) نەبوو، بە سەفەر چووبووە (کەرکوك)، کە گەڕاوە هەولێر دوای تازیە و سەرەخۆشی ئەویان لە جێ دانا، خۆی زانابوو، جێ و ڕێی دیوەخان و کتێبخانەی باوکی حازر بوو، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، وەکو باوکی چەند ئیجازەی مەلایەتی دا، ماوەك وابوو پاشان پێی شل کرد و خۆی ڕانەگرت، ئەو هەموو سامان و خێراتەی بەجێ هێشت وازی لە هەولێر و عێراق و کوردستان هێنا، ماوەك لە (بێروت) بوو، لە چەند شوێن گەڕا چی بە چی نەکرد دوا عەمری گەڕاوە (هەولێر)، دام و دەزگا و

مێوانخانە و قوتابخانەکە نەمابوو برادەرانی خۆی و باوکی لێی تۆرابوون، سامان و سەروەتەکە پەرت و بڵاو بوو، وەکو کورد دەڵێن: {ئەو هەوار بوو، بەلام ئەو بووار نەبوو} بە تەنیا ماوە، لە ماڵی خۆی دانیشت، تەنیا قازی ڕەشاد ئەفەندی هاوکاری دەکرد، لە ژیانەکی کەسادی و بێ ڕەواجیدا ساڵی ١٩٩٩ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی ناوی (ئازاد) ە، ئێستا یەکە لە وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

سەرچاوەکان:


١. أربيل في مختلف العصور ١٣٣ – ١٤٨ – ١٤٩.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٣٢ – ٣٥.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/ ٣٠٧ – ٣١٠.
٤. مشاهير الكورد ١/٨٣ – ٨٤.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٤ – ٣٦.
٦. معجم المؤلفين ٣/٧٦.
٧. محمد بن عبدالله الجلي ١٢٩ – ١٣٠.
٨. معجم أعلام الكورد ٢٩ – ٤٧٣.
٩. أعلام كورد العراق ٣٢ – ٣٤ – ٥٠٠ – ٥٠٢.


## ئەبوبەکر عومەر شەمسەدین هەولێری (٦١)

ناو و نژادی: ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەلا عومەرە[1]، کوڕی ئەبوبەکرە[2]، کوڕی شەمسەدینی[3]، کوڕی شێخ شەهابەدینی[4]، کوڕی مەلا خضری[1]، کوڕی مەلا ئیلیاسە، ساڵی ١٠٦٨ك – ١٦٥٧ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا.

---

[1] لە ١٠٢٠ ك – ١٦١١ز لە دایکبووە، لە ١١١٠ك – ١٦٩٨ز کۆچی دوایی کرد.

[2] لە ٩٤٠ ك – ١٥٣٣ز لە دایکبووە، لە ١٠٣٠ك – ١٦٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

[3] لە ٩٠٠ ك – ١٤٩٤ز لە دایکبووە، لە ٩٧٠ك – ١٥٦٢ز کۆچی دوایی کرد.

[4] لە ٨٧٠ك – ١٤٦٥ز لە دایکبووە، لە ٩٤٠ ك – ١٥٣٣ ز کۆچی دوایی کرد.

زانایەکی بەرز بووە، لە قوتابخانەی قەلآت پێگەیشتووە، قورئـانی پـیرۆزی هـەموو لەبەر بووە، لەگەڵ بەشێك لە تەفسیر و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، دەرسی حـەدیس و تەسەووف و کەلامی دەداوە، چەند کتێبـی لـەو بابەتانە دانـاوە، هـۆدەکی بچـوکی لـە مزگەوتی قەلآت هەبوو لیّ دادەنیشت، خەریکی دەرس دانەوە و یادی خوای گەورە بوو، مامۆستا سەفەری حەجی کرد، لە ڕێگای (شام) پاشان گەڕاوە (هەولێر)، لەگەڵ برادەری زۆر خۆشەویستی مەلا حەیدەر کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیـدەر ئەفەنـدی پێکـەوە چـوونە (تورکیا) ماوەك لە (ئەستەمبۆڵ) مانەوە. پاشان گەڕانەوە (هەولێر).

کۆچی دوایی: سالی ١١٣٨ك – ١٧٢٥ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور.
٢. علماو ومدارس في أربيل ٢٧ – ٢٨.

## ئەبوبەکر محەممەد دایەخەجێ (٦٢)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبداللّٰهی، کوڕی فەقێ ئەحمەدی دایەخەجێیە خەڵکی شاری (کۆیـە)، مەلایـەکی چـاك و بـە توانـا بـووە، شـەرحی (المخمـس الخـالی الوسط)ی شێخ محەممەدی فاسی کردووە، ساڵی ١٢٢٦ك لە مزگەوتی (منارە) لە (کۆیـە) دەرسی داوە، مامۆستا خەتێکی خۆشی هەبووە، زۆر کتێبـی بە دەستی خـۆی نووسـینەوە، لەوانە:

١. (شرح العقائد) و خەیالی سـاڵی ١١٩٥ك – ١٧٨١ز لای مـەلا مصـطەفـا لـە گوندی (زیارەت).
٢. (الإستعارة) ساڵی ١٢٢٤ك – ١٨٠٩ز.
٣. ئولوغ بێگ ساڵی ١٢١٥ك.

---

[1] لە ٨٤٢ ك – ١٤٣٨ز لە دایکبووە، لە ٩١٢ك – ١٥٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

٤. عبدالحکیم لەسەر عبدالغفور، لە کۆیە ساڵی ١١٩٠ك.
٥. رسالة الحساب، لە کۆیە ساڵی ١١٩٢ك.
٦. میزانی شەعرانی، لە کۆیە ساڵی ١٢٣١ك.
٧. شەرحی حیزبی نەوەوی، لە کۆیە ساڵی ١٢٠٤ك.

هەروەها نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی لە (بەغدا) نووسیتەوە ساڵی ١٢١٧ك.

سەرچاوەکان:

١. الإکلیل في محاسن أربیل ٢٩٣.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/١٥٤.

## ئەبوبەکر محەممەد ژەنگاری (٦٣)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی قاسمی، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی شاری (ژەنگارە)، بۆ نیازی خوێندن چووە (بەغدا)، لەوێ بۆ خوێندنی تەفسیر و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) چووە (دیمشق) و (حیجاز)، کرا مامۆستای فەرموودە، لە (میصر) نیشتەجێ بوو، لە (قاهیرە) دەرسی دەداوە، ساڵی ٧٩٠ك – ١٣٨٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٨ – ٢٩.
٢. معجم أعلام الکورد ٣٠.

## ئەبوبەکر محەممەد سولەیمان (٦٤)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی سولەیمانی کوردی یە، ناسراوە بە (سوۆرانی) مەزهەبی حەنەفی بووە شەرحی قەسیدەی بوردیەی کردووە، ناویناوە (الدرة المضیئة في شرح الکواکب الدریة).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٣/٧٢.

٢. هدیةالعارفین ١/٢٣٩.

## ئەبوبەکر محەممەد میر ڕۆستەمی (٦٥)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی گوندی (میر ڕۆستەمە)یە، دەکەوێتە نێوان (شەقڵاوە) و (هەریر) پاشان مامۆستا باری کردووە، بۆ گوندی (سارتکە)، بۆیە لە ناوچەی خۆشناوەتی ناوی دەبەن بە (مەلا ئەبوبەکری سارتکەیی)، مامۆستا لە زانایەکانی صەدەی سێزدەی کۆچییە، مەلا خضر ئەفەندی کتێبی شەرحی مەطالیعی بۆ نووسیتەوە مانگی ڕەمەزان لە گوندی (ماوەران).

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز و بە توانابووە، بۆیە محەممەد پاشای (رواندز) هەڵبیژاردووە لەناو مەلایان، بە مەلای خۆی داناوە، کتێبانی (ئیستیعارە) و (وەضع)ەکەی گەورەترین بەڵگەنە بۆ دەستدرێژی مامۆستا لە زانیاری، کە لەو ڕۆژەوە داندراون تا ئێستا سوپاس بۆ خودا بەردەوام فەقێیان دەیانخوێنن، لە کوردستان لە دەرەوەی کوردستان، لە بەغدا خوێندراون و شەرحیان لەسەر کراوە، مامۆستا زانستەکانی لە لای مەلا عبدالرحمانی جەلی تەواو کردووە، ئەویش فەقێ ی مەلا محەممەدی، کوڕی مەلا خضری حەیدەری ماوەرانیە. مامۆستا زۆرجار سەفەری (هەولێر)ی کردووە، برادەرایەتی بتونی لەگەڵ مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلای هەولێر، هەبووە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەدی (خەتێ) و مەلا ئەحمەدی (گەلالی) و مەلا ئیبراهیمی (رمکی) و مەلا عبدالله ی (شێخ مەمووندی) و مەلا شێخ نەبی ناسراو بە: (پیری ماویلی).

کۆچی دوایی: زۆر گەڕام، لە هیچ سەرچاوەیەك نەمدیت ئاماژە بەساڵی کۆچی دوایی مامۆستا بکا، تەنیا ئەوەندەی لێ دەزانم کە ساڵی ١٢٣٣ك لە ژیاندا بووە ئەوەش لە نوسخەك لە نامەی (الاستعارة) کە دانراوی مامۆستایە، ئەبوبەکری کوڕم دانەکی دەستخەتی رەسولی کوڕی عبدالله ی بۆ هێنام، دەڵێ: لەو کاتەی نوسیمەوە، دانەر لە ژیاندا بوو، دەقی نووسینەکە بە عەرەبی: {تمت الرسالة المسمات ببیان البیان، بعون الملك

المنان، في وقت حياة مصنفه، غفره الله له ولكاتبه ولصاحبه أمين في سنة ١٢٣٣هـ على يد الفقير الحقير رسول بن عبدالله في بلدة كركوك في مدرسة مولانا ملا عبدالرحمن، غفر الله لهم بحق الملك الرحمن، آمين}.

دانراوەکانی:

١. خلاصة الوضع، مەلا عبدالله ی شێخ مەموندی شەرحی لەسەر کردووە، هەروەها عبدالرحمان محەممەد قەرەداغی (ابن الخياط) شەرحی لەسەر نووسیوە دانەکی کۆپیمان لە لایە، ساڵی ١٨٥٦ز تەواوی کردووە.

هەروەها محەممەد عەلی لە بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٨٨ – ٨٩ باسی شەرحەکی دیکە دەکات کە داودی کوڕی سولەیمان دایناوە، منیش بە دوور نازانم ئەو زانایە قازی داودی دێریّ بێت، مەلا ئەخفەش ئەفەندی لە مەتحی ئەو (خلاصة الوضع)ە بە عەرەبی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| هذه خلاصة أتت في السبك | خالصة على وفاق الطبع |
| خريدة فريدة في الحُسن | منيفة أنيقة في الوضع |
| ألفها المولى أبوبكر ال | مفرد في علمه عند الجمع |

٢. نهاية الوسع: ئەوە شەرحی خۆیەتی لەسەر (خلاصه الوضع) دانەکی کۆپی لە لامان هەیە.

٣. بيان البيان: مەلا عبدالله ی شێخ مەموندی شەرحی کردووە، هەروەها یوسف سەنان بەغدایی شەرحی کردووە، ناوی ناوە، (تاج البيان) دانەکی کۆپی لە لامان هەیە، وەعبدالرحمان قەرەداغی (ابن الخياط) ساڵی ١٨٥٦ز شەرحی لەسەر نووسیوە، دانەکی کۆپیمان لە لایە.

مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەنصوری ئەویش شەرحی کردووە، مەلا ئیسماعیلی مەردۆخی شەرحی (وضع) و (ئیستعارە)ی کردووە، مەلا سەید عبدالکریمی هەورامی (حاشية)ی لەسەر داناوە، بەشێکی دەستنووسی لە لامان هەیە، بەڵام بە داخەوە

تەواو نیە. لەم ساڵانە مەلا موحسین مەلا ئەحمەد مصطفا بەحرکەیی شەرحەکی بۆ نووسیوە بەڵام تا ئێستا چاپ نەکراوە.

٤. حاشیە لەسەر سەیلەکوتی سەر شەرحی شەمسییە لە زانستی مەنتیق.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٤ – ١٤٥.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٠ – ١١٣.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٣ – ٣٤.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٣٦٨ – ٣٧٥/ ٦/ ٨٨ – ٨٩.

٥. بنەماڵانی بە ناوبانگی رواندز ١٤.

## ئەبوبەکر محەممەد هەرشەمی (٦٦)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەلا محەممەدە، کوڕی عبداللە یە، کوڕی مصطفایە. خەڵکی گوندی (هەرشەمە) نازناوی (غیاث الدین)ە، لە خزمەت مەلا محەممەدی باوکی خوێندووە، هەروەها لە لای مەلا محەممەدی خەتێی خوێندووە، دوایی چووە (رواندز) لای عومەر ئەفەندی خەیلانی، کتێبانی قوناغی سەرەوەی خوێند، ئەمجا گەڕاوە خزمەت باوکی ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرت، چووە گوندی (گردارەق) لە بەڕانیان، ماوەکیش لە (ئاشۆکان) بوو.

تەریقەتی شێخ ئەبوبەکر: ئەمجا هێزی روحانی شێخ سیراجەدینی (تەویلە)ی جوولەی پێ کرد، بەرەو تەوێلە بە ڕێ کەوت، ماوەی چواردە مانگ لە خانەقای شێخ ماوە، دەرسی تەسەووف و دەستوری تەریقەتی فێرکرد، گەڕاوە (هەرشەم) ماوەکی کەم خۆی گرت، دووبارە گەڕاوە (تەوێلە) ئەمجارە کەم ماوە حەزرەتی شێخ عوسمان ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی پێدا، هەر لەو سەفەرە پیرۆزەدا چووە شاری (سلێمانی).

هدایەی حیکمەتی لە لای شێخ عبدالقادری موهاجیر خوێند هەروەها کتێبی (تهذیب الکلام)ی لای مەلا ئەحمەدی نودشەیی خوێند، گەڕاوە، (هەرشەم) دەستی

کردووە بە دەرس دانەوەی فەقێیان، هەروەها پاش نوێژان (خەتم)ی نەقشیانی دەکرد، کە بریتیە لە چەند جۆرە یادکردنەوەی خوای گەورە و پاڕانەوە لە پەروەردگار، کۆتایی یەکەی بە چەند ئایەت دێت دەخوێندرێت لە لایەن یەك لەوانەی لەو کۆڕە ئامادەبووینە، (ختامه مسك وفي ذلك فليتنافس المتنافسون)، (المطففين / ٢٦)، لەو خەتمە مەلا محەممەدی باوکیشی ئامادە دەبوو، دەیفەرموو: {کوڕم ئەبوبەکر ئەو خەتمە زۆر بە بەرەکەتە}، دوایی شێخ ئەبوبەکر باری کرد بۆ (گردەڕەشە)ی دەوزێ، ماوەك لەوێ ماوە، ئەمجارە یەکجاری دەشتی بە جێهێشت باری کرد بۆ (هەولێر) لە مزگەوتی (فاطمە خان) کە ئێستا مزگەوتی شێخ مصطەفایە، بووە مەلا قوتابخانەی بۆ فەقێیان دانا و خانەقای بۆ مریدان ڕێکخست.

شێخ ئەبوبەکر لە (هەولێر): جەنابی شێخ لە لایێکەوە دەرسی بە فەقێیانی دەدا، دەڵێن لە کۆتایی دەرسی تەفسیری بەیزاوی صەد جار (استغفرالله)ی لێدەدا، پرسیاریان لێ کرد ئەوە بۆ چی یە؟ خۆ تاوانت نەکردووە، وەلامی دەداوە، {نەفس سەرکەشە و مەغرورە، ترسم هەیە لەو دەرسە باغ ببێت، ئەو هەموو (استغفرالله)یەش کەفارەتە}.

هەروەها لەلایێ ترەوە ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، نەخوێندەواری دەکردە فەقێ، فەقێی دەکردە مەلا، مەلای فێرە خواپەرستی ڕاستی دەکرد، مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) دەڵێت: {خۆ شێخ ئەبوبەکر تەنیا هەولێری پڕ خێر و بەرەکەتی زانست نەکرد، بەڵکو نوری زانیاری ئەو شەوقی دا لە هەموو سنووری عێراق، تاکو (بەصرا)شی ڕۆناك کرد.

خانەقای (هەولێر): خانەقاکەی شێخ – سوپاس بۆ خودا – ئاوەدان بوو بە خوێندن و خواپەرستی، پاش نوێژان (خەتم) و ویردی لێ جێبەجێ دەکرا، خواردەمەنی سێ جەمە بۆ مێوانان و مریدان و ئامادەبووان دابەش دەکرا، فڕنی تایبەتی خانەقا هەبوو، بەرگری لەکەس نەدەکرا، هەر کەس چووبا ئەو مزگەوتە تەنیا یادی خوای دەهاتە دڵ، ئەوانەی بێ کەس بوون، یا منداڵی هەتیو و بێ باب بوون دەهاتنە ئەو شوێنە (شێخ) بەخێوی دەکردن، هەموو ئەرکی ژیانی بۆ دابین دەکردن، سەرتاشی تایبەتی بۆ دانابوون، لە تەمەنی حەوت ساڵان لەبەر خوێندنی دادەنان، بە کوڕەکانی خۆی دەرسی پێ دەدان، تا

دەبوونە مەلا، ژنی بۆ دێنان، لە شوێنەك دەیکردن بە مەلا، هەروەکو سەید (عەبباسی) عەبدەلی بە زمانی عەرەبی دەڵێ:

لقد كان كهفا للعفاة وملجأ وغوثا للملهوف وعونا لمضطر

فذاك (غياث الدين) فخربني الحجا (ابوبكر)ن المقدام في خلوة الذكر

سەفەرەکانی: (شێخ) سەفەری بۆ (میصر) کردووە، هەروەها چوویتە (شام)، نۆ جار چوویتە (حەج)، یەك لەو سەفەرانە ساڵەك پتر لە (مەککە)ی پیرۆز مایتەوە دووجاران حەجی کردووە ئینجا گەڕایتەوە، لەو سەفەرە مەلا سولەیمانی (ئاشۆکانی) کە باپیری نووسەری ئەو مێژوویە لەخزمەتی بوو. هەروەها (شێخ) سەفەری ئەستەمبۆڵی کرد، لەوێ سوڵتان عبدالحمیدی دیت، وەچەند کاربەدەستان لەسەر دەستی ئەو هاتنە ڕێزی تەریقەت، هەروەها مریدی لە (دیمشق) و (بەغدا) و (بەصرە)ش هەبوون.

نووسینەکانی: شێخ لەبەر دەرسی فەقێیان بەردەوام خەریك بوو، بایەخی بە دانان و نووسین نەدەدا، نەمانزانیوە دانراوی تایبەتی خۆی هەبووبێ یان حاشیەی سەراسەری لەسەر کتێبێك هەبێت، ئەوەی دیتوومە تەنیا تاکە تاکە پەراوێزن لەسەر ئەم کتێبانەی خوارەوە: تحفة المحتاج، شرح جمع الجوامع، شرح رسالة الوضع لعصام الدين، شرح الشافية (كمال).

بەشێك لە فەقێیەکانی: کوڕەکانی خۆی و مەلا سەید خضری بەرزنجی و مەلا عبدالرحیمی چورستانی و مەلا سەید عبدالکریمی (هەورامی) و مەلا عبداللە ی (سەران) و مەلا عبدالرحیم مەلا صالح زیارەتی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٢٨ك - ١٩١٠ز کە ناسراوە بە ساڵی (بەفری گەورە) ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەران و مریدان کرد، لە گۆڕستانی باشووری مزگەوتی خۆی بە خاك سپێردرا، سەید (عەبباس)ی عەبدەلی بەغدایی چامەکی پەنجا دێری پێدا هەڵگۆتووە بە زمانی عەرەبی، لە کۆتاییدا مێژووی ئەبجەدی بۆ داناوە، دەڵێ:

فضائله مثل النجوم تكاثرت فلم يحوها نظمي، ولم يحصها نثري

فیارحمت الرب الکریم تحفه بعفو وارضاءٍ جمیل الی الحشر
فطوبی له الخلد وأرخ مأبه: (وفي الجنة الفردوس فاز ابوبکر)
٦٢٩+٣٨٠+٨٨+٢٣١ = ١٣٢٨هـ

هەروەها جەنابی مامۆستا مەلا عبداللّٰەی جەلی زادەی (کۆیی) هۆنراوەکی داناوە بە زمانی (فارسی) زنجیرەی ناودارەکانی تەریقەتی نەقشبەندی باس دەکات لە کۆتاییدا باسی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی دەکات دەڵێ:

ئەگەر داری حەواسی شەممەیی شەم نەبوویی جوزگۆلی گوڵزاری هەرشەم
غیاسەدین، ئەبوبەکری مووەففەق تەریقەت یافت ئەز وی زیب و رەونەق
ئەگەر گۆیەم، کی تۆ قوتبی زەمانەست عەجەب نەبووەدکی شەیخی ئینس وجانەست
(جەلی) خواهی، رەهی پیری نەقشبەند قەدەم دەر رەه بنێە لە برا فرۆبەند

کوڕەکانی:

١. عبدالعزیز: لە منداڵی کۆچی دوایی کرد.
٢. محەممەد ئەمین: باسی تایبەتی دەکەین – بەئیزنی خودا – لە مەودوا.
٣. عبدالله: لە مەودوا باسی دەکەین – بەئیزنی خودا –.
٤. عبدالرحمان: لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین – بەئیزنی خودا –.
٥. ساڵح: باسی دەکەین بە تایبەت – بەئیزنی خودا –.
٦. عومەر: لەگەڵ شێخ مصطەفای برای لە گوندی (گردەڕەشە)ی دەخوێند، چەند کتێبی لەبەر بوون.
٧. ئەحمەد: لە کاتی فەقێیەتی (لە رواندز) جوانەمەرگ بوو، لە تەك مەلای خەتێ بە خاك سپێردرا، کوڕێکی هەبوو (شێخ طاهیر) ساڵی ١٩٦٤ کۆچی دوایی کرد، ئەویش سێ کوڕی هەبوو: شێخ ئەحمەد و نەشئەت و خالید.
٨. شێخ مصطەفا: لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین بە یارمەتی خوا.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ١٠٩.
٢. النجم الزاهر ٨٧ – ١٥١ – ١٥٩.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٧٢ – ٧٥.
٤. یادی مەردان ٢/٥٠٥.
٥. اسهام علماء كردستان العراق في الثقافة الاسلامية ٣١٢.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٢ – ٣٣.
٧. دەنگی زانا ٥٢ و ٥٣، ٢٠٠١ز
٨. هەولێرم وادیوە ١٤٥
٩. محەممەد بن عبدالله الجلی ٥٥.

## ئەبوبەکر محەممەد هەولێری (٦٧)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیبراهیمە، خەڵکی شاری (هەولێر)ە، نازناوی (فەوزەدین) بووە، شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، کتێبی (الالغاز الخفية)ی داناوە، هۆنراوەیە باسی یەك هەزار ناو دەکات ساڵی ٦٧٩ك – ١٢٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/١٥٧.
٢. هدية العارفين ٥/٢٣٥.
٣. معجم المؤلفين ٣/٧٠.
٤. معجم أعلام الكورد ٣٢.

## ئەبوبەکر کوجك ئەحمەد زادە (٦٨)

مامۆستا ئەبوبەکر، ناسراوە بە (کوجك ئەحمەد زادە) خەڵکی (دیاربەکرە) ساڵی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز لە (دیاربەکر) کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبـی داناون، لەوانە: تفسیر الفاتحة، حاشیة علی تفسیر البیضاوي، حاشیة علی شرح البخاري.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٨٣

## ئەبوبەکر مصطفی گۆرانی ( ٦٩ )

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مصطفەفای، کوڕی بەکرە، گۆرانە، لە شاری (حەلـەب) هاتووتە دنیا، زانایەکی شەرع زان بووە، هەروەها شاعیر بووە، ساڵی ١٢٢٧ك کرا قـازی (حەلەب) لە ١٢٢٨ك کرا (نەقیب) لە ١٢٤١ك – ١٨٢٥ز کۆچی دوایی کرد، چـەند قەسیدەی هەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٨٣.
٢. معجم أعلام الکورد ٣٠.

## ئەبوبەکر مصطفی کۆیی ( ٧٠ )

ناوی تەواوی: ناوی ئەبوبەکرە، کـوڕی مصـطەفـای، کـوڕی حوسـێنی، کـوڕی حەسەنە، عەشیرەتی (هەمەوەند)ە، ساڵی ١٩٠٥ز لـە گەڕەکی – بەفرقەندێ – لـە شـاری (کۆیە) چاوی خۆی لە دنیا هەڵهێناوە.

خوێندنی: یەکەم جار لـە لای مەلا عبدالکریمی برای دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، دوایی چووە گوندی (چغمیرە) لای مەلا ئەحمـەدی ڕەش، دوایـی لـەوێ ڕۆیشـت چـووە (تەرجان) لای مەلا عبدالله کەمالی صەرف خوێند، پاشان چووە (بالیسان) لای مـەلا شـیخ طاها، ماوەکیش لە (شەقڵاوە) بوو، لای مەلا طاهای شەقڵاوە، ئەمجا بووە مەلا لـە گوندی (ئاخوڕە)، لای مەلا شێخ طاهیر شێخ مەعروف، دووبـارە دەسـتی کـردووە بـە خوێنـدن، چووە شاری (کۆیە) لای جەنابی مەلای گەورە ماوە، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

خووڕەوشتی: زانایەکی زۆر زیرەك و زەین تیژ بوو، بۆ تاقیکردنەوە جێی ئاڵۆزیان لـێ دەپرسی بە ئاسانی و زوو دەیزانی، زۆر کتێبـی لەبەر بوو، قسەخۆش بـوو، مـەجلیس

زۆوەدان بوو، لە زانست هۆشیار بوو، لە دەرس و وتنەوەی ئەو کتێبانەی خوارەوە دەستی بالاّ بوو: تفسیری بەیزاوی. تفسیری مدارك، تهذیب الکلام، تحفة المحتاج، شرح المواقف، جمع الجوامع، زۆر شیعری عەرەبی و کوردی و فارسی و تورکی لەبەر بوون.

مەلایەتی: مامۆستا مەلایەتی لەو گوندانەی خوارەوە کردووە و دەرسی فەقێیانی داوە: پیرداود، کانی دەربەند، ئاخوڕە، هێلەوە، دووگرتکانی ئەحمەد، ساڵی ١٩٥٩ز باری کرد هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی حاجی مەحمود دێرەیی عەللاف کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژ، هەروەها ئەندامی کۆڕی زانستی ئەوقاف بوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا سەعیدی زەمزەمۆکی و شێخ طاهیری شۆشی و مەلا سەید عبدالله ی گردەسۆری مەلا خدری شەمامەری و مەلا صادقی فەرهادی و مەلا سەعیدی فەرهادی و مەلا عەلی بیر عارەبانی و مەلا عوسمانی کۆزە پانکەیی و مەلا عبدالرحمانی هەمزەکۆری و مەلا طەیبی بەحرکەیی و دکتۆر جەمال باجوری، لەگەڵ زۆرانی تر.

ئەوانەی ئیجازەی مەلایەتی پێداون: مەلا جەوهەر سەعید و مەلا عبدالصمد عەلیاوەیی و سەید نوری سەید طاها و مەلا جەواد ترپەسپیانی و مەلا ئەحمەد عوسمان و مەلا عبدالرحمان ماستاوەیی.

نووسینەکانی: مامۆستا بەردەوام خەریکی دەرس دانەوە بوو، هێوایەتی نووسین و دانان نەبوو، نەمانزانیوە دانراوی خۆی یا حاشیەی لەسەر کتێبان هەبێ، مەگەر ئەو کورتە نووسینانەی جارجار لەسەر (تهذیب) و (جمع الجوامع) و (تحفه) و (مدارك) دەدیترێن، ئەوانەش بە ڕاستی کەمن.

کۆچی دوایی: لەبەرواری ڕۆژی هەینی٢/٧/١٩٧١ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەیە ناو عبدالکریم، ناسراوە بە (کاکە)، ماوەك بەڕێوەبەری گشتی بوو لە وەزارەتی داد لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.

سەرچاوەکان:
١. نامەی تایبەتی عبدالکریم (کاکە).
٢. دەنگی زانا ٣، ١٩٩٣ز
٣. محمد عبدالله الجلی ١٢٧.

## ئەبوبەکر مەنصور دینەوەری (٧١)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەنصوری، کوڕی غازی، کوڕی سەرحانە، خەڵکی شاری (دینەوەر)ە، لە مانگی رەمەزانی ساڵی ٦٥٧ك - ١٢٥٩ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای شەمسەدینی کوڕی عومەر خوێندووە، پاشان خۆی بوویتە مامۆستا دەرسی فەرموودەی داوە، لە مانگی ذی القعدەی ساڵی ٧٤٦ك - ١٣٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩.

## ئەبوبەکر نەبی شەرکانی (٧٢)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی مەلا نەبی، کوڕی مەلا غەزالییە، ساڵی ١٩١٢ز لە گوندی (شەرکان) سەر بە (خەلیفان) هاتوتە دنیا، عەشیرەتی سورچییە، لە منداڵییەوە باوك و دایکی کۆچی دوایان کرد، پلکی لەبەر خوێندنی دانا، دوایی چووە (باشتەپە) لای مەلا سەعید، پاشان چووە (دێمەکار)، چوار ساڵ لای مەلا ئەحمەدی ڕەش بووە، دوایی چووە (هەرتەل) لای مەلا فەتح الله، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت. پاشان هاتە (هەولێر) دووبارە دەستی بە خوێندن کردەوە لە خزمەت شێخ مصطەفا، ئیجازەکی دیکەشی لە جەنابی شێخ وەرگرت.

مەلایەتی لەو شوێنانە کردووە: شەرکان، گەرەوان، بلە، لانە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا سەید محەممەدی پیرداودی و مەلا محەممەدئەمین رواندزی و مەلا محەممەدی شەقلاوەیی و مەلا فەتح الله و مەلا عبدالفتاحی شاورێ و مەلا ئەحمەدی سکتان.

کۆچی دوایی: لە دەشت باری کرد هاتە (هەولێر)، ساڵی ١٩٨٣ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەمەدی کوڕی پێش نوێژە لە مزگەوتی شۆڕشی نوێ لە هەولێر.

## شێخ ئەبوبەکر هاوار (٧٣)

شێخ ئەبوبەکر هاوار، زانایەکی بە دین و شارەزای ئایین و تەسەووف بووە، سەرۆکی شێخەکانی عێراق بووە لە سەردەمی خۆی، قسەی پڕ مانا و نەستەقی لێ دەگێڕنەوە، لە (بەطائح) نێوان شاری (واسیط) و (بەصرە) دانیشتووە هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، مامۆستا بە ڕەچەڵەك کوردە هەوارییە، ئەو عەشیرەتە بەشێك لە (کەرکوك) و بەشێك لە (دوزخورماتوو) و بەشێك لە چیاکانی نزیك ناحیەی (هۆرین) دادەنیشن.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٧ – ٢٨.

## ئەبوبەکر یوسف حەڕانی (٧٤)

ناوی ئەبوبەکرە، کوڕی یوسفی، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی ئەبو فەرەج، کوڕی یوسفی، کوڕی هیلالی، کوڕی یوسفە، خەڵکی (حەڕان)ە ساڵی ٦١٤ك – ١٢١٧ز لە حەڕان هاتووتە دنیا، قورئانی پیرۆزی تەواوکرد دوایی چووە (دیمشق) لەوی چووە (حەلەب) ماوە تا ساڵی ٦٥٣ك – ١٢٥٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الذيل على طبقات الحنابلة ٤/ ٢٥٥ – ٢٥٦.

## ئەبو طاهیر ئیبراهیم گۆران (٧٥)

ناوی ئەبو طاهیرە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی حەسەنی، گۆرانە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ١٠٨١ کۆچی – ١٦٧٠ز لە شاری (مەدینە)ی پیرۆز هاتووتە دنیا، هەر لەوێ پەروەردە بووە، هەر لەوێ ساڵی ١١٤٥ك – ١٧٣٢ز کۆچی دوایی کردووە. کتێبی (اختصار شرح شواهد الرضي للبغدادي) داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/ ٣١ – ٣٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٧٠.

## ئەبولحەسەن نەجمەدین ئەردەلانی ( ٧٦ )

مامۆستا ئەبولحەسەن، کوڕی شێخ نەجمەدینی، کوڕی شێخ ئیبراهیمی، کوڕی شەمسەدینی، کوڕی شێخ عبدالغفاری مەردۆخییە، لە شاری (سنە) هاتوتە دنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، پاشان هاتە کوردستانی عێراق، ماوەك لەولایە مایەوە، گەڕاوە ولاتەکەی خۆی، لە گوندی (باقلاباد) نیشتەجێ بوو، خەریکی خزمەتی ئایین بووە تا ساڵی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز کۆچی دوایی کرد، ناوبراو کتێبی ئوسطرلابی داناوە، لە ١١٧٤ك تەواوی کردووە پێشکەشی بە سولەیمان پاشای دووەمی بابان کردووە، بەو بۆنەیە ناوی ناوە (التحفة السليمانية).

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣٤٦ – ٣٥٠.

## ئەبولوطف ئیسحاق حیصکەفی ( ٧٧ )

ناوی ئەبولوطفە، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی محەممەدە، کوڕی ئەبولوطفە خەڵکی شاری (حصن كيفا)یە، دوایی چوویتە (قودس) بۆیە ناسراوە بە مەقدیسی، مامۆستا باوکی سەید عبدالرحیمە، کە موفتی حەنەفییەکان بوو، لە قودس، مامۆستا ئەبولوطف زانایەکی شەرع زان و قسەخۆش و ڕووخۆش بووە، موفتی شافیعییەکان بووە، لە قوتابخانەی (صەلاحیە) دەرسی داوە، لە شەوی دووشەممەی (١٠)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٧١ك – ١٦٦١ز لە (ئەسکدار) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الأثر ١/١٤٥.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٠.

## ئەبولفەضل ئیلیاس جامیع هەولێری ( ٧٨ )

مامۆستا ئەبولفەضل، کوڕی ئیلیاسی، کوڕی جامیعی، کوڕی عملییە، خەڵکی (هەولێر)ە، زانایەکی فەرموودەناس و مێژووناس و شەرع زان بووە، لە قوتابخانەی

(النظامیه)ی خوێندووە، دانراوی لە مێژوو هەیە، هەروەها شاعیر بووە، ناوبراو لە ٥٥١ك – ١١٥٦ز هاتووتە دنیا، لە ٦٠١ك – ١٢٠٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. سير أعلام النبلاء ١٢ / ٤٥٩

٢. طبقات الشافعية ١/ ١٢٥.

٣. البداية والنهاية ١٣/ ٤٤.

٤. معجم المؤلفين ٨/ ٦٥.

٥. هدية العارفين ١/ ٢٢٥.

٦. أربيل في مختلف العصور ٧٤.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٠٠ – ١٠١.

٨. معجم أعلام الكورد ٥٤٠.

٩. أربيل في العهد الاتابكي.

## ئەبولقاسم محەممەد خالید حەڕانی (٧٩)

مامۆستا ئەبولقاسم، کوڕی محەممەدی، کوڕی خالیدی، کوڕی ئیبراهیمە، لە دەوری ساڵی ٦٥٠ك – ١٢٥٢ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا. داك برایە لەگەل تەقیەدین (بن تەیمیە) لە (دیمشق) خوێندنی تەواوکردووە، لە مزگەوتی (رماحین) کرایتە پێش نوێژ، لە قوتابخانەی حەنبەلییەکان دەرسی داوە، زانایەکی پیرۆز و بێ فیز و خۆبە نزم زان بووە، بە دین و ڕووخۆش بووە، بازرگانی کردووە، لە شەوی چوار شممەی (٨) مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٧١٧ك – ١٣١٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الذيل على طبقات الحنابلة ٤ / ٣٧٠.

## ئەحمەد ئیبراهیم ئۆمەرگومبەتی (٨٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حاجی ئیبراهیمە، خەڵکی (ئۆمەرگومبەتە) زانایەکی بەرز بووە زۆر صاڵح بووە، لە زانست دەستی باڵا بووە، لە لای مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی

خوێندنی تەواوکردووە، ساڵی ١٨٢٩ز ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا یەحیای مزوری وەرگرتووە، مامۆستا مەلا ئەحمەد هاوچەرخ بووە لەگەڵ محەممەد فەیزی زەهاوی، یەك بووە لە خەلیفەکانی مەولانا خالید، ئیبراهیم فەصیح لە مامۆستایانی خۆی ژماردووە، لە مەردەسەی (قەڵا)ی (کەرکوك) دەرسی داوە، حاشیەی لەسەر کتێبانی سەرەوە هەیە، بە نەخۆشی (تاعون) خۆی و هەموو منداڵەکانی کۆچی دوایی یان کرد.

دانراوەکانی: مامۆستا چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. شەرحی (رسالة الحكمة) ساڵی ١٨٢٣ز لە بەغدا تەواوی کردووە، پێشکەشی بە والی بەغدا (داود پاشا) کردووە.

٢. شەرحی (خلاصة الحساب)ی بەهائەدینی عامیلی.

٣. شەرحی (صغرا)ی سەید شەریفی جورجانی لە (مەنتیق).

٤. حاشیە لەسەر (تشریح الافلاك)ی بەهائەدینی عامیلی.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٩.

٢. یادی مەردان ٢/ ٢٥.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٣.

٤. علماء ومدارس في أربيل ٨٤.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٣٤.

٦. گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ٢٠١ – ٢٠٢.

## ئەحمەد ئیبراهیم عەینتابی (٨١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی ئەیوبە، خەڵکی (عەینتابە) کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای (ئورفە)، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز لە شاری (حەلەب) هاتووتەدنیا، پاشان لە (دیمشق) کرایە قازی لەشکر، ساڵی ٧٦٧ك – ١٣٦٥ز لە دیمشق کۆچی دوایی کرد.

کتێبی (المنبع) ناوبراوە بە (المرتقی في شرح المنتقی)ی داناوە، لە بابەتی شەریعەت شەش بەرگە.

سەرچاوەکان:

١. تاج التراجم ١٠٦.
٢. هدیة العارفین ١/١١٢.
٣. معجم المؤلفین ١/١٣٥ – ١٣٦.
٤. معجم أعلام الکورد ٤٠.

## ئەحمەد ئیبراهیم ژەنگاری (٨٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیبراهیمی / کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عوسمانە، خەڵکی (ژەنگارە) لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٩٦ك – ١٢٩٦ز هاتووتەدنیا. بۆ خوێندن چوویتە (دیمشق) و (میصر) پاشان لە (قاهیرە) کرایتە ووتارخوێن شاعیربووە هۆنراوەی هەیە، لە ٧٤٢ك – ١٣٤١ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (القصیدة السنیة في العقیدة السنیة)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الکامنة ١/ ٥٣.
٢. معجم المؤلفین ١ / ١٣٣.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٧.

## ئەحمەد ئیبراهیم سروجی (٨٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی عبدالغنی یە، خەڵکی سروجە لە ڕۆژئاوای (ماردین)، ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز هاتووتەدنیا، پاش خوێندن و مەلایەتی لە (میصر) کرا قازی، شەرحی (الهدایة)ی کردووە، ناوی ناوە (الغایة): شەش بەرگە، هەروەها (إعتراضات علی ابن تیمیة) ی هەیە لە بابەت بڕوایی.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی پێنج شەمەی (١٢) مانگی ڕەجەب، ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز لە قوتابخانەی سیوفیەی میصر کۆچی دوایی کرد، لە نزیك گومبەتی ئیمامی شافیعی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. تاج التراجم ١٠٧ – ١٠٨.
٢. البداية والنهاية ١٤/ ٦٤.
٣. كشف الظنون ٢ / ٢٠٣٣.
٤. ايضاح المكنون ١ / ٢٤١.
٥. معجم المؤلفين ١ / ١٤٠.
٦. هدية العارفين ١ / ١٠٤.

## ئەحمەد ئەبوبەکر هەکاری (٨٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی ئەحمەدی هەکاریە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە شاری (مەککە)ی پیرۆز دابەزیوە، کتێبی (الحاوی) هەموو لەبەر بووە، لە (دیمشق) و (حەلەب) و (قاهیرە) و (ئەسکەندەریە)ی خوێندووە، هاتووچۆی مەککەی کردووە، چەند زانایان دەرسیان لە لا خوێندووە، ناسراوە بە زاتەکی چاك و زۆرزان، مەجلیس خۆش و ئاوەدان، لە مانگی صەفەری ساڵی ٨١٨ك – ١٤١٥ز کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی (المعلاة) لە مەککەی پیرۆز بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١/ ٢٠٨.
٢. مشاهير الكورد ١٠٩.
٣. معجم أعلام الكورد ٤٠.

### ئەحمەد ئەبوبەکر زەرزاری (٨٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عیسای زەرزارییە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦١٥ك – ١٢١٨ز کرا قازی (سمیاط) لە ناو عەشیرەتی زەرزاری ئەو سەردەمی.

سەرچاوە: تاریخ أربیل ١ / ٢٣٠.

### ئەحمەد ئەبوبەکر (ثریا) هەولێری (٨٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی عبدالقادرە، خەڵکی هەولێرە مەزهەبی شافیعی بووە، شاعیر بووە، نازناوی شیعری (سورەیا) بووە، لە قوسطەنطینییە کرایتە پشکنەری زانیاری، ساڵی ١٣٢٥ك – ١٩٠٧ز کۆچی دوایی کردووە.

ئەو کتێبانەی داناون: سانحات الرحمان، نظم الأسماء الحسنی، الروضة العلیا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ١/ ١٧٧.
٢. ایضاح المکنون ٢/ ١ – ٢
٣. هدیة العارفین ٥/ ١٩٥.
٤. معجم أعلام الکورد ٧٦.
٥. نثر الجواهر والدرر ١/ ٩٩.
٦. الأعلام ١/١٠٦.

### ئەحمەد ئەبوبەکر مەرعەشی (٨٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی صالحی، کوڕی عومەرە، خەڵکی شاری (مەرعەش)ە ساڵی ٧٨٦ك – ١٣٨٤ز هاتووتەدنیا لە شاری (حەلەب) دابەزیوە، فتوای داوە، دەرسی داوە. چەند دانراوی هەیە، لەوانە: کنوز الفقە، نظم العمدة، نظم الکنز، تخمیس البردة.

کۆچی دوایی: لە مانگی ذي الحجەی ساڵی ٨٧٢ك – ١٤٦٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاج التراجم ١/ ١٠٩.

٢. كشف الظنون ٢/ ١١٦٩.

٣. شذرات الذهب ٧/ ٣١٤.

٤. معجم المؤلفين ١/ ١٧٦.

٥. هدية العارفين ١/١٣٣.

## ئەحمەد ئەحمەد ئەحمەد هەکاری (٨٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حوسێنی، کوڕی موسای هەکارییە، ساڵی ٦٧٤ك – ١٢٧٥ز هاتووتەدنیا، خەریکی خوێندنی فەرموودە بووە، لە (میصر) دابەزیوە، لە (مەنصوریە) کرایتە مامۆستا، چەندان کتێبی فەرموودەی بە خەتە خۆشەکەی نووسیتەوە، ساڵی ٧٦٢ك – ١٣٦٠ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (رجال الصحيحين)ی داناوە. دوو کچی زانای هەبووە ئەسمائە و جووەیرییە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ١٤٥.

٢. الدرر الكامنة ١/ ٦٢.

٣. معجم أعلام الكورد ٤١.

٤. هدية العارفين ٥/ ١١٢.

٥. مشاهير الكورد ٢/ ٢٣٢.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨.

٧. شذرات الذهب ٦/ ٢٨٠.

## ئەحمەد ئەحمەد بەندەنیجی (٨٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی کەرەمی، کوڕی غالیبی کوڕی قەتیلە، خەڵکی شاری (بەندەنیج – مەندەلی)یە، ساڵی ٥٤١ك – ١١٤٦ز هاتووتە

دنیا، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) دەرسی لە لای چەند زانایـان خوێنـدووە لەوانـە، شـێخ عبدالقادری گەیلانی زانیاری لە عەرەبی و لە مێژوو و لـە ناسنامەی پیـاوان بـەهێز بـووە، بەڵام لە فەرمودە زۆر ورد نەبووە، مامۆستا ڕووی نەدایتە دنیا، جـل و بـەرگی خـراپ و شەپڕێوی لەبەر دەکرد جاریش وابوو ئیشی وای دەکرد، کە لەو زانایـە نەدەوەشـاوە، لـە (١٤) مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦١٥ك – ١٢١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ١٣/ ٣٤

٢. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/ ١٠٨ – ١٠٩.

## ئەحمەد ئەحمەد درباس (٩٠)

ناوی ئەحمـەدە، کـوڕی ئەحمـەدی، کـوڕی عـەلی، کـوڕی ئەبوبـەکری، کـوڕی ئەیوبی، کوڕی عبدالرحیمی، کوڕی محەممەدی، کـوڕی عبـد المـەلیکی، کـوڕی درباسـی کوردییە، لـە (قاهیرە) نیشتەجێ بووە، نازناوی (فەخرەدین ئەبو ئیسحاق) بـووە، مەزهـەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی نووسەر و مێژوونووس بووە، دانراوی باسـی بنەماڵـەی دربـاس و ئیبن عەجەمی هەیە، لە ٨١٧ك – ١٤١٤ز کۆچی دوایی کرد. کتێبـی (التبصـرة)ی ئـیبن جەوزی کورت کردیتەوە.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١/١٧٩

٢. معجم أعلام الکورد ١/١٥١

٣. مشاهیر الکورد ١٠٦.

٤. معجم المؤلفین ١/١٥١

## ئەحمەد ئەحمەد حەڕانی (٩١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی بەرەکەی کوڕی ئەحمـەدی کوڕی صەدیقی کوڕی صەڕوف (حەڕانی)یە، ساڵی ٥٥٤ك – ١١٥٩ز هاتووتـەدنیا، لـە

(حەڕان) دەستی بە خوێندن کردووە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) پاشان چوویتە (دیمشق) دوایی گەڕاوە (حەڕان)، زانایەکی شەرع زان بووە، لە (١٦) مانگی صەفەری ساڵی ٦٣٤ك – ١٢٣٦ز لە دیمشق کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/ ١٦٣.

٢. معجم أعلام الكورد ٤١.

## ئەحمەد سەید ئەحمەد نەقیب (٩٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سەید ئەحمەدی، کوڕی شێخ مەحمودی، کوڕی شێخ مارف کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەیە، ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز لە شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە منداڵییەوە لەبەر خوێندن داندرا. دەرسی لە لای مەلا حامیدی بالیکدەری خوێند، دوایی بۆ دەرسی سەرەوە چووە لای مەلا عیرفان ئەفەندی، وە لە قۆناغی کۆتاییدا چووە لای شێخ مصطەفای موفتی کوڕی بابا ڕەسولی بەرزنجی.

کە باوکی کۆچی دوایی کرد، هەر بە گەنجی کرا (نەقیبی) شاری (سلێمانی) هەروەها پێش نوێژبو و دەرسی فەقێیانی دەدا، ساڵی ١٣٢١ك لە ڕێگای هەولێر و موصل چووە (ئەستەمبۆڵ) لەوێ چاوی بە سوڵتانی عوسمانی کەوت، مانگانەی بۆ مزگەوت و تەکیەکەی بڕییەوە، لە ١٣٢٢ك گەڕاوە (سلێمانی) سەربردەی ئەم سەفەرەی خۆی لە دانراوێك نووسیوە ناوی ناوە (نفح الطيب في تاريخ رحلة السيد أحمد النقيب).

ساڵی ١٣٢٨ك لەگەڵ مەلا مصطەفای کوردی و شێخ عەزیزی بەرزنجی چوونە سەفەری حەج، لە (مەککە) ی پیرۆز دابەزی، ئەمیری (مەککە) پێشوازی کرد، ئەرکی مێوانداری خستە سەر شانی خۆی بە شێوەکی ڕێك و پێك، ئەمجا هاتە (مەدینە)ی پیرۆز لەوێ نەخۆش کەوت، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا. مەلا مصطەفای کوردی دەرس بێژی مزگەوتی سەید حەسەن دەڵێ: {کاتی گۆڕەکەمان هەڵکەنی، بەردێك بەدەرکەوت، کە پاکمان کردەوە، نووسراوێکی لێ

هەڵکەندرابوو، نووسرابوو بە زمانی عەرەبی (هذا قبر المرحوم المبرور السید أحمد البرزنجي) خەڵکەکە زۆر سەرسام بوون}.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی: زاتەکی بەسوود بوو، ئیش و کاری خەڵکانی زۆر جێبەجێ دەکرد، خانەقاکەی بەردەوام پڕبوو لە مێوانان، هەموو جۆرە پێداویستییان بۆ پێشکێش دەکرا، بەبێ منەت و بێزاری.

مامۆستا سەید نووسەر و ڕۆشنبیر و شاعیر بوو دیوانی شیعری بە سێ زمان: کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، ساڵی ١٩٨٥ز بە لێکۆڵینەوەی مەحمود ئەحمەد محەممەد لە چاپخانەی (ئیرشاد) لە بەغدا چاپکرا.

سەرچاوەکان:

١. دیوانی سەید ئەحمەدی نەقیب ١١ – ١٦.
٢. تاریخ السلیمانیة ٢٣٩.

## ئەحمەد ئیدریس ماردینی (٩٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیدریسی، کوڕی یەحیایە، مەزهەبی حەنەفی بووە، خەڵکی شاری (ماردین)ە، پاشان چوویتە (دیمەشق) زانایەکی ئەستێرەناس بووە، لە ٧٢٨ك – ١٣٢٧ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبانی (نظم الدرر في معرفة منازل الشمس والقمر) و (سرح الغلام وشرح الغرام)ی داناون.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/ ١٩٦٣.
٢. ایضاح المکنون ٢/١٣.
٣. هدیة العارفین ١/١٠٥.
٤. معجم المؤلفین ١/ ١٥٩.
٥. معجم أعلام الکورد ٤٦.

## ئەحمەد ئیسحاق دیاربەکری (٩٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی یەحیای، کوڕی ئیسحاقە، لە ٦٩٣ك – ١٢٩٣ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی و چەند زانایانی خوێندووە بوویتە مەلا، دەرسی فەرموودەی داوە، زانایەکی قسەخۆش بووە، دۆستی پیاوچاکان بووە، لە ٧٦٤ك – ١٣٦٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/٦٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨.

## ئەحمەد ئیسماعیل بەرزنجی (٩٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی زەینەلعابیدینی کوڕی محەممەدی کوڕی زەینی کوڕی جەعفەری کوڕی حەسەنی کوڕی عبدالکریمی بەرزنجی یە، لە شاری (مەدینە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، بۆیە ناسراوە بە (مەدەنی) ماوەك لە مەدینەی خوێندووە، پاشان چوویتە (میصر) گەڕایتەوە کرایتە (مدرس)، لە پەرلەمانی عوسمانی نوێنەری شاری (مەدینە) بووە، دوایی چوویتە (شام) لەوێ لە ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا زنجیرەی ئیجازەی دەچێتەوە سەر شێخ ئەحمەد عەلی ئیبن حەجەری عەسقەلانی، ئەویش قوتابی زەینەدین عبدالرحیم حافیزی عێراقی کوردییە.

مامۆستا چەند کتێبی داناون، لەوانە: المناقب الصديقية، مناقب عمر بن الخطاب، مقاصد الطالب في مناقب علي بن ابي طالب، النصيحة التامة لملوك الاسلام والعامة، فتكة البراض، إصابة الدواهي في إعراب (إلآهي)، جواهر الإكليل، النظم البديع في مناقب أهل البقيع.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ١٦٤ – ١٦٥.

٢. إيضاح المكنون ٢/٦٥٤.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٦.
٤. إسهام علماء كردستان العراق في الثقافة الاسلاميه ١٧٦.
٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/ ٣٥٣ – ٣٥٦.
٦. الدرر السنية. دەستنووسی محەممەد مەنەوی فوراتی
٧. معجم أعلام الكورد ٤٣ – ٤٤.

## ئەحمەد ئیسماعیل تەیمور (٩٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی عەلی تەیموری کوردییە، لە کوردەکانی شاری (موصلّ)ە برای عائیشە تەیموری شاعیرەی بەناوبانگە، لە (٢٢)ی مانگی شەعبانی ساڵی ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز لە (قاهیرە) هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای محەممەد عەبدە و چەند زانای (میصر) خوێندووە، زمان ڕەوان و ڕێزمانزان و مێژووناس و نووسەر بووە، ئەندامی کۆڕی زانیاری عەرەبی بووە، لە (دیمشق) لە (٢٧)ی مانگی شەوالی ساڵی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز کۆچی دوایی کردووە.

ئەو کتێبانەی داناون: تصحيح كتاب لسان العرب لابن منظور، أوهام شعراء العرب في المعاني، اليزيدية ومنشأ نحلتهم، تراجم أعيان القرن الثالث عشر واوائل الرابع عشر، التصوير عند العرب.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ١٦٦.
٢. معجم أعلام الكورد ٤٤ – ٤٥.
٣. نثر الجواهر والدرر ١/ ٩٠ – ٩٤.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٤ – ٦٥.
٥. مشاهير الكورد ٩٨ – ١٠٠.

## ئەحمەد ئیسماعیل کورانی (٩٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیسماعیلی کورانی یە، نازناوی شەمسەدین بووە، ناسراوە بە (شیخ الاسلام)، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ٨١٣ک – ١٤١٠ز هاتووتە دنیا، سەرەتای خوێندنی لە وڵاتی خۆی دەست پێ کردووە، پاشان چوویتە (میصر) لای مەلا چاکەکانی ئەو سەردەمی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی لە شێخ ئیبن حەجەر وەرگرتووە، دوایی چویتە (بروسە) لە لایەن سوڵتان مرادی دووەم لە قوتابخانەی (خوداوەندی کار) و (بایەزید) دەرسی داوە، دوایی کرا مامۆستا تایبەتی سوڵتان محەمەدی (فاتیح) دوایی کرا قازی (بروسە) پاشان گەڕاوە (میصر) سوڵتان قایتەبایی زۆر ڕێزی لێنا، دوایی گەڕاوە (بروسە) ساڵی ٨٦٢ک دووبارە کراوە قازی، پاشان کرا موفتی، لە ٨٩٣ک – ١٤٨٨ز کۆچی دوایی کرد، چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. الكوثر الجاري على رياض البخاري: لە ٨٧٤ک لە (ئەدرنە) تەواوی کردووە.
٢. الدرر اللوامع في شرح جمع الجوامع.
٣. رسالة في الرد على ملا خسرو.
٤. شافية: هۆنراوەیە لە (عەروز).
٥. العبقري: پەراوێزە لەسەر (شاطبية).
٦. غاية الأماني في تفسير الكلام الرباني: لە ٨٦٧ک تەواوی کردووە
٧. كشف الأسرار في قراءة امة الامصار.
٨. المرشح شرح الكافية في النحو.
٩. فرائد الدرر في شرح لوامع الغرر في القراءات.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ١/٩٤ /٦/ ٩٧.
٢. البدر الطالع ١/ ٣٩.
٣. الضوء اللامع ١/ ٢٠٠.

٤. معجم المؤلفين ١/ ١٦٦.
٥. إيضاح المكنون ٢/ ٩٢.
٦. هدية العارفين ٥/ ١٣٥..
٧. كشف الظنون ٢/ ١١٩٠.
٨. مشاهير الكورد ٢/ ٢٠٣ – ٢٠٥.
٩. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١ – ٤٢ – ٥٤ – ٦٨ – ٧٢.
١٠. معجم أعلام الكورد ٤٢ –٤٣.

## ئەحمەد ئەفەندی (ئاکرێ) (٩٨)

مامۆستا مەلا ئەحمەد ئەفەندی (ئاکرێ) زانایەکی بەرز بووە، خوێندنی لە (هەولێر) و (کەرکوك) و (کۆیە) بردەسەر، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا محەممەدی جەلی زادەی کۆیە وەرگرت، ماوەك لە (بارزان) پێش نوێژ و (مدرس) بوو، لە کاتی جەنگی گەورەی جیهانی یەکەم هاتە (ئامێدی) دوایی باری کرد، بۆ (ئەسپیندارە)ی بەرواری ژێری، پاشان هاتە (زاخۆ) لەوێ نیشتەجێ بوو، مەدرەسەی فەقێیانی هەبوو، دەوری پەنجا مەلا لەسەر دەستی ئەو پێگەیشتوونە و ئیجازەیان وەرگرتووە، چووینە دێهاتان، بووینە مەلا و ئامۆژگاری خەڵکانیان کردووە.

کۆچی دوایی: مامۆستا بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا لە بەرواری ١٣٧٨ك – ١٩٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: اسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلاميه ٢٤

## ئەحمەد ئەفەندی طاها زادە (٩٩)

قازی ئەحمەد ئەفەندی طاها زادە، لە دەوروبەری ساڵی ١١١٠ك – ١٦٩٨ز هاتووتەدنیا، لە کوردەکانی عێراقە، بەڵام لە شاری (حەلەب) دانیشتووە، یەك بووە لە زانا و ماقووڵانی ئەو شارە، ساڵی ١١٤٧ك کرا نەقیبی ئەشراف، پاشان کرا قازی (قودس)، دوایی کرا قازی (بەغدا)، ساڵی ١١٦٥ك گەڕاوە (حەلەب) قوتابخانەی (ئەحمەدیە)ی

دروست کرد، سێ هەزار کتێبی وەقفی لێ دانا، دە هۆدەی تایبەتی بۆ فەقێیانی کورد دروست کرد، لەو وەقفە شەرتی کرد: {خزمەتگوزاری و سەرپەرشتی کاری مزگەوت، پێش نوێژ و دەرس بێژ دەبێ هەر هەموویان کوردی سۆرانی بن}.

هەروەها مامۆستا شێخ ئەحمەد ئیبراهیم کوردی لەو قوتابخانە بە (مدرس) دانا، مامۆستا لە ١١٧٧ك – ١٧٦٣ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١٠٦.

٢. معجم أعلام الكورد ٧١ – ٧٢.

## ئەحمەد ئیلیاس (ئەحمەدی خانێ) (١٠٠)

ناو و نژادی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی شێخ ئیلیاسە، لە هۆزی (خانی)یە، شێخ ئیلیاسی باوکی ڕیش سپی ئەو هۆزە بووە، پرس و ڕایان هەر بەو بووە کۆبوونەوەیان لە ماڵی ئەو بووە، ئەو هۆزە لە جزیرەی بۆتان لە کوردستانی تورکیا دادەنیشن، مامۆستا شێخ ئەحمەد ساڵی ١٠٦١ك – ١٦٥١ز لە شاری (بایەزید) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: کە پارچەرە بوو ناردرا بەر خوێندن، بۆ پەرە بە خوێندن دان، لە چەند مەدرەسانی بەناوبانگی ئەو سەردەمە گەڕا، وانەکانی: (نەحو و صەرف و بەلاغە و حیکمەت و کەلام فەلسەفە و ئوصولی لە (مرادیە) و (بایەزید) خوێند ئەمجا چووە (ئورفە) دوایی چووە (ئەخلاط) دوایی چووە (بەتلیس) پاشان بۆ شارەزایی زانستەکان چووە (میصر) لەوێ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هێنا، گەڕاوە (بایەزید) لەوێ کرا (موفتی) و (مدرس).

پلەی زانیاری: (خانێ) عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، لە زانستی حیکمەت و کەلام دەستی باڵا بووە، خواناسێکی مەزن بووە، عاشقێکی ناودار بووە، جێگەی لە ناخ و دەروونی هەموو کوردێك هەیە، (خانێ) جگە لە مەلایەتی شاعیرێکی مەزن بووە، نووسینی

بروانامەی بۆ خوێندنی سەرەتایی داناوە، یەکەم کەس بووە فەرهەنگی کوردی بە هـۆنراوە داناوە، (خانێ) مێژوونووسی نەتەوەی کوردە، بە ڕاستی چالاکی ئەو زاتـە لـە هـۆنراوەی چیرۆکی (مەم و زین) بە ڕۆنی دەردەکەوێ.

هۆنراوەکانی: (خانێ) چەند هۆنراوەی هەنە لەوانە:

١. نەوبەهار: فەرهەنگی عەرەبی کوردییە، جاریش وایە دەیکاتە کوردی عـەبی، لەسـەر بەحرەکانی عەروزی داناوە، ساڵی ١٠٩٤ك – ١٦٨٣ز تەواوی کردووە، لە ساڵی ١٩١٨ز لە تورکیا چاپ کرا، لە ١٩٧٩ز دووبارە لە چاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کورد لە بەغدا چاپ کراوە سەرەتایەکەی بە: (بسم الله الـرحمن الـرحیم، مەبـدەئێ هەر عیلمەکی ناڤێ عەلیم) دەست پێ دەکات.

٢. عەقیدەی ئیمان: دەوری حەفتا شیعرە، سەرەتای بە

لـباتە محقق بتن ئەڤـ جەواب دهۆگۆ تەمن هاتفێ بێ حیجاب

سا (ئەحمەد) سەناکە (بقول صحیح) لـتوحیدێ باری (بلفظ فصیح)

٣. مـەم و زیـن: دەوری (٢٦٦٠) دوو هــەزار و شــەش صــەد و شێـست شـیعرە، هۆنراوەکی زۆر بەتامە، هەر چەندە لە ناوڕا چیرۆکە بەلاّم لـە ناوەرۆکـەوە پـڕە لـە نیشتمان پەروەری، پڕە لە ئامۆژگاری نەتەوەی کورد، هاندانـە بـۆ تـەبایی بـۆ مـاف وەرگرتن بۆ یەکدی گرتن، ئەم کتێبە بە نرخە چەند جار چاپ کراوە و وەرگێڕدراوە و تەرجوومەکراوە بۆ چەندان زمانی بیانی، ساڵی ١٩٢٠ز لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا، بەلاّم زوو بە زوو حکومەتی تورك هەر هەمووی سوتاند، بـۆوەی کـەس سـوودی لێ وەرنەگرێت.

- ساڵی ١٩٣٥ز پیرەمێرد لـە چاپخانەی ژینی (سلێمانی) بە چاپی گەیاند.
- ساڵی ١٩٣٦ز لـە ئێران بە شەرحەوە لـە چاپ درا.
- ساڵی ١٩٤٢ز لـەگەل شەرحی بە زمانی فەرەنسی لـە (بێروت) چاپ کرا.
- ساڵی ١٩٤٧ز هەمزە ئاغا لـە (حەلـەب) لـە چاپی دا.

- ساڵی ١٩٥٣ز گیوی موکریانی لە (هەولێر) چاپی کردەوە.

خانێ و هەستی نەتەوایەتی: خانێ دڵی زۆر نارەحەت بووە لەبەر چەوساندنەوە و ماف خورانی نەتەوەکەی خۆی، لە شیعرەکانی باسی بێ کەسی و بێ خاوەنی و بێ سەرۆکی خۆمان دەکات، دەڵێ:

ئەنواعی میلەل خودان کتێبن | کرمانج تەنێ دبێ حسێبن
کرمانج نەپڕ دبێ کەمالن | ئەمما دیەتیم و بێ ماجالن
فیلجوملە نە جاهیل و نەزانن | بەلکێ دسەفیل و بێ خودانن

هەروەها خانێ گازاندە لە گەلی کورد دەکات، کە خۆ بەخۆیی خوێنی یەك فڕ دەکەن، زمان لێکدی دەدەن، بە پلە و پایەی یەکدی دڵتەنگ و نارەحەتن حەزیان لە خزمەتکاری و ژێردەستی یە، بۆ بێگانە بە ئاسانی سەر شۆڕدەکەن، وە خانی حەز دەکات کورد دین و دەولەت و علیم و هونەرو کتاب و دیوان، هەر هەمووی پێکەوە گرێدات:

گەردێ هەبو واما ئیتتفاقەك | ویکڕا بکرامە ئینقییادەك
تەکمیل دەکرد مە دین و دەوڵەت | تەحصیل دەکرد مە علم و حیکمەت
تەعمیر دبون ژ هەف مەقالات | مومتاز دبون، خودان کمالات
گەردێ هەبو وایە مەژی خودانەك | عالی کەرەمەك، لەتیفە دانەك
عیلم و هونەر و کەمال و ئیزعان | شیعر و غەزەل و کتاب و دیوان

٤. هۆنراوەی چیرۆکی (یوسف و زولەیخا) بە کوردی، سەرەتایەکەی بە: (سەر دەفتەری جوملەیی کتابان...) دەست پێ دەکات. بە چەند دێر لە کۆتایی یەکە، دەڵێ:

ئەز هێوی د کەم ژ زاتی ئەمجەد | ئازاد بکەی بەبەخشی (ئەحمەد)

٥. چەند ئەشعاری کوردی.

کۆچی دوایی: لە مێژووی (طار خانی إلی ربه) کە بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١١٢٢ك – ١٧١٠ز کۆچی دوایی کرد، لە شاری (بایەزید) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٤٠٥ – ٤١٨ -٦٥٦ – ٦٦٨.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/ ١٠٨ – ١٢٧.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/ ١٠٧ – ١٨٣ – ١٨٥.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/ ١٧٧– ١٨١.
٥. مێژووی ئەدەبی کوردی ٢/ ٣٠٧ – ٣٧٥.
٦. مەم و زین
٧. مشاهیر الکورد ١/ ٩٣ – ٩٤.
٨. ئەدەبی کوردی ٢٤٥ – ٢٥٦.
٩. الأکراد في بهدینان ١٩٤.
١٠. معجم أعلام الکورد ٤٦ – ٤٨.

## ئەحمەد ئیلیاس شارەزوری (١٠١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئیلیاسە، خەڵکی شارەزورە، باوکی چووە (دیمشق) لەوێ کرا ووتارخوێن و هەر لەوێش ژنی هێنا، مامۆستا ئەحمەد لەوێ خوایدا، کە فامی کرد لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد، پاشان چووە قوتابخانەی (سومەیساطییە) ماوەکی زۆر لەوێ ماوە، تا شارەزایی لە مەزهەبی شافیعی و زانستەکان زەریف پەیداکرد، دوایی وەزعی لەوێ نالەبار بوو، ڕۆیشت بۆ (ئەستەمبۆڵ) پاشان چووە (طرابلس) ساڵی ١١٦١ك چووە (میصر) لەوێ محەمەد پاشای راغیب زۆر ڕێزی لێنا، ئەویش چەند شیعری پێدا هەڵگوت.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی یەك شەممەی (١٢)ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١١٦٩ك – ١٧٥٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ١/٨٢ – ٩٦.

٢. تاريخ السليمانية ٢٣٩ – ٢٤٠.
٣. معجم أعلام الكورد ٤٨ – ٤٩.
٤. مشاهير الكورد ٩٤.

## ئەحمەد ئەمین فەیلەسوف (١٠٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سەید ئەمینی، کوڕی سەید محەممەدی، کوڕی سەید ئەمینی، کوڕی سەید خضری، کوڕی سەید بوانی، کوڕی سەیدخان عەلی یە، بە ڕەگەز دەچێتەوە سەر سەید ئەحمەدی (باینجۆ) گوندێکە لە نزیك (سنە) لە کوردستانی ئێران.

ساڵی ١٣٣٠ك – ١٩١٢ز لە ناوچەی جەباری سەر بە کەرکوك هاتووتەدنیا، هێشتا منداڵ بوو باوکی باری کرد بۆ (بەغدا) لەوێ باوکی لەبەر خوێندنی دانا، دوایی چووە لای مەلا عبدالقادر و مەلا عبدالصمد لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی، لەوێ چەند فەرموودەی پێغەمبەر و کتێبی گولستان و دیوانی حافزی شیرازی خوێند، ئەمجا گەڕاوە (کەرکوك) ماوەك چووە (لەیلان) دوایی چووە گوندی (فورقان)، ماوەکیش لە گوندی (باوە) بوو پاشان چووە خانەقای مەولانا خالید لە شاری (سلێمانی)، ماوەکیش لە خانەقای (مەحوی) بوو، دوای سێ ساڵان گەڕاوە (کەرکوك)، لە چەند شوێنانی خوێند، دوا هەوار ساڵی ١٩٣٩ز چووە لای مامۆستا مەلا عومەری ئۆمەرگومبەت ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا بووە مەلا لە گوندی (زەردك) ناوچەی سالەیی، دەوری پازدە ساڵ لەوێ ماوە، دوایی باری کرد چووە (مودفەر) نزیك چەمچەماڵ، ماوەکیش لە گۆپتەپەی نزیك (ئاغجەلەر) بوو، ماوەك لە (چیمەن) بوو نزیك (کەرکوك)، دوایی چووە (کەرکوك)، پاشان چووە (سامەرا)، دوایی گەڕاوە کوردستان، ساڵی ١٩٧٤ز کرا ئەندامی دادگای تەمیزی کوردستان لە (چۆمان) لەسەر داخوازی سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانی، پاشان ئاوارەی ئێران بوو لە ئۆردوگای (سەبزاب) دێسفول نیشتەجێ بوو، ساڵی ١٩٧٧ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە (چەمچەماڵ)، ماوەکیش ناردرا (کوبێسە) نزیك

(رومادی) لەوێ دەرسی دەدا، لە ١٩٧٩ز چووە حەج لە ١٤/٤/٢٠٠٤ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٤٢ – ٤٨.

## ئەحمەد باتەیی (مەلای باتەیی) (١٠٣)

ناوی ئەو مامۆستایە و مێژووی لە دایکبوونی و کۆچی دوایی لە ناو مێژوو نووسان و نووسەران یەك لا نەکرایتەوە، هەندەك دەڵێن: مەلای باتەیی خاوەنی هۆنراوەی مەولودەکە ناوی حەسەنە خەڵکی (ئەرتوشە)، هەندێکیش ناویان بە حوسێن تۆمار کردیە و دەڵێن: خەڵکی گوندی (باتە)یە، ئەوانە مێژووی لە دایکبوونی ساڵی ٨٢٠ك – ١٤١٧ز یان بۆ داناوە، وە بۆ کۆچی دوایی ساڵی ٩٠٠ك – ١٤٩٤ز یان بۆ داناوە.

بەڵام دکتۆر مارف خەزنەدار، ساڵی ١٠٨٦ك – ١٦٧٥ز بۆ لە دایکبوونی داناوە و ساڵی ١١٧٤ك – ١٧٦٠ز بۆ کۆچی دوایی داناوە، ئەوەش زۆر جیاوازە لەگەل مێژووی پێشوو، وە ئەویش وەکو ئەنوەر مائی ناوەکەی بە حوسێن نووسیوە، محەممەد ئەمین زەکی بەگ لە (مشاهیر الکورد) دەڵێ: {ناوی ئەحمەدە}، منیش ساڵی ٢٠٠٦ز چوومە سەفەری حەج، کە چوومە زیارەتی مەدینەی پیرۆز، لە گۆڕستانی (بەقیع) حاجی مەلا خالیدم دیت کە خەڵکی (دیاربەکرە) لەو مێژووانە شارەزایە، لێم پرسی وەڵامی داوە: {ناوی ئەحمەدە} بۆیە ناوەکەم بە ئەحمەد تۆمار کرد، ئەو زاتە زانایەکی مەزنی گوندی (باتە)ی ناوچەی (حەکاری- هەکاری)یە خوێندنی لە حوجرەی فەقێیان تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەموو ژیانی بە مەلایەتی بردە سەر، لە (باتە) کۆچی دوایی کرد، گۆڕەکەی دیارە و زیارەت دەکرێ.

بەرهەمەکانی:

١. هۆنراوەی مەولود: ناسراوە بە مەولودی باتەیی، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

حەمدی بێ حەد بۆ خودایێ عالەمین     ئەو خودایێ دایە مە دینێ موبین

هۆنراوەکی زۆر ڕێك و بە تامە، جگە لە چیرۆکی لە دایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) چەند ستایش و موعجیزاتی بە سوودی باس کردیە، نوسخەی دەستنووس و چاپی زۆرە، چەند جار چاپ کرایە، لەوانە: ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز لە (قاهیرە) لە لایەن ئەحمەد رامیزی کورد بە چاپ گەیاندرا، وە ساڵی ١٩١٧ز لە (ئەستەمبۆڵ) دووبارە چاپ کراوە، لە ١٣/٩/١٩٦٦ز گیوی موکریانی لە (هەولێر) چاپی کردەوە، ئێمەش نوسخەکی دەستخەتی مامۆستا عبدالکریمی سێبیرانیمان لە لایە، ساڵی ١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز لە (بەحرکە) لەسەر فەرموودەی باوکم نووسیەوە.

٢. قەسیدەی ستایشی پێغەمبەر، دوای مەولودەکە چاپ کراوە، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

ئەحمەدا چاڤا تە (مازاغ البصر) یەك ئیشاراتە، تە (أنشق القمر)

دوایی دەڵێ:

من هەبن سێصەد هەزار ئەزمان و دەڤـ یك دەمێ غافیل نەمینێن، ڕۆژ و شەڤـ
وەصفی حوسناتە کوبێژن صوبح و شام صەد قیامەت دێ بچن، هێژنا تەمام

دوایی دەڵێ:

تابیعێ ئان شەهسوارێ ئوممەتێ پێکڤەڕابین و بچینە جەننەتێ

لە کۆتاییدا دەڵێ:

بۆ جەمیعی موسلیمین و صالیحا بۆ فەقیری (باتە)یی ئەلفاتیحا

٣. قەسیدەی:

محەممەد سەیدێ عالەم، شەفیعێ ڕۆژی میزانێ
چراغێ دیدەیێ ئادەم، خودانێ وەحی و فورقانێ

٤. قەسیدەی شەش خشتەکی چوار کوردی دوو عەرەبی لە مەتحی پێغەمبەر (د.خ):

ئەی نەعتێ تو ئەز عەرشێ هەتا فەرشێ شەهیرا
ئەز پرتەوی نوراتە، جیهان گشتە مونیرا

ئەی سەییدێ عالەم، بکە پەروایی ئەسیرا
ئەی تاجی سەرێ شاهـ و سەلاتین و ئەمیرا
قد کان لك الفضل لك الجود کثیرا
ارسلت الی الخلق بشیرا و نذیرا
طاها تو رەسولێ مەلەکێ عەرشێ عەزیمی
دەر بەحرێ کەمالێ تو تەنێ دوررا یەتیمی
لوو لوو صیفەتی دەر صەدەفی بەحرێ کەریمی
ئەحسەنتر ئەز یوسفی صیددیقی حەلیمی،
ما کان لك الناس شبیها و نظیرا
ارسلت الی الخلق بشیرا و نذیرا
ئەی سەروەری دین مەهبەطی ئایاتی موکەررەم
ئیسمێ تەیە هندێ سەفەحان بوویە موفەخخەم
لوتفا تە شەیاطین ژ سەما کرنە مورەججەم
گەر تو نەبوویە قەد نە دەبوو چەرخی موعەززەم
طوبی لمن اشفقت له کنت موجیرا
ارسلت الی الخلق بشیرا و نذیرا
بارانی صەلاتان ژ خودا صوبح و عەشییا
بەر سەییدێ موختارێ رەسولێ عەرەبییا
بەر ئال و وەئەصحابێ حەبیبێ قورەشییا
صیددیق و چ فاروق و چ عوسمان و عەلییا
کانوا لك في الدين معينا وظهيرا
ارسلت الی الخلق بشیرا و نذیرا
ئەی سەییدی عالەم، سەنەدێ نورا هیدایەت

هیڤی دکەن ئەم ژتە ئەی صەدری ریسالەت
مەحرومی نەکیٚ مەژ دیوانا شەفاعەت
(باتیٚ) بە جەهەننەم نەبری پەرواری قیامەت
قد کنت له ثمه شفیعا و ظهیرا
ارسلت الی الخلق بشیرا و نذیرا

٥. چەند شیعری تاك تاك و کۆمەڵ، لە بابەتانی جیا جیا، کۆنەکراینەوە بکرێنە دیوان و لە چاپ بدرێن لەوانە بۆ نموونە پێنج خشتەکییەکمان دەست کەوتووە، ئەوە دەقەکەیتی:

صوبح و ئێڤاریٚ شەڤا تاری شامالا کیٚ یی تو
لەیلەت و لقەدر و بەراتن نوریٚ مالا کیٚ یی تو
چیچەکە باغیٚ ئیرەم، شۆخ بەژن و بالاکیٚ یی تو
بۆ خودیٚ کەی بێژە من کانیٚ شەپالا کیٚ یی تو
دێم کتێبە زولف و حاشی شەرحی خالا کیٚ یی تو

دولبەرا گەردەن شەفیفیٚ دانوا دور ڕا عەدەن
نازك و مەوزون لە تیفی نەخلیا سەلوا چەمەن
گوڵ لیباسی، گوڵ قیاسی، گوڵ تەنی، گوڵ پیرەهەن
ئاه و یادەشتا تەتاری رەهزەنا ئاسکا خوتەن
حوریا باغیٚ بەحەشتیٚ چاڤ غەزالا کیٚ یی تو

سەرچاوەکان:


١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٤٠ – ٤٦.
٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٢/ ٣٧٩ – ٤٠٧.
٣. مشاهیر الکورد ٢/ ٢٠٣.
٤. تاریخ مشاهیر کورد ١/ ١٣٠.
٥. معجم أعلام الکورد ٧٢٢.

٦. مولویدا باتەیی ٧.
٧. الآكراد في بهدينان ١٩٦.
٨. گولزاری کوردستان ٢٤١.

## ئەحمەد بەهائەدین کۆیی (١٠٤)

ناو و نژادی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا طەیبە، کوڕی مەلا محەممەد قازی[١] کوڕی مەلا ئیسماعیل، کوڕی مەلا ئیبراهیمی، کوڕی ئیسماعیل، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی محەممەدی، کوڕی داودە، ساڵی ١٨٧٨ز لە (کۆیە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: ساڵی ١٨٨٣ز دەستی بەخوێندنی قورئانی پیرۆز کرد، لەلای مەلا عبدالقادری خەڵکی گوندی (الا الله) دوایی دەستی بە (گولستانی) شێخی سەعدی کرد لە لایەن مەلا عەزیزی بالەك، تەصریفی خوێند لە لای مەلا ئەحمەدی (بالیسانی)، عەوامیل و شەرحی موغنی لە لای مەلا عبدالقادری چنارانی خوێند، (سەعیدینی) لە لای مەلا شێخ محەممەدی (کونەفلوسە)ی خوێند، ساڵی ١٨٨٦ز چووە (خەتە)، دوایی چووە (چناران) سعدالله ی گەورەی لای مەلا رەسول خوێند، وە هەمووی لەبەر کرد، گەڕاوە (کۆیە) جامی لە لای مەلا عبدالرحمان خوێند، هاتە (هەولێر) لە ١٨٨٨ز لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ بوو، دوایی چووە (زێوە) لای مەلا ئەحمەدی (وەرێ) عبدالغفور و ئیساغۆجی خوێند لە ١٨٩٢ز گەڕا وە (کۆیە) فەنناری لای مەلا سەعیدی هیرانی خوێند، چووە (سلێمانی) عبدالله یەزدی و عصام الدین و محەممەد ئەمین جیهەت وەحدەی لەوێ خوێند، چووە (ئێران) لە (سابلاغ) کەمال و گەلەنبەوی و شەرحی عەقائید و شەرحی شەمسییە و مختصر ومطول و جمع الجوامع ی خوێند، لە ١٨٩٦ز گەڕاوە (سلێمانی) تشریح الأفلاكی لای مەلا عیرفان ئەفەندی خوێند، گەڕاوە (کۆیە) لای مەلا عبداللەی جەلی شرح المواقفی خوێند، چووە (خانەقین) لای مەلا محەممەدی کوانەدولی کتێبانی (القاضي) و (شرح

---

[١] ساڵی ١٨٣٦ز قازی بوو لە (کۆیە) لە ١٨٥١ز کۆچی دوایی کرد.

التجرید)ی خوێند، لە ١٨٩٧ز ئیجازەی پێدا، گەڕاوە (کۆیە) لە سەرەتای ساڵی ١٨٩٨ز بووە مەلا لە مزگەوتی بایز ئاغا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی و مەلا محەممەد مەلا قادر هەرتەلی و مەلا عبدالغفور مەلا صالح ئارمەندانی و مەلا ڕەسولی مەخموری و مەلا فتح الله شوان و مەلا عبدالحمیدی موفتی و مەلا عبدالعزیزی کانی دەربەندی و مەلا عبدالغفوری پیرەبابی و مەلا محەممەدی کوڕی خۆی.

پلەی مەلایەتی: مامۆستا زانایەکی بەرز بووە، لە زانستەکانی سەرەوە دەستی باڵا بووە، بە تایبەت، لە ئوصول و کەلام و فەرائیز و فەلەکیات.

نووسینەکانی: مامۆستا چەند کتێبی داناون، پەراوێزی لەسەر چەندان هەیە، لەوانە بەشێك لەلای مەلا طەیبی بابا شێخ مابوون، ئەمانەن:

١. شەرحی (ربع المجب)ی مەلا ئەفەندی هەولێر.
٢. نامیلکەك لە (حکمەت).
٣. نامیلکەی کیمیا بە فارسی.
٤. پەراوێز لەسەر جمع الجوامع وتهذیب الکلام و رسالة الحساب و تشریح.

کۆچی دوایی: لە ٢٣/٩/١٩٣١ز لە شاری (کۆیە) دوای نوێژی هەینی کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوری جێگری بوو، لە ١٩٠٠ز لە دایکبوو لە ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا طەیبی کوڕی جێگری بوو لە ١٩٣٥ز لە دایکبوو، ماوەك پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو دوایی کرا (مدرس) لە پەیمانگای ئیسلامی (کۆیە) دوایی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: کەشکۆڵی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئەحمەد تاژانی (١٠٥)

مامۆستا مەلا ئەحمەد خەڵکی گوندی (تاژان)ی نزیك (بانە)ی کوردستانی ئێرانە، بە نیازی خوێندن ووڵاتی خۆی بە جێ هێشت هاتە کوردستانی (عێراق)، چووە مزگەوتی

بایز ئاغا لە (کۆیە) تا ساڵی ١٩٣٦ز لای مەلا بەهائەدین بوو، پاشان چووە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، لەوێ ماوە تاکۆتایی بە خوێندنەکەی هێنا و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، مامۆستا فتح الله کچی خۆی دایێ و کردیە مەلا لە گوندی (مەلۆکان)، لەوێ دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و دەرسی فەقێیان.

مامۆستا دەستی شیعری هەبووە، نامەکی هۆنراوەی عەرەبی بۆ برادەری خۆشەویستی خۆی مەلا عبدالقادر کانی دەربەندی ناردووە، مامۆستا عبدالله ی فەرهادی لە (الإکلیل في محاسن أربیل) دەقەکەی نووسیوە.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٣٦٧ – ٣٦٨.

## ئەحمەد جەعفەر دینەوەری (١٠٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی جەعفەرە، خەڵکی (دینەوەرە)، زانایەکی ڕێزمانزان بووە، لە زانستی نەحو شارەزا بووە، دانراوی لەو بابەتە هەیە، چوویتە (بەصرە) لای مامۆستا (مازنی) خوێندووە، لە (بەغدا)ش لای موبەررەیدی خوێندووە، پاشان چوویتە (میصر) هەر لەوێ ساڵی ٢٨٩ك – ٩٠٢ز کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی داناون: (المهذب في النحو)، (مختصر في ضمائر القرآن)، (إصلاح المنطق).

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/ ١٩١٤.
٢. معجم أعلام الکورد ٤٩.
٣. معجم المؤلفین ١/ ١٨٢.
٤. هدیة العارفین ١/ ٥٣.

## ئەحمەد حامید ئەحمەد کۆچك چەرمك (١٠٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سەید حامیدە، کوڕی شێخ ئەحمەدە، ساڵی ١٢٧٩ك – ١٨٦٢ز لە گوندی (کۆچك چەرمك) هاتووتە دنیا، هەر لەوێ دەستی بە خوێندن کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواو کرد، دوایی سوڕی دا لە قوتابخانەکانی (سەقز) و (سنە) و

(مەریوان)، پاشان هاتە عێراق، ماوەك لە (سلێمانی) و (قەرەداغ) و (هەڵەبجە)ی خوێند، چووە (بیارە) لە خزمەت مەلا عبدالقادری کانی کبۆدی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر (ضیاء الدین) وەرگرت، چووە گوندی (هەمرۆلە) لای شێخ نەجمەدین، خەریکی کاروباری مەلایەتی و فەتوادان بوو، لە ١٣٣٨ك چووە گوندی (کێلەچەرمك).

لە ساڵی ١٣٦٥ك - ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد، ئەم کتێبانەی داناون:

١. تەرجومەی (إحياء العلوم)ی ئیمامی غەزالی.
٢. کەلامی حەزرەتی عەلی (خوا لێی رازی بی) بە تەرتیبی ئەبجەدی.
٣. تەرجومەی (عين الفرائض) بە فارسی.
٤. تەرجومەی (الفتاوي الحديثية)ی ئیبن حەجەر.
٥. حاشیە لەسەر (إعانة الطالبين) بە عەرەبی.
٦. حاشیە لەسەر عەقیدەی مەرضییەی مەولەوی بە عەرەبی.
٧. واجیباتی دینی و عیبادات و موعامەلات بە فارسی.
٨. ئیمان و ئیسلام بە کوردی.

سەرچاوە: تاريخ مشاهير كورد ٢/ ٣٠٦ - ٣٠٧.

## ئەحمەد حەسەن ئەبوبەکر ڕەهاوی (١٠٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حەسەنە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی حەسەنە، خەڵکی (ڕوهایە) پاشان چوویتە (میصر) زانایەکی فەرموودەناس و شەریعەت زان بوو، لە (قاهیرە) دەرسی داوە، ساڵی ٧٧٦ك - ١٣٧٤ز کۆچی دوایی کرد، لە ئەنجامی بەربوونەوەی لە قادرمەیماڵەوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/ ٢٣٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٥٠.

## ئەحمەد حەسەن صائیم دووشیوانی (١٠٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حەسەنی، کوڕی حەمکی، کوڕی محەممەدی، کوڕی حەمکە، عەشیرەتی (مەنتکە) لە گوندی (دووشیوان) سەر بە (قوشتەپە) هاتووتەدنیا، زانایەکی زۆر بە دین بووە، سەرتاسەری ساڵ خەریکی ڕۆژی گرتن بووە، بۆیە ناسراوە، بە (صائیم).

سەرەتای خوێندنی لە لای مەلا شەریفی ڕەنگەڕێژانی بووە، مامۆستای خۆی زۆر خۆش ویستووە، بۆیە یەك لە کوڕەکانی خۆی بەناو ئەو کردووە، مامۆستا چەند کتێبی بە دەستی خۆی نووسینەوە، لەوانە (توحفة)ی ئیبن حەجەرە لە لای مامۆستا مەلا شەریفی کوڕی بوو، ساڵی ١٩٧٢ز لە خانەقای شێخ مەزهەر لە (هەولێر) کە لە خزمەتم دەخوێند، لەو توحفەیە دەرسی پێ دەدام،

خۆزگەم بەم ڕۆژە لە دوو خوێند بووم بۆ شەرع فێر بوون، دەهاتم و دەچووم

دەڵێم لە داخی، ئاڵۆزی دنیا خۆزیا مردبام، لەو ڕۆژە کە بووم

مامۆستا مەلا ئەحمەد شەش کوڕی هەبوو:

١. محەممەدئەمین: جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، نازناوی شیعری (هەوایی) بووە، شیعری عەرەبی و فارسی و کوردی هەیە، پێنج خشتەکی قەسیدەی (جد بلطفك)ی کردووە، کە گۆیا هی حەزرەتی ئەبوبەکرە، ئەویش کۆچی دوایی کرد سێ کوڕی لە دوا بە جێ مان.

أ. مەلا ئەسعەد ئەوەش شاعیر بوو، لە ١٣٤٣ك – ١٩٢٤ز لە کاتی فەقێیەتی کۆچی دوایی کرد.

ب. عبدالله.

ج. سعدالله: پیش نوێژ و ووتارخوێن بوو لە مزگەوتی حاجی نورەدین لە (کەرکوك)، لە ١٩٦١ز چووە مزگەوتی وەشاش لە (بەغدا) لە ١٩٦٣ز چووە مزگەوتی مەرجان، لە

١٩٦٦ز چووە مزگەوتی (عاقولی)، لە ١٩٧١ز گەڕاوە (مەرجان)، پاش ئەو بەرەوارە کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا سەعید: لە (دیبەگە) لای مەلا عبدالفتاحی خەتیبی خوێندوە، لە ساڵی ١٣٢٢ك لە (ترپەسپیان) لای مەلا محەممەدئەمینی هەوایی برای بوو، پاشان لە (مێرغوزار) بووە مەلا و (مدرس).

٣. مەلا شەریف: بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٤. مەلا طیب: بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٥. مەلا عبدالقادر: دەستی شیعری هەبوو.

٦. مەلا صالح.

هەر لەوێ ساڵی ١٣٢٣ك حاشیەی زەینەدینی پیزانی (جهة وحدە)ی نووسیەوە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد٤/ ١٣٤ /٦/ ٣٤٣.
٢. الاکلیل في محاسن أربیل ٣١١ – ٣١٤.

## ئەحمەد حوسێن (ابن الخباز) (١١٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حوسێنی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی مەعالی، کوڕی مەنصوری، کوڕی عەلی یە، ناسراوە بە (ابن الخباز=کوڕی نانەوا). ساڵی ٥٤٣ك – ١١٤٨ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پەروەردە بووە و پێگەیشتوە، دوایی چوویتە (موصل) زانایەکی شەرع زان بووە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (نەحو) زۆر شارەزا بووە، شاعیرێکی چاك بووە، کتێبانی (المفصل) و (ایضاح) و (تکملە) و (جمل) هەر هەمووی لەبەر بووە هەرچەندە نابینا بووە، بەڵام زەینی زۆر تیژ بووە.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: التوجیە، شرح الملح لابن جني، شرح المقدمة الجزولیة، شرح میزان العربیة لابن الانباری، الغرة المخفیة في شرح درة الالفیة لابن معط، مناقب الشیخ ابن قدامة، نظم الفرید في نثر التقیید، النهایة في النحو.

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ١/ ٢٠٠.
٢. البداية و النهاية ١٣/ ١٦٠.
٣. أربيل في مختلف العصور ٧٥.
٤. كشف الظنون ١/ ١٥٥.
٥. هدية العارفين ١/ ١٩٥.
٦. الغرة المخفية /المقدمة.
٧. شذرات الذهب ٥/ ٢٠٢ – ٢٠٣.
٨. بغية الوعاة ١/ ٣٠٤.
٩. معجم أعلام الكورد ٥٠.
١٠. أعلام الزركلي ١/ ١١٤ – /١٦/١٠.

**ئەحمەد حوسێن بەرزنجی (سەید ئەحمەدی خانەقا) (١١١)**

ناوی ئەحمەدە، ناسراوە بە سەید ئەحمەدی خانەقا، کوڕی حوسێنی، کوڕی عبدالقادری، کوڕی ئەحمەدی سەرداری بەرزنجی یە.

ساڵی ١٢٨٦ك – ١٨٦٩ز لە (کەرکوك) هاتووتەدنیا، دوای خوێندن و پێگەیشتنی (خانەقا)ی داناوە، دەستی کردووە بە ئامۆژگاری موسڵمانان و مێوانداری مێونان و یارمەتی هەژاران، زاتەکی قسەخۆش و ڕووگەش و دڵ فراوان و چاو بڵند و نان دەربووە، قسەی نەستەق و پرماناى لێ دەگێڕنەوە.

لە بەرواری ٩/١٩٥٢/١١ز کۆچی دوایی کرد، کوڕە گەورەکەی ناوی عبدالقادر بوو، ئەویش عبدالصمد و عبدالعزیزی هەبوون.

سەرچاوەکان:
١. معجم أعلام الكورد ٥٠.
٢. أعلام كورد العراق ٥١ – ٥٢.

## ئەحمەد حوسێن دینەوەری (١١٢)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی (ئەبونەصرە) کوڕی حوسێنە، خەڵکی دینەوەرە، ناسراوە بە (کسار) لە زانیاری قورئانی پیرۆز شارەزابووە، لەو بابەتە کتێبی (المنیة في القراءات)ی داناوە، لە ٤٣٣ك -١٠٤١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ٢٠٥.

٢. كشف الظنون ٢/ ١٨٨٦.

## ئەحمەد حوسێن قزلجی (١١٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حوسێنی، کوڕی عەلی قزلجی یە، ساڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز لە (مەهاباد) هاتووتەدنیا، لە ژێر چاودێری باوکی کتێبەکانی بەرێزە لە تەصریفی زەنجانی تاکو تەهزیب هەمووی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا محەممەدی برا گەورەی جمع الجوامع و قازی لاری و تحفە و ئوسطرلابي خوێند، وە ئیجازەی وەرگرت.

ماوەك خەریکی دەرس دانەوە بوو، دوایی لە ١٣٥٦ك – ١٩٣٧ز کرا فەرمانبەر، لە ١٣٦٨ك – ١٩٤٩ز لە (ورمێ) کرا نووسەر، پاشان لە (تەورێز) کرا مامۆستای زانکۆ.

کۆچی دوایی: لە ١٤٠١ك – ١٩٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. تاریخ ئەدەبیاتی عەرەب (فارسی).

٢. شەرحی (المعلقات السبعة) (فارسی).

٣. الاستاذ سعدي شیرازي (عەرەبی).

٤. داستانی مەنظوم (فارسي).

٥. علومی مەعان و بەیان (فارسی).

٦. آداب المناظرة.

٧. دیوان ئەشعار.

٨. رسالة الحذف.

٩. رد الأقانيم الثلاثة.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ مشاهير كورد ٢/ ٤٧٧ – ٤٧٩.

٢. کۆنگرەی زانیارانی کورد ٥٥٤ – ٦١٩.

## ئەحمەد حوسێن گردعازەبانی (١١٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حوسێنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی داود ئاغایە، عەشیرەتی (شوان)ە، باپیرە گەورەی لە گوندی (گورگەیی)ی نزیك (قەرەهەنجیر) دانیشتووە، دوایی ناکۆکی لەگەڵ خەڵکەکە پەیدابووە، باری کردووە بۆ (هەولێر) مامۆستا ساڵی ١٩١٧ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە سەرەتاوە لای باوکی دەستی بە خوێندن کرد قورئانی پیرۆز و چەندان کتێبی سەرەتایی تەواو کرد، پاشان بۆ تەواوکردنی قۆناغەکان چووە خزمەت ئەو مامۆستایە بەڕێزانە: مەلا عبداللە ی سوریژەیی و مەلا ئەحمەدی بانەی ڕەش و مامۆستا مەلا عبداللە ی بەحرکەیی و مەلا عومەری کەوری و مەلا محەممەدئەمینی سوێری و مەلا سەعیدی فەرهادی و جەنابی مەلا ئەفەندی هەولێر

دوا سوڕدانی چووە هەولێر لە مزگەوتی حاجی عبدالقادر دەباغ لە خومەت مامۆستا مەلا عبداللە ی بێتواتە ماوە تا ساڵی ١٩٤٧ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (گردەشێر) دوایی چووە (گردعازەبان) لە ١٩٥١ز چووە (هەولێر) دوایی چووە (سیاو) لەوێ باری کرد بۆ (گورگەیی) لە ١٩٥٩ز گەڕاوە بۆ (گردعازەبان) لە ١٩٦٣ز گەڕاوە (هەولێر) دووبارە گەڕاوە (گردعازەبان) لە ١٩٦٩ز گەڕاوە (هەولێر) لە ١٩٧٠ز بووە مەلای (قۆریتان) لە ١٩٧٥ز گەڕاوە

(هەولێر) لە ١٩٧٧ز چووە (شێراوە) لە ١٩٨٠ز چووە (دووسەرە)ی فەتتاح ئاغا لە ١٩٨٨ز هاتە مزگەوتی حاجی ڕەمەزان لە گەڕەکی سێتاقان لە هەولێر.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٩٩٤/١٤/٨ کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی پیرداود لە تەنیشت مەلا خەلیلی (مخلص) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. چاوپێکەوتن لەگەڵ دکتۆر ئیبراهیم کوڕی مامۆستا مەلا ئەحمەد، مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین لە (هەولێر)

٢. ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٤٩ – ٥٤.

## ئەحمەد حوسێن هەمەدانی (١١٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حوسێنی، کوڕی یەحیای، کوڕی سەعیدی، کوڕی بیشرە، ناسراوە بە (بدیع الزمان)، نازناوی ئەبولفەضل بووە، ساڵی ٣٥٨ك – ٩٦٨ز لە شاری (هەمەدان) هاتوتە دنیا، نووسەر و دانەر و زەین تیژ و بیر صاف و مێشك فراوان بووە، ساڵی ٣٨٠ك چووە (هەرات) ماوەك لەوێ ماوە، دوایی چووە (جورجان)، ساڵی ٣٩٢ك چووە (نیسابۆر) پاشان چووە (سەجستان) و (غەزنە)، چەند مەلیك ڕێزیان لێ ناو خەڵاتیان کرد. مامۆستا دیوانی شیعری چاپکراوی هەیە، (٢٣٣) نامەی هەیە، ساڵی ٣٩٨ك – ١٠٠٧ز لە (هەرات) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفیات الاعیان ١/ ١٠٩ – ١١١.

٢. شذرات الذهب ٣/ ١٥٠.

٣. البدایە والنهایە ١١/ ٣٥٨.

٤. کشف الظنون ١/ ١٦٤.

٥. معجم المؤلفین ١/٢٠٩.

٦. معجم أعلام الکورد ١٤٣.

## ئەحمەد حەمەئەمین خەلیفە (١١٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حەمەدئەمینی، کوڕی عەلی، کوڕی عومەرە، لە دەورووبەری ساڵی ١٩٠٠ز لە گوندی (سەید عوبێد) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی لە خزمەت باوکی خوێند، دوایی چووە (خورمەلە) لای مەلا عوسمان، ماوەك لە (عەوێنە) بوو لای مەلا عەزیز، پاشان چووە (ماجیداوە) لای مەلا یەحیا، دوایی چووە (نۆغەران) لای مەلا عبداللە، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لەوێ تا جەنابی شێخ ئیجازەی پێدا.

مەلایەتی: مەلایەتی لە دەشت لەم شوێنانە کرد: (دالداغان)، (تەخیەم)، (کانی بزرە)، پاشان باری کرد، هاتە (هەولێر) کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ لە مزگەوتی حاجی عبداللە حەمامچی لەگەڕەکی (تەیراوە) دوایی چووە مزگەوتی حاجی قادر هەر لەو گەڕەك، ماوەکیش مەلا بوو لە مزگەوتی حاجی مەجید لە ساڵی ١٩٨٥ز کۆچی دوایی کرد لە هەولێر.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٦ – ٦٨.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٣٨١ – ٣٨٢.

## ئەحمەد حەیدەر ئەحمەد حەیدەری (١١٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی حەیدەری، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەیدەرە، لە مەدرەسەی خۆیان (ماوەران) پێگەیشتووە، خوێندنی لە خزمەت باوکی تەواو کردووە و ئیجازەی لەسەر دەستی ئەو وەرگرتووە، ساڵی ١١٩٦ك – ١٧٨٢ز لە (ماوەران) دەرسی داوە، ناسراوە بە زانایەکی بێ وێنە و بێ ئاوقەران لە چەرخی خۆی، حاشیەی لەسەر (عصام الدین) لە زانستی (بەیان) هەیە: نووسخەکی دەست خەتمان هەیە، مەلا محەممەدی سەلماسی لە ساڵی ١٣٦٢ك – ١٩٤٣ز لە سەر کتێبی دانەری نووسیتەوە.

مامۆستا پێنج کوڕی مەلای هەبووینە: خضر و عبدالغفور و عبدالعزیز و عبدالله و شەهابەدین کە لە مەودوا باسیان دەکەین – بە ئیزنی خودا –.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٨ – ١٢٩.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٤٣.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٠ – ٢٣١

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٢٠٨ – ٢١٥.

## ئەحمەد حەیدەر محەممەد پیرەدین (١١٨)

ئەمەش یەکە لە مەلا چاکەکانی حەیدەرییەکانی (ماوەرانێ)، لە لای باوکی خوێندووە هەر لە خزمەت ئەو ئیجازەی وەرگرتووە، ماوەك لە (ماوەران) ڕۆیشت چووە (شام) لەوێ لە قوتابخانەی (قەجماسیە) دەرسی دەدا، دوایی گەڕاوە کوردستان مامۆستا چووە سەفەری حەج، لە ڕێ لە ناو کەشتی ئاشنایی لەگەڵ زانای بەناوبانگی هیندی عبدالحکیمی سەیلەکوتی پەیدا دەکا، بەو بۆنەیە پاش گەڕانەوەی لە سەفەری حەج نوسخەکی لە کتێبی (المحاکمات) کە دانراوی خۆیتی بە دیاری بۆ عبدالحکیم دەنێرێ، ئەویش بەرانبەر ئەو دیارییە نوسخەکی کتێبی (مطول) خەتی دانەرەکەی کە تەفتازانی یە بۆی دەنێرێ.

مامۆستا کتێبی دانراوی خۆی زۆرن، لەوانە:

١. حاشیە لەسەر (شیفا)ی ئەبوعەلی سینا.

٢. حاشیە لەسەر (اثبات الواجب)ی جەلالەدینی دەوانی.

٣. حاشیە لەسەر شەرحی (عصام الدین) ئیستعارە.

٤. حاشیە لەسەر شەرحی (عصام الدین)ی عضدیە.

٥. تفسیر (الله نور السموات والارض).

٦. رسالة في أشراط الساعة.

٧. مختصر فتاوى (ابن حجر) الهيتمي.

٨. روض النضير.

٩. نامیلکەی (تەڵاق).

١٠. نبذه عن الافكار، و زبده عن الانظار، سەیدا حەمدی سەلەفی ساڵی ١٩٩٧ز لە (دهۆك) چاپی کرد.

١١. محاكمات: حاشیەیە لەسەر شەرحی عەقائیدی مەلا جەلالی دەوانی و حاشیەی یوسفی قەرەباغی و حوسێنی خلخالی، دادوەری لەنێوان ئەو دووانە دەکات، بۆیە ناوی ناوە (المحاكمات)، نوسخەکی دەست خەتی ئیسماعیل مەکی وەلیەدین ئەفەندی ساڵی ١١٩٩ك – ١٧٨٤ز نووسیتەوە، لە لامانە.

کوڕەکانی: مامۆستا شەش کوڕی هەبووە، هەر هەموویان مەلا بووینە: محەممەد ساڵی ١٠٣٦ك – ١٦٢٦ز لە دایك بووە. وە هەروەها حەیدەر و خالد و عومەر و عەباس و حوسێن.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ١٠٧٠ك – ١٦٥٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. عنوان المجد ٨٧ تا ١٢٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥ – ٥٧ – ١٨٥.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٢٦ – ٢٢٧.

٤. علماء ومدارس في أربيل ٤٠.

٥. بنەماڵەی بەناوبانگی رواندز ٤١

٦. الاكليل في محاسن أربيل ١٩٢ – ١٩٣.

٧. نبذه عن الأفكار وذبده عن الانظار/ المقدمة.

٨. دەنگی زانا ٣١ و ٣٢، ١٩٩٩ز.

٩. کاروان ٨٧، ١٩٩٠ز

١٠. مشاهير الكورد ١/ ١٨٩.

١١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٢٠٠ – ٢٠٥.

## ئەحمەد خالید عبدالملك (١١٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی خالیدی، کوڕی عبدالمليكی، کوڕی سەرجە، خەڵکی گوندی (سەفەر مەرط) ی سەر بە شاری (حەڕان)ە، نازناوی (ئەبوبەدرە)یە، دەرسی لە لای وەلیدی کوڕی عبدالمليكی کوڕی وەهەب خوێندووە، خۆشی دەرسی بە ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیبراهیم داوە، پێش ساڵی ٥٦٢ك – ١١٦٦ز ژیاوە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٣/ ٢٨٣ – ٢٨٤.

٢. اللباب ٢/ ١٢٠.

## ئەحمەد خەتیب هەولێری (١٢٠)

یەکە لە زانایە مەزنەکانی (هەولێر) زانایەکی گەورە و شاعیرێکی بە دەسەڵات بووە دنیای نەویستووە ڕوو لە خوا بووە، تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزووری وەرگرتووە، مەولانا ئیجازەی خەلیفایەتی پێ داوە، ڕەوانەی شامی کردووە لەوێ لە مزگەوتی (موعەللەق) دانیشتووە، خەریکی ئیرشارد و خواپەرستی بووە، ناوبانگی دەرکرد، کە مەولانا تەشریفی چووە (شام) فەرمانی دا شێخ ئەحمەد لە مزگەوتی (عەداس) خەتمی خواجەکانی بکا، کە مەولانا کۆچی دوایی کرد، شێخ ئەحمەد لەگەڵ ماڵ و خێزانی مەولانا، هاتەوە شاری (سلێمانی) لەوێ نیشتەجێ بوو.

(شێخ ئەحمەد) لەگەڵ سیراجەدین شێخ عوسمانی تەوێڵەیی برادەرایەتی بتونی هەبوو، زۆر دەچووە (بیارە) بۆ سەردانی، لە دوا سەفەری بۆ (بیارە) نەخۆش کەوت، لە ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز کۆچی دوایی کرد. لەو کاتە مەلا زوبەیر مەلا صالح لە خزمەت شێخ ئەحمەد دەبێت، جل و بەرگ و شمەکەکانی لە وڵاخەکە بار دەکات و بەرلڵای دەکات بەرەو ماڵ دەڕوا کە منداڵەکان ئەم وەزعە دەبینن سەرسام دەبن لە دوو مەلا

زوبەیر دەنێرن دەلێت: شێخ مردووە، گلەیی لێ دەکەن بۆچ زوو خەبەر دارت نەکردین؟ وەڵام دەداتەوە: {کاکە خەبەری ناخۆش، ناخۆشە، چۆن پێتان بڵێم}.

سەرچاوە: یادی مەردان ١/ ٩٤ – ٩٥.

## ئەحمەد خدر وەرتی (١٢١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا شێخ خدری، کوڕی مەلا حەسەنە، ساڵی ١٩٢٠ز لە گوندی (وەرتە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، تا کۆتایی بە شەرحی عەقائید هێنا، دوایی چووە (کۆیە)، پاشان چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، هەروەها ماوەك چووە (هەرتەل) لای مەلا فتح اللە، پاشان چووە (دار السلام) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٣٧ز ئیجازەی مەلایەتی لە خزمەت وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (وەرتە) مەدرەسەی فەقێیانی دانا، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلائەدینی (بیاەر) وەرگرت، مامۆستا ئەحمەد دەستی دختۆری هەبوو، چەند جۆرە گیای لە چیایەکان دەهێنا دەرمانی لێ دروست دەکرد، چارەی نەخۆشانی لە ڕاهی خوای پێ دەکرد، ساڵی ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەنگی زانا ٤/ ١٩٩٤ز

## ئەحمەد خەسرۆ ڕەبیانی (١٢٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا خەسرۆیە، ساڵی ١٨٦٨ز لە گوندی (پیر یونس) هاتووتە دنیا، دەستی بە خوێندن کرد، کتێبە سەرەتایی یەکانی تەواوکرد، چووە گوندی (تورجان) ماوەی سێ ساڵ لە لای مەلا حەسەنی قزلجی خوێند، دوایی چووە (مەهاباد) چوار ساڵ لە لای مەلا حەسەنی بورهانی خوێند، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: لە چەند شوێنان مەلایەتی کرد، پاشان کرا (مدرس) لە شاری (سەقز)، مامۆستا چەند حاشیەی لەسەر کتێبان نووسیوە، مەولوودنامەی داناوە، ساڵی ١٩٣٦ز لە (سەقز) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گوندی (مەرخوز) بە خاك سپێردرا.

مەلا عەلی کوڕی ئەو زاتە، لە ١٨٩٩ز لە دایکبوو خوێندنی لـە لای بـاوکی و مەلا حاجی بابا شێخ و مەلا عبداللە ی وەلزی بردە سەر پاشان ئیجازەی وەرگرت.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد٧٢٦ – ٧٢٨.

٢. تاریخ فرهنگ وادب مکریان ٣٧٣ – ٣٧٤.

٣. تاریخ مشاهیر کورد ٢/ ٢٢٩ – ٢٣٠.

## ئەحمەد خضر روستی (١٢٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی خضرە، ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (روستە) هاتووتـەدنیا، پاش تەواوکردنی قۆناغی فەقێیەتی چووە گوندی (هەرتەل) لای مەلا فتح اللە، دوایی چووە (بێتواتە) لای مەلا نەبی، ماوەك چووە (خەتە) لای مەلا عبدالفتاح، لەو کاتە مەلا صاڵحی کۆزەپانکە و مەلا ئیبراهیمی خەتێ لەوێ بوون، پاشان چووە (رواندز) لای مـەلا ئەسـعەد ئەفەندی خەیلانی ئەو دەرسـانەی خوێنـد: ئوصـول، کـەلام، فەلـەکیات، حسـاب، ئـەمجا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (روستە).

بەشێك لە فەقێیەکانی ئەمانەن: مەلا عوسمانی رۆستێ و مەلا طاهای شـێخ وەتمـانی و مەلا عەلی شێخ وەتمانی.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ١٩٥٧ز لە روستە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: کەشکۆڵی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئەحمەد خەلیل خۆیی (١٢٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی خەلیلی، کوڕی سەعادەتی، کوڕی جەعفەرە، نازناوی – شەمسەدین ئەبولعەبباسە، خەڵکی (خۆ)یە لە ڕۆژهەڵاتی (وانە)، لە مانگی شەوالی ساڵی ٥٨٣ك – ١١٨٨ز هاتووتەدنیا، سەفەری خوراسانی کردووە، لەوێ ئوصولی لای قوطبی میصری خوێندووە، ماوەك لە لای فەخری ڕازی زانستەکانی ئەقڵی خوێندووە، شەریعەتی لە خزمەت ئیمامی ڕافیعی خوێندووە، مەنتیقی لای عەلائەدینی طوسی خوێندووە، دەرسی فەرموودەی لە چەند زانایان وەرگرتووە، ئەمجا لە (شام) کرا سەرۆکی قازییان، مامۆستا لە زانستەکان دەستی باڵا بووە.

ئەو کتێبانەی داناون: ینابیع العلوم و (شرح الارشاد)ی عەمیدی و عرائس النفائس. لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٤٠ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البدایة والنهایة ١٣/ ١٥٧ – ١٥٨.
٢. شذرات الذهب ٥/ ١٨٣.
٣. معجم المؤلفین ١/ ٢١٦.
٤. کشف الظنون ١/ ٢٥.
٥. ایضاح المکنون ١/ ٥٨٨.

## ئەحمەد داود دینەوەری (١٢٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی داودی، کوڕی وەنەندە، خەڵکی (دینەوەرە) ناسراوە بە (ئەبوحەنیفە)، زانایەکی دەست باڵا بووە لە شەریعەت و نەحو و ڕێزمانی عەرەبی و ئەندازە و مێژوو و ئەستێرەناسی و زانیارییەکانی تایبەت بە ئاسمان، دەرسی لە لای زانایەکانی (بەصرە) و (کوفە) خوێندووە، ڕووی خۆی نەدایتە دنیا، زۆر بە دین و لە خواترس بووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: تفسیر القران الکریم، لحن العامة، الشعر والشعراء، الانواء، الباه، النبات، اصلاح المنطق، الفصاحة، الجبر والمقابلة، البلدان.

مامۆستا ساڵی ٢٣٥ك یەکەم (ڕەصەد)ی لە شارەکەی خۆی دانا بۆ زانیاری پلەی سەرما و گەرما و باران و زانیاری ئاسمان، پاشان دووەم ڕەصەدی لە شاری (ئەصفەهان) دانا، ناوبراو بە گەنجی حەزی لە گەڕان بوو، لە (فەلەستین و حیجاز و وڵاتە عەرەبییەکان گەڕاوە، لە ٢٨١ك – ٨٩٤ کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرين ١/ ٤١.
٢. البداية والنهاية ١١/ ٨١.
٣. كشف الظنون ١/ ١٠٨.
٤. معجم المؤلفين ١/ ٢١٨ – ٢١٩.
٥. ايضاح المكنون ١/ ٤٣.
٦. معجم أعلام الكورد ٥١ – ٥٢.
٧. تاج التراجم ١١٢ – ١١٣.
٨. مشاهير الكورد ٩١ – ٩٢.
٩. هدية العارفين ١/ ٥٢.

## ئەحمەد داود گەلالی (١٢٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی داودە، چوویتە (دیمشق) لەوێ نیشتەجێ بووە، زانایەکی مەزنی مەزهەبی شافیعی بووە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی هەیە بە ناوی (صفوة التفاسير). ساڵی ١٢٦٩ك – ١٨٥٢ز لە دیمشق کۆچی دوایی کردووە، کوڕەکی مەلای هەبووە، ناو (بەکر) لە مزگەوتی (وەرد) لە دیمشق دەرسی داوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ٢١٨.
٢. نثر الجواهر والدرر ٢/ ١٣١٤.

## ئەحمەد رەسول دێلژەیی ( ۱۲۷ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی رەسولی، کوڕی شـەریفی دێلـژەیی قـەرەداغی یـە، سـاڵی ۱۳۱۵ك – ۱۸۹۷ز لە (سلێمانی) هاتووتە دنیا.

پاش بڕینی قۆناغی سوختەیی، چووە لای مامۆستا شێخ باباعەلی، ماوە لـە خزمەتی تا تەواوی کرد، پاشان لـە مزگەوتی (بن طەبەق) لـە سلێمانی کرا پێش نوێژ و دەرس بێـژ، ساڵی ۱۳٤٥ك – ۱۹۲٦ز کرا (واعیز) لە (مێرگەسۆر) دوایی کرا پێش نوێـژ و دەرس بێژ لـە (خانەقین)، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، تا لـە بـەرواری ۱۳۹۰ك – ۱۹۷۰ز کۆچی دوایی کرد لە (خانەقین) بە خاك سپێردرا.

مامۆستا جگە لـە مەلایەتی شاعیریش بووە، لـە مەتحی شێخ مەحمودی حەفید دەڵێ:

ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر شێری یەزدانە مەلیك
زومرەیی ساداتە نەجم و ماهی تابانە مەلیك
سەفحەیی تاریخی قەومی کورد دەبێ ڕەنگین بێ
چونکە ئەمڕۆ وەك سەلاحەددین حوکمڕانە مەلیك
تاجی کەیخوسرەو چ بوو، یا ئەفسەری قەیسەر چییە؟
تاجی فەخری عیززەتە ئەمڕۆ لـە کەیوانە مەلیك

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٣.
٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/ ٤٩.

## ئەحمەد رەسول گڕاوی ( ۱۲۸ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی رەسولی کـوڕی مـەلا عومـەرە، لـە ۱۱۹۳ك – ۱۷۷۹ز هاتووتەدنیا، خەڵکی گوندی (گڕاو)ە، دەکەوێتەڕۆژهەڵاتی چیای پیرمەم کانیەکی دەرمـان ئاوەی لـێ یە، گوندەکە بۆیە ناونراوە (گڕاو).

ناوبراو خەریکی ئامۆژگاری خەڵکانی هەولێر بوو، لە مزگەوتی مەلا ئەحمەد لە قەڵات ئێستا لە شوێنی ئەو مزگەوتە تانکی ئاوی دابەشکردن دامەزراوە. مامۆستا نامیلکەی (البیان)ی داناوە، (ضیاء الدین حەیدەر) شەرحی کردووە، مەلا ئەحمەد گراوی دەرسی لە لای باوکی و لە لای (صبغة الله ئیبراهیم حەیدەری) خوێندووە، وە ئیبراهیم فەصیح حەیدەری یەکە لە فەقێیانی ئەو، لە ١٢٨١ك – ١٨٦٤ز کۆچی دوایی کرد، چەند فەتوای شەرعی لە پاش بە جێما.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٠ – ١٤١.

٢. الاكليل في محاسن أربيل ٢٨٠ – ٢٨١.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٦.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٢٥٤

### ئەحمەد پاش بەردەیی (مەلا ئەحمەدی رەش) (١٢٩)

لە دەوری ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (پاش بەردە)ی ناوچەی (پێنجوێن) هاتۆتە دنیا.

خوێندنی: لە گوندی خۆیان دەستی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز کرد، دوایی چووە (پێنجوێن) دوایی چووە (مەریوان) دوایی چووە (کانی سانان) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە (چۆڕێ) لای مەلا سەید محەممەد، دوایی چووە (بالك) لای مەلا مەحمودی جەوانرۆ، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، دوایی چووە (پەسوێ) لای مەلا عبدالله.

مەلایەتی: ساڵی ١٩٢٠ز بووە مەلا و (مدرس) لە (بیارە)، لەو کاتە مامۆستا عبدالکریم (مدرس) لە لای ئەوی دەخوێند، دوایی چووە (سلێمانی) لە لای شێخ عومەری قەرەداغی دابەزی، لەوێ چووە (گەلاڵە) لای محەممەد عەبباس ئاغا ماوەك دەرسی داوە.

خوێندنی دووبارە: پاش چەند ساڵان مەلا بوو، دەرسی دەدا، زەوقی خوێندنی هاتەوە دڵی مەلایەتی بەجێ هێشت، هاتە (هەولێر) مێوانی شێخ مصطفای نەقشبەندی بوو، بەهۆی جەنابی شێخ مەلا ئەحمەد لە لای مەلا ئەفەندی هەولێر دامەزرا بە فەقێ، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی پیدا.

مەلایەتی دووبارە: ئەمجا لە (مەخمور) بووە مەلا، ماوەی هەشت ساڵان لەوێ ماوە، پاشان چووە (دێمەکار) لای شێخ محەممەد، لەوێش پێنج ساڵ ماوە، دوایی چووە (چغمیرە) لای کانەبی حەوێز ئاغا پازدە ساڵ ماوە، چووە (مورتکە)ی گەورە لای عەلی مەحمود کاکەخان، کەم ماوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مامۆستا عبدالکریم (مدرس)، مامۆستا ئەبوبەکری کۆیی، مەلا محەممەدئەمینی سوێری، مەلا عومەری تەرجانی، مەلا ئەبوبەکری شەرکان، مەلا عومەر حاجی مەحمود، مەلا عومەر حاجی وسوو، مەلا خورشید، مەلا سەلیم، مەلا سولەیمان، مەلا عبدالله، مەلا محەممەد فەرهادی، مەلا ڕەشیدی موکریان.

کۆچی دوایی: لە ١٩٥٧ز کۆچی دوایی کرد.

چوار کوڕی هەبوون:

١. مەلا محەممەد ئەمین پیش نوێژ بوو لە مزگەوتی ناونەجاڕان لە ناو بازاڕی هەولێر بەرانبەر دەرگەی قیبلەی قەڵات.

٢. عبدالعزیز: ڕۆشنبیر و نووسەر و ڕۆمان نووسە، دانراوی هەیە، لە نوسراوەکانی بە: (عەزیزی مەلای ڕەش) خۆی ناو دەبات.

وە قاسم و ئەبوبەکر یشی هەبوون.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٦ – ٨٧.

٢. یادی مەردان ٢/ ٣٦٧.

٣. علماء ومدارس في أربيل ١٢٠.

## ئەحمەد زەکەریا ماردینی (١٣٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی زەکەریای، کوڕی ئەبو عەشایرە، ساڵی ٦٢٩ك – ١٢٣١ز هاتووتەدنیا، دەرسی فەرموودەی خوێندووە، تا گەیشتووتە پلەی دەرس گوتنەوە، لە (دیمشق) دانیشتووە، پاشان چوویتە (قاهیرە) لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧١٤ك – ١٣١٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ١/ ٨١.

## ئەحمەد سەلامە ئەحمەد (١٣١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سەلامەی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی سولەیمانی دارتاشە، خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی فەرموودەناسی بڕوا پێکراوبووە، دەرسی فەرموودەی داوە، ناسراوە بە زاتەکی بە دین و لە خواترس و دڵپاك و ڕەوشت چاك، لە ٦٤٦ك – ١٢٤٨ز لە (حەڕان) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/ ٢٣٣.

٢. الذيل على طبقات الحنابله ٤/ ٢٤٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٥٢.

## ئەحمەد سولەیمان روهاوی (١٣٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سولەیمانی، کوڕی ئەبو شەیبەیە، ناسراوە بە (ئەبوحوسێن) خەڵکی (ڕوهایە) فەرموودەی لە چەند زانایان گێڕایتەوە، زانای فەرموودەناس ئەبوعروبەی حەڕانی فەرموودەی لەو زاتە گێڕایتەوە، دەڵێ: نەمدیووە وەك ئەو مامۆستایە قسە دروست و ڕێك و تەواو، لە (١٩)ی مانگی ذي الحجە ساڵی ٢٦١ك – ٨٧٥ز لە باخچەکی نزیك شاری (روها) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٢/ ١٤١.

٢. البدایه والنهایه ١١/ ٣٩

٣. الانساب ٣/ ١٢٠.

### ئەحمەد سەلیم ئەحمەد مەردۆخی (١٣٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەمەد سەلیمی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عبدالکریمی، کوڕی عبدالغفاری، کوڕی محەممەد کەریمی، کوڕی مەحمودی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی شێخ مصطەفای تەختی یە، لە سەیدەکانی مەردۆخی یە، ساڵی ١٣٢٠ك - ١٩٠٢ز لە (سنە) هاتووتە دنیا، لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواوکرد، دەستی کرد بە دەرس دانەوە و خزمەتی ئایین، لە ١٣٩٠ك - ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ٢/ ٤٢١.

### مەلا ئەحمەدی شەریعەتی (١٣٤)

ساڵی ١٩١٢ز هاتووتە دنیا، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیێ دا بە گەورەیی دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی لە گوندانی (یاساوێ) و (بیشاسپ) و (ئاغەلآن) و (نەلآس) و (بێژوە) و (ئالان) بردەسەر، پاشان چووە (بێوران) لای مەلا عبداللە ی گەناوی، پاشان هاتە گەناوی عێراق لای مەلا صاڵحی بێژوەی ماوە تا کۆتایی بە خوێندن هێنا و ئیجازەی وەرگرت. گەڕاوە (ئێران) ماوەك لە (بێوران) و (دیوالان) و (بێشاسپ) دەرسی دا، پاشان ڕژێمی ئێران ماوەی ساڵەك لە بەندیخانەی (فلك الافلاك)ی گرت، دوای بەردانی دووریان خستەوە بۆ (چاەبەهار) و کاشمەر و ورمێ، پاشان ئازاد کرا گەڕاوە (بێورێ) بووە مەلا و (مدرس) دوایی چووە شاری (سەردەشت) لە مزگەوتی (دار السلام) خەریکی جێبەجێ کردنی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو تا کۆچی دوایی.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٧٦ - ٢٧٧.

### ئەحمەد صەلاحەدین یوسف ئەییوبی (١٣٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی سوڵتان صەلاحەدین یوسف کوڕی ئەیوبە، لە ٥٧٧ك - ١١٨١ز لە (میصر) هاتووتەدنیا، لە میصر و دیمشق و مەککەی پیرۆزی خوێندووە،

چاكەی لەگەڵ قوتابیان زۆر دەكرد، ناسرابوو بە زاتەكی لە خواترس و بە دین و ملكەچ، بەڵام تۆزەك خۆی وەلای شیعەكان دەلەنگاند و خۆشی دەویست، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٣٤ك – ١٢٣٦ز لە تەمەنی (٥٧) ساڵی دا كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوەكان:

١. سیر أعلام النبلاء ١٣ / ٢٢٠.

٢. شذرات الذهب ٥/ ١٦٢.

٣. مشاهير الكورد ١٠٨.

٤. معجم أعلام الكورد ٧٠.

## ئەحمەد عاصم عەینتابی (١٣٦)

ناوی ئەحمەد عاصمە، نازناوی ئەبوكەماڵە، كوڕی جەنانە، ناسراوە بە جەنانی زادە، خەڵكی (غازی عەینتابە) لە ١١٦٩ك – ١٧٥٥ز هاتووتەدنیا، لە ١٢٣٥ك – ١٨١٩ز كۆچی دوایی كردووە، دانراوی خۆی زۆرن، لەوانە: (الاوقیانوس البسیط، في شرح قاموس المحیط).

سەرچاوەكان:

١. هدیة العارفین ١/ ١٨٤.

٢. ایضاح المكنون ١/ ١٥١.

## ئەحمەد عبدالرحمان خەلوەتی (١٣٧)

ناوی ئەحمەدە، ناسراوە بە شەهابەدین، كوڕی نورەدین عبدالرحمانی، كوڕی محەممەدی كوردی قەیسەری وەرشانی شافیعی خەلوەتی یە، دەوروبەری ساڵی ٩٤٧ك – ١٥٤٠ز كۆچی دوایی كردووە، كتێبی (الوصیة السنیة للذات الحسینیة)ی داناوە.

سەرچاوەكان:

١. هدیة العارفین ٥/ ١٤٢.

٢. ایضاح المكنون ٤/ ٧١١.

٣. معجم المؤلفين ١/ ٢٦٧.
٤. معجم أعلام الكورد ٥٨.

### ئەحمەد عبدالرحمان شارەزوری (١٣٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی شارەزورە، لە (قاهیرە) دابەزیوە، دەرسی فەرموودەی لە خزمەت ئیبن صەلاحی شارەزوری خوێندووە تاکو بوویتە مامۆستا و دەرسی داوە، لە ٧٠١ك – ١٣٠١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/ ٩٨ – ٩٩.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩.

### ئەحمەد عبدالرحمان نۆدشەیی (١٣٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا عبدالرحمانی، کوڕی مەلا ئەحمەدە[1]، خەڵکی گوندی (نۆدشەیە)، لە هەورامان بیست پشت زیاتر باوك و باپیرانی لەو شوێنە بوونە، کەسایەتی زانا و ئایین پەروەریان لێ هەڵکەوتووە. ئەو زاتە ساڵی ١٢٢٨ك – ١٨١٣ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، لە چەند قوتابخانانی کوردستان گەڕا تا قۆناغەکانی بڕی، ئەمجا ڕووی کردە (ڕواندز) لای مەلا محەممەدی خەتێ (مەلای پاشای گەورەی ڕواندز)، ماوە لە خزمەتی تا کۆتایی بە خوێندن هێنا و ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ساڵی ١٢٦٤ك – ١٨٤٨ز باوکی کۆچی دوایی کرد، بە یارمەتی محەممەد مونیب مامۆستا لە شوێنی باوکی لە مزگەوتی ملکەندی (سلێمانی) کرا (مدرس) و موفتی، لەو شوێنە پیرۆزە دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و دەرس دانەوەی فەقێیان، پاشان سەردانی موفتی زەهاوی کرد لە (بەغدا)، گەڕاوە (سلێمانی) لە

---

[1] لە ١١٩٤ك – ١٧٨٠ز هاتووتەدنیا، لە ١٢٦٢ك – ١٨٤٦ز کۆچی دوایی کردووە.

١٢٦٨ك – ١٨٥١ز باری کرد بۆ گوندەکەی خۆی (نۆدشە)، ماوەك لەوێ دەرسی دا، دوایی لەگەڵ کوێخایەکەی نۆدشە نێوانیان ئاڵۆز بوو باری کرد بۆ (سنە) لەوێ پێشوازییەکی چاکیان لێ کرد، ڕێز و حورمەتیان گرت، گوندی (عیسائاوا)یان پێ بەخشی بەروبوومەکەی خەرج بکرێت بۆ خۆی و بۆ فەقێیەکان.

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز و لێهاتوو بووە، لە زانستە ئاینیەکان شارەزابووە، حاشیەی لەسەر باسی (نکاح) و (طلاق) و (خلع)ی تحفە هەیە.

دەگێڕنەوە ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز لە (تەوێلە) لەگەڵ مەلا عەلی قزلجی کۆبوونەوە و گفتوگۆیان لە مەسەلەی وشەی (تەلاقم) کرد، نۆدشەیی لای وابوو صەریحە و نیەتی ناوێت، قزلجی لای وابوو کینایەتە، لە ئەنجامدا قزلجی هاتە سەر ڕایەکەی نۆدشەیی، بڕیاری پەشێمان بوونەوەی لە ڕایەکەی خۆی دا، بەیانی بە ڕێکەوت بەرەو ماڵەوە، لەسەر ڕێی خۆی بە (مەریوان)دا چوو، لەوێ مێوانی مەلا سەید حەسەنی چۆڕی بوو، ئەویش ئیجازەی هەر لە جەنابی قزلجی وەرگرتبوو، مامۆستا قزلجی پێی گوت: {سەید لە مەودوا تووش فەتوا بە ڕایەکەی نودشەیی بدە}، سەید گوتی: مامۆستا گیان ئێمە چەند ساڵە بە قسەی جەنابت ئیش دەکەین جەنابت بە یەك سەعات چۆن هاتیە سەر ڕای ئەو، مامۆستا فەرمووی: {کاکە پیاو دەبێ ئینساف هەبێت، ئەو مەلا ئەحمەدە کە دەستی کرد بە ماناکردنی تحفەی ئیبن حەجەر، ئەگەر ئیبن حەجەر خۆی مانای کردبا، لەوی پتر نەدەزانی، بۆیە منیش ڕایەکەی ئەوم پەسند کرد}.

لە سەید عبدالرحیمی مەولەوییان پرسی، پلەی مەلایەتی نۆدشەیی چەندە؟ فەرمووی بە من دیار ناکرێت، تاقانەی سەردەمی خۆی بوو، هەروەها دەڵێ: {جارەك لە (سنە) شیعەکان ئاخوندەکی بەناوبانگیان هەنارد، بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مەلایەکانی (سوننە)، کۆڕێکی گەورە بەسترا بۆ ئەو مەبەستە چەندان مەلایانی ناوچەکە ئامادە بوون، منیش لەوێ بووم، مامۆستا و ئاخوند کەوتنە قسە، تا ماوەك دانیشتوان تێ دەکەیشتن کە چی دەڵێن، دوایی کێشەکە درێژەی پێدا و بەرزبۆوە جگە لەو دووانە کەس نەیدەزانی چی

نعلێن، ماوەك پێ چوو، تەنیا مامۆستا ماوە، ئاخوندیش نەیدەزانی مامۆستا چ دەڵێ، تەنیا سەری خۆی دەلەقاندەوە و دەیگوت: بەڵێ بەڵێ، بە تەواوی پەکی کەوت، لە کێشەکە وە بن کەت.

جارەك جێ یەکی توحفەیان نیشانی مامۆستا دا بۆ تاقیکردنەوە، نووسخەکە نووقسانی هەبوو، پاش لێ وردبوونەوە، چەند وشەی لەسەر نووسی گوتی: ئەگەر نموەندەی لەگەڵ دابێت مانای دێت، دوایی نوسخەکی ڕاستیان هێنا، ئەوەی مامۆستا دایناپوو هەمووی لە توحفەکە هەبوو، تەنیا یەك پیتی (و) نەبێت، بەو ڕووداوە ناوبانگی مامۆستا زیاتر ڕۆیشت دەنگوباسی مەلایەتی پتر دەنگی داوە، بە تایبەت لە کوردستان و دەورووبەری شاخەکانی (هەورامان).

مامۆستا چەند فەتوای بە نرخی هەیە، مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) بەشێکی لە بەرگی سێیەمی (جواهر الفتاوی) بەلاوکردیتەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی و مەلا عبدالقادری کانی کەوەی (کە ناسراوە بە مەلای گەورەی بیارە) و شێخ ئەبوبەکری (هەرشەمی) هەولێر.

مامۆستا هەروەکو لە زانستی سەرەوە ئاشنا بوو، هەروەها لە زانستی دەروونی دەستی باڵا بوو، تەریقەتی لە شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگرتبوو، پاش کۆچی دوایی شێخ هاتوچۆی شێخ محەممەد بەهائەدینی کوڕی دەکرد، ساڵی ١٢٩٠ك -١٨٧٣ز لەگەڵ شێخ بەهائەدین چووە (بەغدا) لەوێ مێوانی موفتی زەهاوی بوو، شەوێ تا بەیانی گفتوگۆیان لەسەر یەك حاشیەی عبدالحکیم لەسەر شەرحی شەمسیە کرد، هەر لەو سەفەرە لەگەڵ شێخ چوونە (میصر).

مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، شیعری کوردی و فارسی هەیە، نازناوی شیعری (فانی)یە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو:

١. عارف: لە بیارە لە دایك بوو لە لای باوکی خوێند و ئیجازەی وەرگرت دوای ئەو مەلا محەممەدی کوڕی جێگری بوو، ئەویش لە ١٣٤٥ك - ١٩٢٦ز کۆچی دوایی کرد.

٢. زین العابدین: خوێندنی تەواوکرد ئیجازەی لە مەلا قادری بیارە وەرگرت، دوای خۆی مەلا بەهائەدینی کوڕی بووە جێگری، دوایی چووە (سنە) جێگەی مەلا محەممەدی ئامۆزای، کوڕێکی تری هەبوو، ناو ئەسعەد، لە مزگەوتی مەولانا لە (سنە) پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو، لە ١٣٦٣ك - ١٩٤٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. یادی مەردان ٣٥٢ - ٣٦١.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ١٣٧ - ١٣٨.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧٧ - ٨٠.

٤. تاريخ مشاهير كورد ١/ ٣٨٦ /٢/ ١٨٥ - ١٨٦ - ٢٨٦.


## ئەحمەد عبدالرحمان هەکاری (١٤٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی ئیبر اهیمە، (هەکاری)یە، خەریکی خوێندنی فەرموودە بووە، لەو بابەتە پیرۆزە دەرسی داوە، لە مانگی مەولودی ساڵی ٧٣٦ك - ١٣٣٥ز لە تەمەنی نۆهەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. شذرات الذهب ٦/ ١١٢.

٢. الدرر الكامنة ١/ ٩٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٥٦.


## ئەحمەد عبدالرحيم ئەبو زەرعە (١٤١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالرحیمی شافیعی یە، ناسراوە بە: (وەلیەدین ئەبو زەرعە)، ساڵی ٧٦٢ك - ١٣٦٠ز لە (قاهیرە) هاتووتەدنیا. لە خزمەت باوکی چووە

(دیمشق) لەویّ فێرە زانیاری بوو، لە ٨٢٤ك کرا قازی (میصر) پاشان کرا سەرۆکی قازییان، مامۆستا زاتەکی دلپاك و ئەهلی تەسەووف بووە، چەند کەرامەتی لیّ دەگێڕنەوە.

دانراوەکانی: چەند کتێبی بە نرخی داناون، لەوانە: شرح سنن ابي داود، شرح البهجة، مختصر المهذب، التنبيه، شرح جمع الجوامع، النكت على الحاوي، حاشيه على الكشاف و فتاوی نسخەی لە لای ئێمە هەیە.

لە ٨٢٦ك – ١٤٢٣ز کۆچی دوایی کرد، عبدالوەهابی کوڕی زانایەکی بەرز بووە لە مەودوا باسی دەکەین.

سەرچاوەکان:


١. طبقات المفسرين ١/٤٩.

٢. طبقات الشافعية ٩٢.

٣. البدر الطالع ١/٧٢.

٤. هدية العارفين ٥/١٢٣.

٥. كشف الظنون ١/ ٥٩٥.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١.

٧. شذرات الذهب ٧/١٧٣.

٨. غاية المرام ٢٥٦.

٩. الضوء اللامع ١/٢٨٠ – ٢٨٧.

١٠. الأعلام ١/١٤٤ /٥/١٤.

١١. درة الحجال في أسماء الرجال ١/٢١.

١٢. معجم المؤلفين ١/٢٧٠ – ٢٧١.

١٣. ايضاح المكنون ١/٤٦.

١٤. جامع كرامات الاولياء. ٢/٥١٧

١٥. معجم أعلام الكورد ٥٦ – ٥٧.

## ئەحمەد عبدالسید هەولێری (١٤٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالسیدی، کوڕی شەعبانی، کوڕی محەممەدی، کوڕی جابیری، کوڕی قەحطانە، نازناوی صەلاحەدینە، یەکە لە ماڵە خانەدانەکانی هەولێر، لە ٥٧٢ك – ١١٧٦ز لە هەولێر هاتووتەدنیا، زانایەکی زەین تیژ بووە، کتێبی (خلاصة)ی ئیمامی غەزالی هەموو لەبەر بووە، دیوانی شیعر و دوو بێت و چەند شیعری نازکی هەیە، یەکەم جار ئیش و کاری سوڵتان (مظفر)ی دەکرد، پاشان سوڵتان دڵی لێ ئێشا ماوەك لە بەندیخانەینا، ساڵی ٦٠٣ك بەردرا، چووە (شام) لەوێ مەلیك (مغیث) ڕێزی لێنا، بەمە وەزعی باش بوو.

دوای کۆچی دوایی مەلیك چووە (میصر) لەوێ یەکەم جار مەلیك پلە و پایەی پێ دا، پاشان ئەویش دڵی لێ ئێشا و ڕەواجی جارانی نەما، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦١٨ك لە قەڵاتی (قاهیرە) لە بەندیخانەینا، لە ٦٢٣ك بەردرا، لە ٢٥ی مانگی ذی الحجەی ساڵی ٦٣١ك – ١٢٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفیات الأعیان ١/ ١٦٦ – ١٦٨.
٢. الأعلام ١/ ١٤٦ – ٢٧٥.
٣. کشف الظنون ١/ ٧٩٧
٤. معجم المؤلفین ١/ ٢٧٤.
٥. معجم أعلام الکورد ٥٨.

## ئەحمەد عبدالله ئەبو شوعەیب (١٤٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالله ی، کوڕی ئەبو شوعەییی، کوڕی موسلیمە، خەڵکی (حەڕان)ە، دەرسی لە لای زوهەیری کوڕی مەعاویە و موسای کوڕی ئەبو فوڕات و موسای ئەعیەن و چەندان زانایانی تر خوێندووە، مامۆستا لە گێڕانەوەی فەرموودە بڕوا پێکراو و ڕاستگۆ بووە، لە پێش ساڵی ٥٦٢ك – ١١٦٦ز ژیاوە.

سەرچاوە: الانساب ٢/ ٢٣٣.

## ئەحمەد عبداللە توتمەیی (١٤٤)

ناوی ئەحمەدە کوڕی عبداللە ی کوڕی محەممەدە، ساڵی ١٩٠٧ز لە گوندی (توتمە) هاتووەتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و کتێبەکانی قۆناغی سوختەیی بڕی، چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، دوایی چووە (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، ئەمجا چووە (هەولێر) مزگەوتی حاجی عبدالقادر دەباغ لای مەلای عبداللە ی بێتواتەیی، پاشان چووە (هەرتەل) لای مەلا فەتح اللە، لەوێ ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە گوندی (بالوکاوە)، پاشان گەڕاوە گوندەکەی خۆی (توتمە)، خەریکی دەرس دانەوە بوو تا ساڵی ١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبداللە ی کوڕی ئێستا ماوە، لە هەولێر دادەنیشێ.

سەرچاوە: کەشکۆڵی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئەحمەد عبداللە حەیدەری (١٤٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبداللە ی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەیدەری، کوڕی محەممەدە، یەکە لە زانایە مەزنەکانی حەیدەری (ماوەرانێ) ساڵی ١١٨٧ك – ١٧٧٣ز لە گوندی (ماوەران) چارەپەردی شەرحی شافییەی نووسیتەوە، دەڵێ: {خوایە دەردی تاعوون ئەم ساڵە بەلاو بوویتەوە، بەغدا و بەصرە و کەرکوك و قەلعەچوالان و کۆیە و هەولێری داگرتووە، سوپاس بۆ خودا تا ئێستا بۆ لای ئێمە نەهاتووە، خوایە بمژێنی تا ئەم کتێبە تەواو دەکەم}.

خوا دوعایەکەی قەبووڵ کرد، پاشان چووە (موصل) لەوێ ساڵی ١١٩٤ك – ١٧٨٠ز (الكواكب الدرية)ی نووسییەوە، هەروەها لە ١٢١٧ك – ١٨٠٢ز حاشیەی (لاری) نووسییەوە.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، نازناوی شیعری (غافیل) بووە، لە چەند دێرە شیعری فارسی، شانازی بە وڵاتە شیرینەکەی کوردستان و خاکی (ماوەران) دەکا، سوپاسی خوای گەورە دەکا، کە لەو خاکە نیشتەجێ بووە و پەروەردە بووە، وەئەو خاکە هێندە پیرۆزە قەت نایگۆڕێتەوە بە تەختی پاشایەتی، دەقەکەی ئەوەیە:

به صورەت گەرچ بینی جیسم و جانم (بحمدالله) کی خاکی ماوەرانم
به صورەت گەرچ زین شودتەنی ما وەلێکین ماوەران شود مەسکەنی ما
ئەگەر نشستە ئەم بەر تەختی شاهی بە خاکی ماوەرانم من موباهی

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٦١ – ٦٢ /٦/ ٢٨٩.
٢. بنەماڵانی بە ناوبانگی ڕواندز ٤٤ – ٤٥.

## ئەحمەد عبدالله خاپوری (١٤٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالله ی، کوڕی زوبەیرە، خەڵکی دەوروبەری (خاپورە) لە ٦٠٠ك – ١٢٠٣ز هاتوتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (حەڕان) دەرسی لە لای فەخرەدین کوڕی تەیمیە خوێندووە، دوایی بۆ خوێندن چوویتە (حەلەب) و (دیمشق) و (بەغدا)، زانستەکانی تایبەت بە قورئانی پیرۆزی لە خزمەت مامۆستا (سەخاوی) تەواوکردووە، پاشان لە (حەلەب) کرایتە ووتارخوێن، مامۆستا نۆهەت ساڵ ژیا خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، لە ٦٩٠ك – ١٢٩١ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد. کتێبی (الدر النضيد في التجويد)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٤١١.
٢. معجم المؤلفين ١/٢٨٩.
٣. هدية العارفين ١/ ١٠٠.

## ئەحمەد عبدالله دیاربەکری (١٤٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالله یە، لە زانایە بەرزەکانی (دیاربەکرە) لە ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز هاتووتەدنیا، لە ١٢٧٢ك – ١٨٥٥ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (السنوحات)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١/ ٢٩٧.

٢. هدية العارفين ٥/ ١٨٧.

## ئەحمەد عبدالله سیواسی (١٤٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی شاری (سیواسە) ناسراوە بە بورهانەدین، مەزهەبی حەنەفی بووە، (قازی) سیواس بووە، لەوێ چوویتە (حەلەب) دوایی چوویتە (قاهیرە) پاشان کرایتە حاکمی سیواس. ناوبراو کتێبی (الترجیح) لەسەر تەنقیحی تەفتازانی داناوە، هەروەها شیعری هەیە، زاتەکی ڕەشید و چالاك و سوارچاك بووە ساڵی ٨٠٠ك – ١٣٩٧ز بە دەستی (تەتەر)ە، تاوانبارەکان شەهیدکرا.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/ ٤.

٢. كشف الظنون ١/ ٤٩٧.

٣. هدية العارفين ١/ ١١٧.

٤. معجم المؤلفين ١/ ٢٩٤.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٤.

## ئەحمەد عبدالله شازەلی (١٤٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالله ی، کوڕی صادقی، کوڕی (نعمةالله)ی، کوڕی زەکەریای کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی سولەیمانی، کوڕی خالیدی، کوڕی حەسەنی، کوڕی عەلی شێخ ئەبو حەسەنی شازەلی یە، زانایەکی مەزنی زانستی زاهیر و تەسەووف

دەرون بووە، لە گوندی (کاکۆ زەکەریا) سەر بە (سنە) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد وازی نەینا تا تەواوی کرد، دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسدانەوەی قوتابیان، پاشان لە ڕێگای بەحرەوە چووە سەفەری (حەج)، دوایی چووە (ئێران) لە شاری (جام) نیشتەجێ بوو، پێنج ساڵ لەوێ (شێخ الاسلام) بوو، دووبارە چۆوە (حەج) عبدالرحمانی کوڕی لە خزمەت بوو، چۆوە زیارەتی (مەدینە)ی پیرۆز، لەوێ کۆچی دوایی کرد، عبدالرحمانی کوڕی گەڕایەوە کوردستان، لە (کاکۆ زەکەریا) ماوە، تا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ١٠٤-,١٠٥

٢.علماؤنا فی خدمة العلم والدین ٥٤-٥٥.

## ئەحمەد عبدالله ناوبەرگەیی (١٥٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبداللەی، کوڕی مەلا محەممەدی ئەمینی، کوڕی مەلا دەروێشی کوڕی مەلا مەحمودە، دەورووبەری ساڵی ١٢٠٤ك-١٨٨٦ز لە گوندی (ناوبەرگە) هاتووتە دنیا.

خوێندنی: یەکەم جار لەلای مەلا عبداللەی فەقێی باوکی دەستی بەخوێندن کرد، دوایی لە پلەی (موستەعیدی) چووە (شێخ وەتمان) لای مەلا عەلی مەنتیق و ئادابی خوێندن، پاشان چووە (سەران) لای مەلا عبدالله، ئەمجارە چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، ساڵی ١٣٢٧ك-١٩٠٩ز لە مزگەوتی ئەحمەد ئاغا لە (کەرکوك) حاشیەی شێخ عبدالقادری سنەیی لەسەر جەلالی دەوانی نووسییەوە، پاشان چووە (رواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی خوێندنەکەی تەواو کرد، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: دانیشت بە مەلایەتی مەدرەسەی دانا لەو شوێنانە: (مەران)، (دەرگەلە)، (ناوبەرگە).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالقادری کوڕی و مەلا عبداللە ی موکریانی و مەلا عبداللەی پشدەری و مەلا محەمەد مەلا عبدالقادر و مەلا کاك ئەحمەد سەردەری و مەلا عەلی مەلا محەمەد شێخ وەتمانی. مامۆستا چەند حاشیەی کورتی لەسەر جمع الجوامع و تهذیب هەیە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧١ز لەگوندی (ناوبەرگە) کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالقادری کوڕی پێش نوێژە لە مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید، لە گەڕەکی تەیراوە لە هەولێر، چەند کتێبی داناوە، بەڵام لە چاپ نەدراون.

سەرچاوە: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٠٧-١١٠.

## ئەحمەد عبداللە هەولێری (١٥١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبداللەی، کوڕی حوسێنی، کوڕی عەلی (هەولێری)یە ناسراوە بە (المجد الميت) لە ٦٩٤ك - ١٢٩٤ز هاتووتەدنیا.

بۆ خوێندنی فەرموودە چوویتە (دیمشق) لەوێ ئیجازەی لە ئیبن عەساکیر وەرگرتووە، دەستی کردووە بە دەرس دانەوە و بەلاوکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)، دەگێڕنەوە: جارەك مامۆستا شایێدی دا لەسەری ڕەمەزان کە مانگی دیتووە لەسەر ئەو قسە بڕیاری ڕەمەزان درا، سی ڕۆژ تەواو بە ڕۆژی بوون هێوارەی جێژنە هەرچەندی تەماشایان کرد مانگییان نەدیت، وەك بلێی گومانیان لە دیتنەکەی سەری مانگ لێ پەیدابوو، لەوبارەیە زانای ناسراو بە (ئیبن نەباتە) بە عەرەبی دەڵێ:

زادنا شاهد على الصوم يوما     فابى الله ذاك والإسلام

جرحوه فلم يفد ذاك فيه     {ماجرح بميت إيلام}

کۆچی دوایی: لە ٧٧٠ك - ١٣٦٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٩ - ٥٠.

٢. الإكليل بمحاسن أربيل ١٨٠.

## ئەحمەد عبدالاحد حەڕانی (١٥٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالأحدی، کوڕی ئەبو فەتحە، خەڵکی (حەڕانە)، بۆ خوێندن چوویتە (میصر) لە لای دمیاطی و چەند زانای تری خوێندووە، دەرسی بە (حافیزی عێراقی) داوە لە ٧٦٧ ك – ١٣٦٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ١/٨٨.

## ئەحمەد عبدالحلیم (بن تەیمییە) (١٥٣)

ناوی تەواوی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالحلیمی، کوڕی عبدالسلامی، کوڕی عبداللهی، کوڕی خضری، کوڕی محەممەدی، کوڕی تەیمییەیە، ناسراوە بە (تەقیەدین) ساڵی ٦٦١ك – ١٢٦٢ز لە شاری (حەڕان) جزیرەی بۆتان هاتوویتە دنیا، لە تەمەنی شەش ساڵی دا بوو، لەشکری تەتەرەکان هێرشیان هێنا سەر وڵاتەکە، خەلکەکە ئاوارەبوون، ئەویش لەگەڵ باوکی لە (جزیرە) هەرقەران بۆ (دیمشق) لەوێ باوکی لەبەر خوێندنی دانا، لەبەر زیرەکی و زەین تیژ ی هەر زوو بە زوو کۆتایی بە خوێندن هێنا، دەڵێن هەر کتێبەکی بخوێندباوە یەکسەر دەهاتە بەری و دەرسی لێ دەداوە.

خوڕەوشتی: زاتەکی ڕەشید و نەترس بووە، سەخی بووە، بە هەژاری ڕابواردووە، دنیاداری نەکردووە، شەرمی لە کەس نەکردووە، شاعیر و زمان ڕەوان بووە.

چەند نموونەی زمان ڕەوانی:

١. جارەك چووە لای قطلوو بەگی گەورە بۆ ئیشی پیاوێك، ئەویش بە گاڵتە پێی گوت: {بۆ چ ئەو زەحمەتەت کێشا، لەبەر مەلایەتیت دەبایە من هاتبامە لات}؟ ئەویش یەکسەر وەڵامی داوە: قەیدی ناکا، موسا پێغەمبەر (د.خ) گەلێ لەمن پایە بەرزتر بوو، هەموو ڕۆژ دەچووە پێش دەرگای (فیرعەن) گەلێ لە تو خراپتر بوو، عەرزی ئیمانی بۆ دەکرد، کەچی وەریشی نەدەگرت.

٢. ئەبوحەیانی برادەری خاوەنی تەفسیری (البحر المحیط) جارەك لە بابەتێکی زانستی نەحو کێشەیان لێ پەیدا بوو، ئەبوحەییان کیتابی سیبەوەیهی کردە بەلگەی قسەی

حوی، مامۆستا تەیمییە وەڵامی داوە: {خۆ سیبەوەیهی پێغەمبەری نەحو نیە، لە (کتاب) هەشتا هەڵەی کردووە، تووش هێشتا هەستت پێ نەکردووە، لەو کاتە برادەرایەتیەکەیان تیرازەی پسا و تێکچوو}.

٣. هەروەها محەممەد عەلی شەوکانی لە (البدر الطالع) ١/٧١ دەڵێ: {لە کاتی وتوویژ لەگەڵ بەرانبەرەکەی، ئەگەر تەنگاو ببا و ترسی وەی هەبا قسە کورت بێ دەیگۆتە بەرانبەرەکە: ئەوەی تو تێگەیشتووی مەبەستی من وانیە، من مەبەستی ترم هەیە بۆشی ڕۆن دەکردەوە چیە، بۆیە کەم کەس دەیتوانی گفتوگۆی لەگەڵ بکا}.

هەروەها دەڵێ: {لە قسەکردنا توند و تیژ بوو، زۆرجار تووشی نسکۆ دەهات، بە نەرمی چارەی دەکرد، فەتوایەکانی لەگەڵ بۆچوونی کۆمەڵێ زانایان ناگونجا، ڕایەکانی لەلایان ناپەسند و ناهەموار بوون، بۆیە لە درێژی ژیانیدا تووشی ئەزیەت و ئەشکەنجە و بەندیخانە دەهات}.

نموونەی ئازارەکانی: یەکەمجار ساڵی ٦٩٨ك – ١٢٩٨ز مەلایەکان لێی هەستان و شکایەتیان لێ کرد، لە ئەنجامدا لە ووتارخوێندن و ئامۆژگاری کردن قەدەغە کرا.

لە ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز داواکرا بۆ (میصر) لەوێ کاربەدەستەکان نارەزایی خۆیان بەرانبەر دەربڕی، لە بەندیخانە گیرا، لەوێش خەڵکان هاتوچۆیان دەکرد و خەڵکی لێ دەورد، گواستیانەوە (ئەسکەندەرییە) دوایی ڕەوانی (قاهیرە)یان کرد، دووبارە گەڕاندیانەوە بۆ (ئەسکەندەرییە) سوڵتان ناصر بەریدا، لە ٧١٢ك چووە (دیمشق) لەوێ بۆ تاقیکردنەوەی بیروبڕوایەکەی کۆڕێکی گەورە بەسترا، مامۆستا کەمالی زەملەکانی هەڵبژاردرا بۆوەی وتوێژی لەگەڵ بکا، کۆڕەکە بەوە کۆتایی پێ هێنرا کە گۆیا ئیبن تەیمییە خۆی دەڵێت: من لەسەر مەزهەبی شافیعیم، ئەمجا وازیان لێ هێنا[1].

---

[1] البدر الطالع ١/٦٦.

دوایی چووە (قاهیرە) لە بەرواری ٢٢ی مانگی ڕەمەزان پاش نوێژی هەینی، دووبارە شکایەتیان لێ کرد، لەلای قازی مەخلوفی مالیکی، کەوا دەڵێ: خوای گەورە لەسەر عەرش دانیشتووە وەکو مەلیکانی ئێستا لەسەر کورسی دادەنیشن، وە فەرموودەکانی پیتی و دەنگدارن، وەکو ووتەکانی ووتارخوێنانی ئێستا، قازی پرسیاری لێ کرد، ئایا ئەوقسانە ئی تووە، بۆ چ وات گوتووە؟ وەڵامی داوە تۆ دوشمنی منی، بەرانبەرت وەڵام نادەمەوە، چەندی لێی پرسی لەوەندەی زیاتر نەگۆت، بۆیە قازی بڕیاری بەندکردنی داوە و گیرا.

دوایی لەبەر ئەوەی خەڵکان زۆر سەردانیان دەکرد قازی ترسا بیروڕایەکەی بەلاوبێتەوە و لەناو جەماوەر پەسند بکرێت، لە شەوی جێژنەی ڕەمەزان، گواستیانەوە، بۆ زیندانەکی تەنگەبەر و قۆر ناو دەبررا بە (جب)، دوایی لە مزگەوتی گەورەی (دیمشق) مەحمودی کوڕی شەهاب بانگەوازی کرد، هەر کەس بڕوای ئیبن تەیمیە هەبێت، ماڵ و خوێنی بە فیڕۆ دەچێت، ناچار حەنبەلییەکانی لایەن گیری ئیبن تەیمیە بەلاویان کردەوە کە ئێمە شافیعین[1] سالاری کاربەدەست و کوڕی جزیری قازی حەنەفییەکان ویستیان یارمەتی بدەن، بەڵام چیان پێ نەکرا، هەر لەسەر ئەو تکایەش بوو، کوڕی جزیری لە قازیاتی لادرا.

ماوە لە بەندیخانە، چەند جار بە دوایاندا نارد، بۆ وەڵامدانەوە بێت نەدەچوو پاشان ئەمیر (مهنأ) تکای بۆ کرد، یاداشتەك نووسرا لەسەر زمانی ئەو کە مەزهەبی (ئەشعەرییە) ئەمجارەش بەردرا، لە ٧٠٧ك[2] دوایی صۆفییەکان شکایەتیان لێ کرد، کە هاوارکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بی) قەدەغە دەکا و قسەی ناهەموار بەرانبەر شێخەکانی تەریقەت دەکا، ناردیانە (شام) لەوێ شەمسەدینی صابونی و عەلائەدینی قونەوی شایێدیان

---

[1] البدر الطالع ١/٦٨.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

لەسەردا کەوەی گۆتیە، دیسان گیراوە، لە مانگی شەوال تا مانگی سەفەری ساڵی ٧٠٩ك دوایی گواستیانەوە (ئەسکەندەریە) دوایی سوڵتان ناصر بەریدا، وەلەگەڵ قازی مالیکی پێکی هێنانەوە، قازی ڕازی بوو، بەو مەرجە ئیبن تەیمیە نەگەڕێتەوە سەر ڕایەکانی پێشوو، سوڵتان وەڵامی داوە: تۆبەی کردیە، بەم جۆرە بەردرا، لە (قاهیرە) دانیشت.

ئەمجارە لە ٧١٩ك – ١٣١٩ بەلاوی کردەوە، کەسێك سێ بەسێ تەلاق باوێت، یەك تەلاقی دەکەوی، دەتوانێ ژنەکە بگەڕێنێتەوە، دیسان گیراوە لە ڕۆژی عاشورای ٧٢١ك بەردرا. لە ٧٢٢ك – ١٣٢٢ز زیارەتی مردوانی قەدەغە کرد، لە مانگی شەعبان دیسان گیراوە، ماوە لە بەندیخانەی (قەڵات) تا کۆچی دوایی کرد.

کۆچی دوایی: شەوی دوو شەممەی (٢٠)ی مانگی ذی القعدە ساڵی ٧٢٨ك – ١٣٢٨ز کۆچی دوایی کرد.

نووسینەکانی: مامۆستا نوسینی گەلێك زۆرن، دەوری حەفتا کتێبی داناوە، ژمارەی بەرگەکان بۆ سێ صەد دەڕوات، بڕوانە لیستەیان لە هدیة العارفین ٢/١٠٦.

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرين ١/٤٥.
٢. البدر الطالع ١/٦٣ – ٧٢.
٣. فوات الوفيات ١/٧٤.
٤. ايضاح المكنون ١/٢٣.
٥. هدية العارفين ٥/١٠٥ – ١٠٧.
٦. كشف الظنون ١/٢٦١– ٤٨٧.
٧. البدايـــة والنهايـــة ١٣/٢٤٥، ١٤/ ٢١، ٣٨، ٤٨، ٤٩، ٥٠، ١٣٩، ١٤٢، ١٤٨، ٢٣٧، ٢٤٥.
٨. معجم المؤلفين ١/٢٦١ و ١٣/٣٦١.
٩. شذرات الذهب ٦/٨٠ – ٨٦.

١٠. الدرر الكامنة ١/٨٨ – ٩٦.

١١. درة الحجال في أسماء الرجال ١/٣٠.

١٢. الأعلام ١/ ١٤٠ و ٢/٧٩ و ١٠/ ١٩.

١٣. معجم أعلام الكورد ٥٤ – ٥٦.

١٤. علماء الاسلام ١٧٦ – ١٨٢.

١٥. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/ ٣٨٧ – ٤٠٨.

### ئەحمەد عبدالخالق ئاکرەیی (١٥٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالخالقە، خەڵکی ئاکرەیە، یەکە لە زانایە مەزنەکانی ئەو ناوچە، لە قوتابخانەکانی (هەولێر) و (کەرکوکی) خوێند، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

سەرچاوە: محەممەد بن عبدالله الجلی ١٢٧.

### ئەحمەد عبد العزیز داود حەڕانی (١٥٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی داودی کوڕی مەهرانە خەڵکی حەڕانە دەستی بە خوێندن کرد دوایی لە وڵاتی خۆی دوورکەوتەوە بۆ خوێندن و نووسینەوەی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) تا تەواو شارەزا بوو، گەڕاوە (حەڕان) ساڵی ٢٧٠ك – ٨٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: المنتظم ٧/ ١٨٧.

### ئەحمەد عبدالعزیز یوسف حەڕانی (١٥٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی یوسفە، خەڵکی (حەڕانە) ساڵی ٧٠٤ك – ١٣٠٤ز هاتووتەدنیا، خەریکی خوێندنی فەرموودە و شەریعەت بووە، تەواوی کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە، چوویتە (حەلەب) لەوێ دەرسی داوە، کتێبی (المطلب)ی نووسیتەوە، لە ٧٨٨ك – ١٣٨٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ١/ ١٠٤.

## ئەحمەد عبدالقادر سلێمانی ( ١٥٧ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عبدالقادرە، ناسراوە بە مەلاقادر، ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز لە (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی و شێخ عبدالرحمان و سەید حەسەنی خوێندووە، لە ١٢٩٩ك کرا (نائیب) لە دادگای شەرعی (زاخۆ) پاشان کرا ئەندامی دادگای (سلێمانی)، دوایی گواستراوە بۆ (هەڵەبجە)، مامۆستا دەستی شیعری هەبوو، نازناوی (صائیب) بوو، ماوەك لەماڵەوە دەرسی دەداوە، لە ١٣٢٨ك – ١٩١٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ١/٩٤ – ٩٥.

## ئەحمەد عبیدالله دیاربەکری ( ١٥٨ )

ناوی ئەحمەدە، نازناوی (ئەبولحوسێن)ە، کوڕی عبید الله‌ی کوڕی حوسێنە، باوکی لە (دیاربەکر) چوویتە (واسیط) لەوێ نیشتەجێ بووە، ئەو کوڕەی لەوێ بووە، بوویتە زانایەکی مەزن و پاك و خاوێن و لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بووە. مامۆستا عبدالکریم سەمعانی خاوەنی کتێبی (الأنساب) دەڵێت: {دوو جاران فەرموودەم لێ وەرگرتووە، یەکەم جار لە (بەغدا)، جاری دووەم لە (واسیط)}.

سەرچاوەکان:

١. الانساب ١/ ٢٠٤.

٢. اللباب ١/٧٨.

## ئەحمەد عوبێد شارەزوری ( ١٥٩ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عوبێدی، کوڕی عبدالله ی شارەزوریە، لە (بەغدا) دانیشتووە و دەرسی داوە، لە زۆر زانایان زانیاری وەرگرتووە، چەندان قوتابی پێگەیاندووە، ناسراوە بە زاتەکی بڕوا پێ کراو، لە مانگی مەولوودی ساڵی ٢٩٨ك – ٩١٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ٣/ ٤٩٠.

## ئەحمەد عوسمان (تەوێلەیی) (١٦٠)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی شەمسەدینە، کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵەیە، ساڵی ١٢٦٠ك – ١٨٤٤ز لە گوندی (بیارە) هاتووتەدنیا، لەژێر چاوی باوکی پەروەردە بووە تا دەرچووە بە مەلا، لە لایەن مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی و سەید عبدالرحیمی مەولەوی و مەلا حامیدی کاتب فێرە زانیاری بووە، تەریەقەت و تەسەووفی لە لایەن باوکی بۆ هاتووە، شێخ محەممەد بەهائەدینی برا گەورەی چاودێری کردووە، تا وا هەڵکەوتووە بووە بە خاوەن زانیاری زاهیر و دەرونی، توانیتی ئامۆژگاری خەڵکان بکا و شەریعەتی خوا و پێغەمبەریان نیشان بدات.

شێخ ئەحمەد چەند حاشیەی فارسی لەسەر عەقیدەی مەرضیەی مەولەوی هەیە، بەردەوام خەریکی سوننەتەکان و شەونوێژ بووە، لە گەنجی تا ڕۆژی کۆچی دوایی قەت شەونوێژی نەبواردووە، کە سیراجەدین شێخ عوسمانی باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ ئەحمەد لە گوندی (ئەحمەداوا) خانەقای دروست کرد، پاشان سەفەری (ئەستەمبۆلی) کرد، لەوێ سوڵتان عبدالمجید بە خەڵات قورئانەك و چەند (موو)ی ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری (د.خ) پێ بەخشی، مووەکان لە خانەقا بوون خەڵکان زیارەتیان دەکرد، مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) (خوا لێی خۆش بی) دەڵێ: {خۆم چەند جار زیارەتم کردینە، بەرەکەتیان لێ دەباری}.

پاشان شێخ چووە (حەج) لەو سەفەرە سەید حەسەنی چۆڕی (نەوەی ئەبوبەکری مصنف ی) لەگەڵ بوو، دوایی گەڕاوە (ئەحمەداوا) خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ١٣٠٨ك – ١٨٩٠ز کۆچی دوایی کرد، لە خانەقای (تەوێڵە) لە خزمەت شێخ عوسمانی باوکی بە خاك سپێردرا.

ڕووداوێك: شێخ ئەحمەد، پێش کۆچی دوایی وەصیەتی کرد: شێخ عومەری برا گەورەی زیکری (لا إله الا الله)ی لەسەر بخوێنێ، کە گیانی شەریفی دەرچوو، بۆ شووشتن لەسەر تاتەشۆریان دانا، مەلا حامیدی کاتب هاتە لای شێخ عومەر، گۆتی: لەوانەیە شێخ

ئەحمەد نەمردبی، هەر مابی، چونکە کاتی شووشتن گوێمان لە دەنگی (لا إله الا الله) دەبی، شێخ عومەر فەرمووی: نەخێر نەماوە، مردووە، بەڵام ئەو دەنگە دەنگی ئەو زیکرەیە کە کاتی سەرەمەرگ لەسەرمان خوێند.

کوڕەکانی: عبدالله: شاعیر بووە، نازناوی (نێزلی)بووە، لە گوندی (گەڵا تەرزان) سەر بە (سنە) دانیشتووە، ساڵی ١٣٧٥ك - ١٩٥٥ز کۆچی دوایی کردووە، وە هدایة الله و حەبیب و حەسەن.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨١ - ٨٢.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤١١ - ٤١٢.

٣. تاريخ مشاهير كورد ٢/ ٣٥٧.

٤. نثر الجواهر والدرر ١/١٢٣ - ١٢٤.

## ئەحمەد عوسمان زەرزاری (١٦١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عوسمانی، کوڕی ئەبو عەلی، کوڕی مەهدی کوردییە عەشیرەتی (زەرزارییە)، دەستی بە خوێندن کرد، پاشان بۆ فێربوونی فەرموودە چووە (بەغدا) لای ئەحمەدی کوڕی طاهیر و موبارەکی کوڕی حەسەنی شارەزوری خوێند، دوایی چووە (ئەصفەهان) لای هەیبەتوالله ی کوڕی محەممەد، پاشان چووە (هەرات) لە خزمەت (عبدالأول)ی کوڕی عیسا کتێبی (صحیح البخاری) خوێند، ئەمجا گەڕاوە عێراق لە (هەولێر) دەرسی فەرموودەی دەدا، ناوە ناوەش دەچووە (موصل).

دانراوەکانی: مامۆستا دوو کتێبی لە زانیاری قورئانی پیرۆز داناوە (المؤنس) و (المنتخب).

فەقێیەکانی: لەوانە: زانای بەرز عێزەدین عەلی کوڕی جەزیری خاوەنی (الكامل) هەروەها مێژوونووسی هەولێر: (ابن المستوفی).

خوو ڕەوشتی: زاتەکی شارەزا بوو لـە زانسـتەکانی قورئـانی پـیرۆز، لـەو بابەتـە پێشەوا بووە لە خواترس بووە، دژی خراپە و خراپەکاری بووە، بـۆ خـەڵکی دنیاپەرسـت سەری خۆی شۆڕ نەکردووە، لەبەر خوا پەرستی کز و لاواز بـووە، خـۆراك و خـواردنی کەم بووە، پێخۆری کەمەك مێـوژی ڕەش بـوو لـە نـاو (چـێنی)یەکی دەکـرد، لێوەکـانی شکابوون.

کۆچی دوایی: لە شەوی هەوینی (١٠)ی مانگی ڕەمەزانی پـیرۆز سـاڵی ٥٩١ك – ١١٩٥ز لە هەولێر کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ عبدالله (شـیخەڵلا) بە خاك سپێردرا، سـوڵتان (مظفـر)ی هـەولێر چـووە نـاو گۆڕەکـەی بـۆ ئەنجامـدانی کاروبـاری شرانەوە، منیش دەڵێم:

بۆ ئایینەکەت ببە خزمەتکار   خزمەتت دەکەن سەرکردە و سالار
لە دنیا دەژی بە چاو بلّندی   لە لایەن خودا بە ڕەزامەندی
دوعای خێر بۆت دێ لە ناو گۆڕەکەت   خوایە پڕ نوورکەی خێر و بەرەکەت

سەرچاوەکان:


١. تاریخ أربیل ١/٣٨.
٢. أربیل في العهد الاتابکي ٢٨٨.
٣. معجم أعلام الکورد ٥٧.


## ئەحمەد عوسمان سۆرانی (١٦٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عوسمانی، کوڕی ئەبوبەکرە، کوردی سۆرانیە، ناسـراوە بـە (مەجروحي) مەزهەبی شافیعی بووە، لـە ١٠٠٩ك – ١٦٠٠ز هاتووتەدنیا.

ساڵی ١٠٢٥ك چووە (دیمشق) لای حەمزە کوردی دابەزی، دەرسـی عـەرەبی و فارسی دەدا کوڕەکانی، لە ١٠٣٥ك چووە (حـەج) دوایـی چـووە (میصـر) لـە ١٠٥٠ گەڕاوەتەوە (دیمشق) خەریکی دەرسدانەوە بووە، مامۆستا لە مێژوو شارەزا بوو، لە شەوی

هەینی کۆتایی مانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی ١٠٦٩ك – ١٦٥٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغیر) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الاثر ١/ ٢٤٢ – ٢٤٣.
٢. تاریخ مشاهیر کورد ١/ ٢٠٢.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥ – ٥٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٥٧.
٥. مشاهير الكورد ١٠٦ – ١٠٧.

## ئەحمەد عەلی بەدران (حلوانی) (١٦٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عەلی، کوڕی بەدرانە، لە دەوری ساڵی ٤٢٠ك – ١٠٢٩ز هاتووتەدنیا، زانیاری لە ئەبو ئیسحاقی شیرازی وەرگرتووە، ناوبانگی لە بەغدا ڕۆیشتووە لە ٥٠٧ك – ١١١٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (لطائف المعارف)ی داناوە، مامۆستا عبدالکریمی مدرس دەڵێ: {حلوان: شاری زەهاوی ئێستایە}.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٤.
٢. كشف الظنون ١/١٥٥.
٣. معجم المؤلفين ١/٣٢٠.

## ئەحمەد عەلی حەسەن جزیری (١٦٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عەلی، کوڕی حەسەن، کوڕی داودی جزیرییە، ساڵی ٦٤٩ك – ١٢٥١ز هاتووتەدنیا. لە لای چەندان زانایانی خوێندووە، ئیجازەی وەرگرتووە، لە (حەما) و لە (دیمشق) دەرسی فەرموودەی داوە، ئیمامی سوبکی دەڵێ: (کەسم نەدیت وەك ئەو زاتە قەلب سووك بێت لەسەر خواپەرستی}، مامۆستا ئیجازەی بە چەندان داوە، لە ٧٤٣ك – ١٣٤٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/ ١٢٣.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠.

## ئەحمەد عەلی حەریری (١٦٥)

ناوی ئەحمەدە کوڕی عەلییە، ناسراوە بە (حەریری عوسالی)، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، شێخی تەریقەتی (خەلوەتی) بووە، تەریقەتی لە شا وەلی خەلوەتی وەرگرتووە، زاتەکی خواناس و خاوەن کەرامەت بووە، ساڵی ١٠٤٨ك – ١٦٣٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. جامع كرامات الاولياء ٥٥٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٥٩.

## ئەحمەد عەلی شەوقی (١٦٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عەلی، کوری ئەحمەدە، نازناوی (شەوقی)یە، ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز هاتووتەدنیا.

لە کوردەکانی جزیرەیە، خۆی دەڵێ: گوێم لە باوکم بووە دەیگۆت ئێمە ڕەچەڵەکمان کوردە، پاشان چووینە ناو عارەبان، ناوبراو شاعیرەکی چاك بووە سەرۆکی شاعیرەکان (أمير الشعراء)ی سەردەمی خۆی بووە، ماوەك لە قوتابخانەی (میصر)ی خوێند، لە بەشی تەرجومە، پاشان ساڵی ١٨٨٧ز تەوفیق خدێوی ناردییە (فەڕەنسا) لە ١٨٩١ز گەڕاوە (میصر) لەوێ کرا سەرۆکی نووسەرانی حکومەت، لە ١٨٩٦ز نێردرا (جنێف) لە ١٩١٥ز سەفەری (ئەسپانیا)ی کرد، ١٩١٩ز گەڕاوە (میصر)، کرا ئەندامی کۆڕی پیاوماقوڵان، لە ١٣٥١ك – ١٩٣٢ز کۆچی دوایی کرد.

بەشێك لە بەرهەمەکانی: قەصیدە لەسەر شێوەی بوردییە و هەمزییەی (بوصیری) لە مەتحی پێغەمبەر (د.خ)، الشوقیات: چوار بەرگە، دول العرب، مجنون لیلی، علی بگ، عذراء الهند.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ١/ ١٣٣.

٢. معجم أعلام الکورد ٧٩ – ٨٠.

٣. معجم المؤلفین ١/ ٢٤٦.

٤. مشاهیر الکورد ٩٢ – ٩٤.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٦٦ – ٦٧.

## ئەحمەد عەلی گەلالی (١٦٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عەلی یە، خەلکی (گەلالە)یە، سەر بە چۆمان، عەشیرەتی بالەکە، مامۆستایەکی زۆر زیرەك بووە، شتی ئالۆزی بە ئاسانی زانیوە، ڕوو لە خوا بووە بە ڕۆژ بە ڕۆژی بووە، بە شەو شەونوێژی کردووە تەریقەتی نەقسبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزوری وەرگرتووە، لە لای چەندان مامۆستای بەرزی خوێندووە، بۆ نمونە:

١. مەلا محەممەدی (خەتێ) موفتی سۆران.

٢. مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمی خاوەنی وەضع و ئیستیعارە.

٣. مەلا عەلی وەسانی.

٤. مەلا یەحیای مزوری، توحفەی لە لای خوێندووە.

٥. مەلا عبدالرحمان ڕۆژبیانی، لە خزمەتی ئەوە تەواوی کردووە.

ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، شێخ ئیبراهیم فەصیح ناوی بیست کتێبی دینی نووسیوە کە لە خزمەت ئەو زاتەی خوێندووە، دوایی دەڵێ: {مامۆستا ناوە ناوە خۆی لە فەقێیان دەدزییەوە، دەچووە مزگەوت خواپەرستی دەکرد، من لەوێش وازم لێ نەدەهێنا، دەچووم پرسیارم لێ دەکرد، بە کورتی ئەو زانایە دوای نوێژی بەیانی تا مەغریب خەریکی

دەرس دانەوە بوو، بە زۆریش دەرسی ئیبراهیم فەصیح بوو، پرسیاریان لێ کرد: بۆ لەگەڵ ئەو کورە ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی کەچی لەگەڵ ئێمە وانی؟ دەیفەرموو: ڕۆڵەکانم ئەوە حەقی باب و باپیرانی لەسەر هەموومان هەیە واتە: حەیدەریەکان مامۆستای زۆربەی مەلایەکانی کوردستانن.

ڕەوشتی: دەربارەی ڕەوشتی باس دەکەن، کە دادەنیشت باسی دونیای نەدەکرد، باسی کەسی نەدەکرد، ووتە پیرۆزەکانی هەمووی هەر خێر بوون، تەنیا چاکەی لە لا بوو، دەربارەی مێژووی لە دایکبوون و کۆچی دوایی هیچ لێ نازانم، تەنیا ئەوەندەیە: مامۆستایەکە لە زانایەکانی چەرخی (١٩) نۆزدەی زایینی.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١١٨ – ١٣٧ – ١٣٨ – ١٣٩.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦١ – ٦٢.

٣. علماء ومدارس في أربيل ١٠١.

٤. بنەماڵانی بە ناوبانگی ڕواندز ٣٢.

## ئەحمەد عەلی مەجدەدین (١٦٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عەلی، کوڕی ئەبو غالیبە، ناسراوە بە (مەجدەدین)، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٥٩٤ك – ١١٩٧ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، ماوەك لەوێ خوێندووە، پاشان چوویتە (دیمشق) لەوێ نیشتەجێ بووە، دەرسی داوە، مامۆستا زەین تیژ بووە، لە نەحو شارەزا بووە لە ٦٥٧ك – ١٢٥٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/ ٢٨٨.

٢. بغية الوعاة ١ / ٣٤٤.

٣. مشاهير الكورد ١/ ١٠١.

٤. الاكليل في محاسن أربيل ١٣٦.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٩.

٦. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/ ٢٦٨.

## ئەحمەد عەلی وەلزی (١٦٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا عەلی، کوڕی مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا عبدالقادری، کوڕی مەلا عەلی (فەوزی)یە، خەڵکی گوندی (وەلزێ)یە لە ناوچەی باڵەکان، ساڵی ١٣٤٧ك – ١٩٢٨ز لە گوندی (تورجان) هاتووتە دنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، هەر لە (تەصریفی مەلا عەلی) تا (موختەصەری منتهی) هەر هەمووی لە خزمەت کاکی مەلا محەممەد خوێند، بۆ زانستەکانی تر گەڕاوە خزمەت باوکی، دوایی چووە لای ئەو بەڕێزانە: مەلا عیصامەدینی شەفیعی، مەلا حوسێنی مەجدی، مەلا حەسەنی شێخی، پاشان چووە لای مەلا عبد العظیمی موجتەهیدی لە (سنە)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: دەستی کرد بە دەرس دانەوە، لە (ئازربێجان) و (بۆکان) و (مەهاباد).

دانراوەکانی: چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. مەناسیکی حەج: بە فارسی.

٢. (اثبات الواجب).

٣. نامیلکە دژی (جەبرییان).

٤. شەرحی (بانت سعاد).

سەرچاوە: تاريخ فرهنگ وأدب مكريان ٢٩٩ – ٣٠٢.

## ئەحمەد عومەر کفر عەزی (١٧٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عومەری، کوڕی ئەبوشاکری (کفر عەزەیە)، یاقووتی حەمەوی دەڵێ: {کفرعەزە: گوندێکی نزیك هەولێرە، لە نێوان هەولێر و زێی خوارەوەیە}، لەوانەیە گوندی (عەزەی) ئێستا بی کە لە نزیك گوندی (قونیانە)، مامۆستا دەرسی فیقهی حەنەفی لە قوتابخانەی (مظفرية)ی هەولێری خوێندووە، هەروەها دەرسی

فەرموودەشی هەر لەوێ تەواوکردووە، بوویتە مەلا و هەر لەو شوێنە دەرسی داوە، هەر لە هەولێر ماوە، تا لەشکری هۆلاکۆی داگیرکەر هات بەسەر هەولێری دادا و تالآنی کرد، ئەویش چاوی بەرایی نەدا چیدیکە لە هەولێر دابنیشێت، ڕووی کردە وڵاتی (شام)، ساڵی ٦٣٤ک – ١٢٣٦ز لەوێ نیشتەجێ بوو، دوایی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ٤/٤٧٠.

٢. أربيل في العهد الاتابكي ٢٥١.

## ئەحمەد عومەر کوردی (١٧١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عومەری، کوڕی حەسەنی کوردییە، نازناوی ئەبو عەبباسە لە (تەبرێز) دەرسی شەریعەتی خوێند، تا شارەزا بوو (المهذب)ی ئەبو ئیسحاقی شیرازی لەبەرکرد، هاتە (بەغدا) لە قوتابخانەی (نظامیە) کرا (مدرس)، لە سەردەمی خۆی تاکە زانای بە دین و بە ناوبانگ بوو، لە دیمەن و ڕوخسارەوە نێوچەوانی نورانی بوو، زانیاری لێ دەباری، لە ٥٩١ک – ١١٩٥ز کۆچی دوایی کرد

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعيه الكبرى ٣/ ٣١٧ – ٣١٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٤ – ٤٥.

## ئەحمەد عومەر هەولێری (١٧٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی عومەری، کوڕی نەصری (هەولێری)یە، ناسراوە بە (ئەبونەصر) زانایەکی شەرع زان بووە، ماوەك دەرسی فەرموودەی دایتەوە، مامۆستا تا مانگی شەوالی ساڵی ٥٥١ک – ١١٥٦ز لە ژیاندا مابوو.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ١/ ٢٤٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٩.

## ئەحمەد فائیز بەرزنجی (١٧٣)

ناوی ئەحمەد فائیزە، کوڕی سەید مەحمودی، کوڕی سەید ئەحمەدی، کوڕی سەید عبدالصمدی کوڕی سەید حەسەنی (گڵەزەردە)یە، ئەویش نەوەی شێخ عیسایە کە باپیرە گەورەی سەیدەکانی بەرزنجەیە، ساڵی ١٢٥٨ك - ١٨٤٢ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و چەند کتێبێکی فارسی و تەصریفی زەنجانی لە خزمەت باوکی خوێند، دوایی لە لای مەلا غالیب ئەفەندی ئەو کتیبانەی خوێند: عەوامیلی جورجانی بە شەرحەوە، سەعیدینی، جامی، ئیساغۆجی، فناری، وەضع، ئیستیعارەی میر ڕۆستەمەیی، (الرسالة الحنفية)، عبدالله یەزدی، پاشان چووە لای مەلا سەید مصطەفا ئەفەندی بەرزنجی کتێبانی: قۆشەجی و وەضع و شەرحی شەمسییە و عەروز و تهذیب الکلام ی خوێند، ئەمجا چووە لای مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی لە (سلێمانی) شەرحی هیدایەی حیکمەت و حاشیەکانی خوێند، بەشیکی لە (مطول) لە لای مەلا ئەحمەد ئەفەندی پیرحەسەنی موفتی چاومار خوێند، وەبەشێك لە تەفسیری بەیزاوی و شەریعەت و فەرموودە و ئوصولی لە لای خاڵی مەلا سەید کاك ئەحمەد خوێند.

پلە وپایەکانی: ساڵی ١٢٧٧ك کرا (مدرس) لە مزگەوتی نۆدشەیی لە (سلێمانی)، لە ١٢٨٦ك کرا قازی (کۆیە)، لە ١٢٩٤ك کرا قازی قەرەداغ سەر بە سلێمانی، لە ١٢٩٧ك کرا (نائیب) لە دەوروبەری (بەغدا)، لە ١٣٠٠ك کرا (نائیب) لە دەوروبەری (بەصرە)، لە ١٣٠٣ك کرا نائیب لە موصل، پاشان کرا ئەندامی کۆڕی گەورەی زانیاری لە (ئەستەمبۆڵ)، (مەلا سەید فائیز) هەرچەندە سانەوەی نەبوو، لەو شوێن دەگۆزراوە بۆ ئەو شوێن، دوور دەخراوە لە دۆستان و برادەران، بەڵام دۆستی بە ڕاستی هەر کتێب بوو، قەت لێی دانەدەبڕا، قەڵەمەکەی برادەری بە ئەمەکی بوو، هەر لەگەڵی بوو، بەردەوام خەریکی نووسین بوو، دانراوی لە چەند بابەت هەیە، لەوانە:

١. روضة الازهار في شرح غاية الإختصار: فارسی یە، لە ١٢٧٧ك لە سلێمانی تەواوی کردیە.

٢. خلاصة العقيدة في شرح الدرة الفريدة: عەرەبی یە، ساڵی ١٢٧٨ك لە سلێمانی تەواوی کردیە.
٣. تحفه الاخوان فی شرح فتح الرحمن فی المعانی والبیان: ساڵی ١٢٨٣ك لە سلێمانی تەواوی کردیە.
٤. تسهيلات برزنجية، دەر عوامل جدولیە (نەحو)وە، بە تورکی، ساڵی ١٣٠٠ك لە ئەستەمبۆڵ تەواوی کردیە.
٥. البدر الكامل في إختصار التصريف والعوامل: ساڵی ١٣٠٠ك لە ئەستەمبۆڵ تەواوی کردیە.
٦. جلاء الطرف في اختصار الصرف ساڵی ١٣٠١ك لە مونتەفیك دایناوە.
٧. حميدية في اختصار الصرف والنحو: تورکی یە ساڵی ١٣٠٣ك لە کەربەلا تەواوی کردیە.
٨. أنفس الفوائد في شرح الفرائد: عەرەبی یە، ساڵی ١٣٠٦ك لە دەرسیم تەواوی کردیە.
٩. السيف المسلول في القطع بنجاة أصول الرسول، ساڵی ١٣٠٦ك لە دەرسیم تەواوی کردیە.
١٠. خير الأثر في النصوص الواردة في مدح آل خير البشر: تورکی یە ساڵی ١٣٠٦ك لە دەرسیم تەواوی کردیە.
١١. زبدة الآمال في ترجمة نصوص الآل: تورکی یە ساڵی ١٣٠٧ك لە ئۆرفە تەواوی کردیە.
١٢. نص القرآن في وجوب طاعة السلطان: عەرەبی یە ساڵی ١٣٠٨ك لە ئەستەمبۆڵ تەواوی کردیە.
١٣. الدر المنظوم في إيضاح ما اشتمل على سبعة العلوم، ساڵی ١٣٠٨ك لە ئەستەمبۆڵ تەواوی کردیە.

١٤. بهجة البنيان على تحفة الاخوان، ساڵی ١٣٠٩ لە قەسطمونی تەواوی کردیە.
١٥. إرشاد العباد إلى تصحيح الإعتقاد: ساڵی ١٣١٣ك لە قەسطمونی تەواوی کردیە.
١٦. السحر الحلال في تعريفات العلوم: ساڵی ١٣١٢ك لە قەسطمونی دایناية.
١٧. أبهى القلائد في تلخيص أنفس الفوائد، ساڵی ١٣١١ك لە قەسطمونی تەواوی کردیە.
١٨. كنز اللسن، المكنوز فيه ستة ألسن واثنا عشر فن، ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز لە موصڵ دایناية، ساڵی ١٩٨٠ز بە لێکۆڵینەوەی شێخ محەممەدی خال لە بەغدا چاپ کرا، لەسەر ئەرکی کۆڕی زانیاری کورد.

باسی (كنز اللسن) وەك شێخ محەممەدی خاڵ دەڵێ:

(مەلا سەيد فائیز) ئەو کتێبەی دابەش کردیە بە یازدە خانە بە (عامودی) لە سەرەوە بۆ خوارەوە بخوێنەوە، خانەی یەکەم دەبێتە: (کەلام)، دووەم: (تەفسیر)، سێیەم: (حەدیس)، چوارەم: (فیقه)، پێنجەم: (نەحو و صەرف)، شەشەم: (حیکمەت)، حەوتەم: (مەنتیق)، هەشتەم: (بەلاغە و ئاداب)، نۆیەم: پێنج بەیتی تورکی یە لە مەدحی سوڵتان عبدالحمیدخان، دەیەم: شەش بەیتی فارسی یە لە مەدحی سوڵتان عبدالحمیدخان، یازدەیەم: چوار بەیتە دوو فەڕەنسی یە سێهەم ڕووسی یە، چوارەم کوردی یە.

بە پانی لە ڕاستەوە بۆ چەپە بخوێنەوە، تورکی و فارسی و فەڕەنسی و ڕووسی و کوردی هەموو دەبنە عەرەبی، شیعرەکانیش دەگۆڕێن دەبنە مەدحی سوڵتان و چەند جۆرە ئامۆژگاری، دوا وشەکانی خانەی دوایی کۆبکەوە، دەبنە بەیتە شیعرێك مێژووی دانانی کتێبەکەی لێ دەردەچێت، بەیتەکە ئەوەیە:

ما نيل ما أبدعت من عجائبي لذا أتي التاريخ (من غرائبي)

ووشەی (من غرائبي) بە لێکدانەوەی ئەبجەدی دەکاتە ١٣١٣ك، بە ڕاستی کتێبێکی بێ وێنەیە، چۆن توانی لە یەك لاپەڕە، ئەو هەموو زانیاریانەی لێك جودا کۆبکاەوە؟ زۆر سەیرە بە درێژی بیخوێنەوە زانیاریەك و زمانەکە، بە بەرینی بخوێنەوە دەبێتە

زانیاری و زمانێکی تر، لەوەش سەیر تر ئەوەیە، ئەو زمانانەی وا لێکدوور و ڕێزمان جودا چۆن هێنایە سەر زمانی عەرەبی؟ تەفسیر و مەنتیق و نەحو لە کێ؟ کوردی و فەرەنسی و ڕوسی و تورکی لە کێ؟ چۆن لێکدرانەوە؟ چۆن داندران؟ چۆن ڕێك کەوتن؟ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە تەنیا ئەوەیە: ﴿ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء والله ذو الفضل العظيم﴾، (الجمعة / ٤).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٧٧ك – ١٩١٨ز لە (ئەستەمبۆڵ) کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: مامۆستا چوار کوڕی هەبوو: شێخ عارف حیکمەت و شێخ ڕەشید و شێخ عەلی و شێخ عبدالکریم.

سەرچاوەکان:

١. أبهي القلائد في تلخيص أنفس الفوائد/ پێشەکی.
٢. كنز اللسن/ پێشەکی.
٣. البيتوشي ٥٤.
٤. الشيخ معروف النودهي ٩٥.
٥. هدية العارفين ٥/١٩٣.
٦. إيضاح المكنون ٣/ ١٣.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٤ – ٨٥.
٨. معجم المؤلفين ٢/٤٣.
٩. الأعلام ١/ ١٨٣ – ١٨٤.
١٠. تاريخ السليمانية ٢٣٦ – ٢٣٩.
١١. معجم أعلام الكورد ٦٧ – ٨٣.

## ئەحمەد فتوح گۆرانی (١٧٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی فتوحی، کوڕی محەممەد سەعیدی، کوڕی مەلا ئیبراهیمی، گۆرانی یە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، ساڵی ٤٨٥ك – ١٠٩٢ز لە شاری مەدینەی

ڕۆز هاتووتەدنیا. دەرسی لە لای باوکی و شیخ ئەبوطاهیری مامی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا ئیبراهیمی باپیری وەرگرتووە، ناوبراو ناسراوە بە زاتەکی بە دین و لە خواترس، لە ٥٨٨ك – ١١٩٢ز لە تەمەنێکی درێژ و پڕ خێر و بەرەکەت کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦٠.

## ئەحمەد موبارەك نەصیبی (١٧٥)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی تەقیەدینە، کوڕی موبارەکی، کوڕی نەوفەلە، خەڵکی (نەصیبین)ە، زانا و ڕۆشنبیر بووە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٦٤ك – ١٢٦٦ز لە جزیرە کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبی داناون لەوانە: شرح مقصورة ابن درید، شرح ملحمة الإعراب، العروض، منظومة في الفرائض، دیوان خطب.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٥٧.

٢. كشف الظنون ٢/ ١٨٠٨.

## ئەحمەد محەممەد ئادەم باڵەکی (١٧٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئادەمە، عەشیرەتی (باڵەکە)، لە لای باوکی خوێندووە و پێ گەیشتووە، لە زۆر شوێن و هەوار و گوند و شار گەڕاوە بۆ بردنە سەری خوێندنەکەی، ساڵی ١٢٢٨ك – ١٨١٣ز کتێبی (کەمال)ی شەرحی شافییەی نووسیتەوە، لە دوای حاشیەکانی سەر کتێبەکە بە زۆری ئاماژە بەو جێیانە دەکات کە لەو کاتە لێی نیشتەجێ بووە، ئەو دەستنووسە ئێستا لە لای ئێمەیە، تەنیا لەو کتێبە ناوی ئەو جێگایانەی نووسیون، کە لێی خوێندوونە، ناوەکانیان ئەوانەن: سابلاغ، شێخ وەتمان، نەجد سولاوکە، سینگوڕە، ئیران، گویزان، دێلزە، کەرکوك مزگەوتی نائیب ئۆغلی. لەگەڵ چەند شوێنانی تر کە نووسینەکانیان ڕەش بووینەوە و باش ناخوێندرێنەوە.

زۆر سەیرە ئەگەر کەسێك تەنیا لە یەك کتێب نووسین ئەوەندە هەوارانە بکا، ئەدی لە نووسینەکانی تر، تا خوێندنەکەی بردیێتە سەر دەبێت چەند شوێنی کردبێ؟ بەلاّم چونکە مەبەستەکە ڕاست بووە، گەڕانەکە بۆ خودا بووە، هەرچەندە ماندووبووە گوێی بە ئازار نەداوە، خوای گەورەش ئەو تەرزە زاتانەی هەڵبژاردن، کردنیە سەروەری دنیا و قیامەت، ڕێ و ڕێبازی چاکەیان کرا دەستووری ژیان، نووسەر و مێژوونووسان، شانازی بە بەلاوکردنەوەی ژیاننامەیان دەکەن، تاکو دنیا دەچێتەسەر، مامۆستا کتێبی (البحرالجمان فی بیان معضلات القرآن)ی داناوە، ساڵی ١٢٤٦ك – ١٨٣٠ز لە گوندی (سنجاغ) سەر بە (سابلاغ) تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ١٠٧.
٢. بنەماڵەکانی بەناوبانگی ڕواندز ٧٥ – ٧٦.
٣. دەستنووسی کەماڵی شەرحی شافیە.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٦٤.
٥. الامیر الکردي محمد الرواندزي ٥٠.
٦. شەرەفنامە/ تەرجەمەی جەمیل ڕۆژبیانی ٤٧٠.

## ئەحمەد محەممەد ئاشۆکانی (١٧٧)

ناو و نژادی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی فەقێ، محەممەدی، کوڕی عەزیز، کوڕی ڕەسولە، باپیری دایکی نووسەری ئەم مێژووەیە، عەشیرەتی (گەردی)یە، باپیرە گەورەی هاتووتە گوندی (ئاشۆکان) لە ناوچەی بەڕانەتی، بۆیە ناسراوە بە (ئاشۆکانی)، ساڵی ١٢٩٧ك – ١٨٧٩ز لە ئاشۆکان هاتووتە دنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی لە لای باوکی خوێند، دوایی چووە قوتابخانەکانی دەشتی هەولێر، دوایی هاتە (هەولێر) لای شێخ عەلی لە مزگەوتی (خانەقا)، پاشان چووە ناوچەی خۆشناوەتی، ماوەك لە (هەرتەل) بوو، ماوەك لە (بێتواتە) لای مەلا نەبی، ئەمجا

چووە (خەتە) لای مەلا عبدالفتاح، لەوێ چووە (شەقلاوە)، لای مەلا (طاها) لەوێ چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، لەو کاتە جەنابی شێخ مصطفای نەقشبەندی لەوێ فەقێ بوو، پاشان چووە (گردمەلا) لای مەلا عوسمانی (شەوەکی)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، مەحمود کاکە خانی سەرۆکی عەشیرەتی دزەیی بەوبۆنەیە حەوت ڕۆژ ئاهەنگی گێڕا، ئەرکی مێوانداریەکەی کێشا، پاشان بۆ بەرەکەت ئیجازەی تری لە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی وەرگرت لە (هەولێر).

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (مورتکە) دوایی باری کرد، چووە (قەرەموکیان) لەوێ ڕۆیشت چووە (گردارەق)، پاشان چووە (بنەسراوە)ی گەورە، چەند ساڵان لەوێ مەلا بوو، دەرسی دەداوە، دوایی لە چەند کەسانێك لە خەڵکی گوندەکە دڵی ئێشا، باری کرد بۆ (هەولێر) کەمەك لەوێ ماوە، باری کرد بۆ (کەورگۆسك)، لەوێ ڕۆیشت چووە (باقرت)ی قەراج، سوپاس بۆ خودا لەو هەموو شوێنانە مەدرەسە و فەقێیانی هەر هەبوو.

فەقێیەکانی: چەند لە مەلایە چاکەکان لەسەر دەستی ئەو دەرچووینە، بەشێکیان ئەمانەن: مەلا صالحی کۆزە پانکەی، مەلا محەممەدئەمینی سوێری، مەلا ئەحمەدی گەزنەیی، مەلا ئەحمەدی ئاکرێ، مەلا عومەری تەرجانی، مەلا ئەحمەدی بەحرکەیی، محەممەد شێخ عبدالله نەقشبەندی، ئەسعەد شێخ عبدالرحمان نەقشبەندی، مەلا عەلی لەیلانی، مەلا سەعیدی باغەمرەیی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا ئیسماعیل سوسەیی، مەلا حوسێنی برای، مەلا مصطفای برازای، مەلا عبداللهی برازای، مەلا محەممەدئەمینی برازای، مەلا عبدالعزیزی برازای، مەلا عبدالقادری برازای، مەلا محەممەدی باشووری، مەلا محەممەد سەعیدی کوڕی، مەلا مەسعودی کوڕی.

خو ورەوشتی: زاتەکی حەق گۆبووە، بە سام و بە هەیبەت بووە، سەر بلند بوو، بۆ پیاوانی ئاینی بار قۆر بوو، بە دەستی خۆی خزمەت مێوانانی دەکرد، مامۆستا مەلا خدری شامامەری دەیگۆت: جارەك مێوانی بووم، خۆی خزمەتی دەکرد، منیش بە سەر خۆدا شکامەوە و گوتم: مامۆستا ئەتو دانیشە ئەمن خزمەت دەکەم، وەلامی داوە: {نەخێر

خزمەت دەکەم کەس لە ماڵی خۆی گەورە نیە}، هەروەها جار وابوو لە دوورەوە بە شانی خۆی ئاوی بۆ فەقێیان دەینا، بۆ نوێژی بەیانی یەك سەعات شەو دەما دەچووە مزگەوت، مەلا عبدالقادری برازای دەڵێ: {دەرسمان لە خزمەت دەخوێند، کە دەرسەك کۆتایی پێ دەهات، ماوەی پشوودان، تا نۆبەتی دەرسی دووەم دادەهات مامم خەریکی قورئان خوێندن و دەلائیل خوێندن بوو}.

نووسینەکانی: مامۆستا بایەخی بە درەسدانەوە زیاتر داوە لە نووسین، چەند کورتە حاشیەی هەنە لە سەر (جمع الجوامع) و(آداب البحث) و (کەماڵ)ی شەرحی شافیە.

ڕۆشنبیری: مامۆستا لە نامە نووسین دەستێکی باڵای هەبوو، بە هەر سێ زمانی کوردی، عەرەبی، فارسی، بە هۆنراوە و بە پەخشان، نازناوی (ئاشۆکانی) بۆ خۆی دانا بوو، لەو بارەیە بە فارسی دەڵێ:

بکن آسیاب با عین ترکیب      بدان إمضائی مارا أی لبیب

مانای وشەکان: بکن: بکە، ئاسیاب: ئاش، با عین: لەگەڵ کانی، ترکیب: تێکەڵ، بدان: بزانە، إمضائی مارا: ئیمزای من، أی لبیب: هۆشمەند، واتە: ئاش و کانی تێکەڵ بکە و لێکیان بدە، ئیمزای منی لێ دەردەچێت، منیش بە کوردی تەرجومەم کردووە دەڵێم:

تێکەڵ بکە توو ئاش لەگەڵ کانی      چازانی، ئیمزام ئەمجا دەزانی

سەفەرەکانی: ساڵی ١٩٠٥ز بە پێیان چووە ناوچەی (شەمزینان) بۆ بەسەر کردنەوە و سەردانی ئەو کورە گەردییانەی کە لە (بەحرکە) هەڵاتبوون بۆ ئەو وڵاتە، لە ترسی ئەو هێرشەی کە حکومەتی عوسمانی هینابوویە سەریان، لەبەر ئەوەی چەند سوارەك لەوان بەسەر بەندیخانەی هەولێریاندادا لە قەڵات، سەرۆك عەشیرەتەکەیان (کاکل ئاغا) کە بەندکرابوو، لەگەڵ هەموو بەندکراوەکان بەریاندا.هەروەها ساڵی ١٩٥٣ز چووە سەفەری حەج بە ڕێگای (شام) و (بێروت)، لەو سەفەرە مەلا محەممەدئەمینی برازای لەگەڵ بوو.

کۆچی دوایی: مامۆستا تووشی نەخۆشییەکی کوشندە هات، مەلا مەسعودی کوڕی لە (ئاشۆکان) مەلا بوو، لە بەر ئەوەی نەیتوانی هاتووچۆی بابی بکا لە (باقرت)،

ناچار چووە قەراج، ماڵی بابی هێنا ئاشۆکان، چەند مانگێك بە نەخۆشی ماوە، لە ئەنجامدا ساڵی ١٩٥٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی نێوان (دارەبەن) و (ئاشۆکان) لە تەك بابی و هەردوو براکانی خۆی مەلا حوسێن و محەممەد عەلی بە خاك سپێردرا.

مامۆستا دوو کوڕی هەبوو:

١. محەممەد سەعید، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٣ز هاتە دنیا، لە ١٩٤١ز لە فەقێیەتی بە گەنجی لە گوندی (بەحرکە) نەخۆش کەت، بردیانەوە لای بابی لە (بنەسراوە) لەوێ کۆچی دوایی کرد و بە خاك سپێردرا.

٢. مەلا مەسعود، لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

سەرچاوەکان:

١. الإکلیل في محاسن أربیل ٣٠٢ – ٣٠٤.

٢. گۆڤاری هەولێر ١٥٦ – ١٥٧.

## ئەحمەد محەممەد ئامێدی (١٧٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حەجاجی (ئامێدی)یە، ناسراوە بە (تاجەدین أبوالفتح)، ساڵی ٨٢١ك – ١٤١٨ز کۆچی دوایی کرد. کتێبی (حقائق الإرصاد في دقائق الإرشاد}ی داناوە، لە دەوروبەری ساڵی ٨٠٠ك – ١٣٩٧ز تەواوی کرد.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ١/ ٦٧١.

٢. هدية العارفين ٥/ ١٢٢.

٣. معجم المؤلفين ٢/٨٩.

## ئەحمەد محەممەد (ئەبوالسعود) (١٧٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەد ئەبو سعودی ئامێدی یە، نازناوی شەمسەدینە، لە ٩٤٠ك – ١٥٣٣ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای باوکی و چەند زانایانی سەردەمی خۆی

خوێندووە، لەبەر زیرەکی هەر لە گەنجییەوە دامەزرا بە (مدرس) لە قوتابخانەی (ڕۆستەم پاشای صەدری ئەعزەم)، هەروەها دەستی شیعری هەبووە، لەسەر قەسیدەی باوکی شیعری نووسیوە، لە ٩٧٠ك – ١٥٦٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/ ٣٥٧ – ٣٥٨.

٢. مشاهير الكورد ١/٢٥٩.

### ئەحمەد محەممەد ئۆمەرگومبەتی (١٨٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، ئومەرگومبەتە، مەلایەکی زیرەك و بە توانا بووە، ساڵی ١٣٠٥ك – ١٨٨٧ز مەلا بووە لە گوندی (دووسەرە)، لە ١٣٠٦ك نامیلکەی مەلا ئیبراهیمی کۆیی لە پشتگیری شێخ نەبی ماویلی نووسیەوە، لە ١٣١٩ کۆچی مەلا بوو لە (قنطرة)ی پردێ. ناوبراو دەربارەی تەسەووف و جەزبەی سۆفیان دانراوی هەیە.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانیانی کورد ٣/ ٣٢٣.

### ئەحمەد محەممەد ئەحمەد حەڕانی (١٨١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عبدالغنی (حەڕانی)یە، ساڵی ٧٠٢ك – ١٣٠٢ز هاتووتەدنیا. دەستی بە خوێندن کردووە پاشان چوویتە (دیمشق) زانایەکی شەرع زان و لە خواترس بووە، مەزهەبی حەنەفی بووە، کتێبی (بن تەیمیە)ی ڕێکخستووە، لە مانگی جیمادی دوومی ساڵی ٧٤٥ك – ١٣٤٤ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/١٤٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٧.

## ئەحمەد محەممەد ئیسماعیل حەڕانی (١٨٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیسماعیلە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە کوردستانی (تورکیا) لە دەوروبەری ساڵی ٩٦٥ك - ١٥٥٧ز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلایەن چەند مامۆستای بەرز خوێندووە، تا شارەزا بووە لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) هەروەها لەو بابەتە دەرسی داوە.

سەرچاوە: درة الحجال في أسماء الرجال ١/ ٢٤٣.

## ئەحمەد محەممەد ئەحمەد دینەوەری (١٨٣)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی ئەبوبەکرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی دینەوەرە، لە زانایە مەزنەکانی مەزهەبی حەنبەلی بووە لە (بەغدا) لە شەریعەت و مەنتیق و ئاداب زانیاری بەهێزبووە، کتێبی (التحقيق فی مسائل التعليق)ی داناوە، مامۆستا دڵ نەرم و بە ڕوحم بووە، ڕێزی زانایانی پێشووی زۆر گرتووە، کە ناویان دەهات یەکسەر دەگریا، دەیفەرموو زانایانی ئایین لە لایەن خوا ڕێزدارن، تکام وایە منیش لەوان بژمێری، لە ٥٣٢ك - ١١٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٢/ ٢٣٠,
٢. شذرات الذهب ٤/ ٩٨ - ٩٩,
٣. معجم المؤلفين ٢/ ٦٨,
٤. هدية العارفين ١/ ٨٣,
٥. إيضاح المكنون ١/ ٢٦٧,
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٢,
٧. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/ ١٩٠ - ١٩١,
٨. معجم أعلام الكورد ٦٣,
٩. وفيات الأعيان ١/ ١٣١ - ١٣٤.

## ئەحمەد محەممەدئەمین کفتارۆ (١٨٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدئەمینی، کوڕی مەلا موسای، نەقشبەندی، ناسراوە بە (کفتارۆ) ساڵی ١٩١٥ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر کرد لەبەر زیرەکی لە تەمەنی (١٠) دەساڵان فێری زمانی فەرەنسی بوو، دوایی چووە لای (ئەبولخەیری مەیدانی) نەحوی خوێند، لە لای محەممەد سەلیمی حەلوانی تەجویدی خوێند، هەروەها تەفسیر و فیقە و فەرائیزی لەلای چەند زانایانی ئەو سەردەمی خوێند، ئەمجا دەستی دەتەریقەتی نەقشبەندی گرت بە توندی، ئیجازەی مەلایەتی لە خزمەت باوکی وەرگرت.

مەلایەتی: پاش کۆچی دوایی باوکی ساڵی ١٩٣٨ز لە مزگەوتی (أبوالنور) لە دیمشق دەستی کرد بە دەرس دانەوە و وتاردان و ئامۆژگاری خەڵکان، قوتابیان و مریدان بە جارەك ڕوویان تێکرد، بۆ فێربوونی شەریعەت و تەریقەت، ساڵی ١٩٥١ز کرا موفتی (دیمشق) ساڵی ١٩٦٤ز کرا موفتی گشتی (سوریا).

مامۆستا بانگەوازی دەکرد، بۆ جێبەجێ کردنی واجبەکانی خودا، بۆ ڕۆیشتن لەسەر ڕێگای ئیسلام، لەو بابەتە سێ بڕوانامەی دکتۆرای بە چەنگ هێناوە:

١. لەئەندەنوسیا ساڵی ١٩٦٨ز.

٢. لە پاکستان ساڵی ١٩٨٤.

٣. لە سودان ساڵی ١٩٩٤ز.

(مامۆستا کفتارۆ) بۆ بەلاوکردنەوەی ئاینی پیرۆز سەفەری کردووە بۆ ئەورووپا و ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەندام بوو لە یازدە ڕێکخراوی ئیسلامی، شازدە زانکۆ و پەیمانگای ئاینی لە (سوریا) دامەزراندووە. مامۆستا تەنیا ئامۆژگاری گەنجەکان و پیرەکانی ئیسلامی نەدەکرد، بەڵکو قەشە و پەترەك و ئوسقوفەکان دەهاتنە خزمەتی بۆ لابردنی کێشەکانیان و نزیك بوونەوە لە ئیسلام.

مامۆستا بەردەوام قوتابی ولاتان دەهاتنە خزمەتی بۆ دەرسدانەوەو وەرگرتنیان، لە قوتابخانەکانی ئاینی، ئەوەش کارەکی ئاسان نیە مەلایەکی کورد وا هەڵبکەوێت لە ناو جەرگەی عەرەبستان، لە جێگایەك وەك (سوریا) سەرۆکەکەشی، (حافیز) ئەسەد بێت، شانازی بە خزمەتی ئەو مامۆستایە بکا و ڕێز و حورمەتی بگرێ، منیش لەو بابەتە دەڵێم:

بەڵام گەر مەلا ڕوو لە خواکا — بە ڕاستی لە دڵ پشت لە دنیاکا
لە خزمەت ئایین شەو و ڕۆژانی — چاك هەوڵ بدا ئەوەی تووانی
بایەخ نەداتن بە مولك و دەولەت — بە پلەی بەرزی کورسی و سەڵتەنەت
زمان ڕەوان و قەڵەم لە کار بێت — بۆ ئەو ئاینە هەر خزمەتکار بێت
بەرزی دەکاتن خودایی گەورە — سەر شاو و میران دەیکاتە گەورە
دەپارێزیتن، دەیکاتە قەڵات — بۆ خزمەت ئایین، بۆ گەل و وڵات
چاودێری دەکا، لە دوشمنانی — لە نالەباری، ئاخیر زەمانی
وامان لێ بکەی، بە فەزڵت خودا — بۆ ئەو ئاینە، ببین جان فیدا

کۆچی دوایی: (مامۆستا کفتارۆ) لە بەرواری ٢/٩/٢٠٠٤ز لە دیمشق کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٦١.

## ئەحمەد محەممەد محەممەد جزیری (١٨٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی محەممەدی، شافیعی یە، ناسراوە بە (ئەبوبەکر)، خەڵکی جزیرەی بۆتانە لە کوردستانی (تورکیا)، وەکو باوك و مامەکانی زانا و زیرەك بووە، شەرحی لەسەر (المقدمة الجزرية)ی باوکی کردووە، لە تەجوید، ناوی ناوە (الحواشي المفهمة في شرح المقدمة)، ناوبراو سالی ٧٨٠ك – ١٣٧٨ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، وە لە سالی ٨٢٧ك – ١٤٢٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٢/ ١٧٠.

٢. هدية العارفين ١/ ١٢٣.

٣. معجم المؤلفين ٢/ ١٤٨ – ١٤٩.

٤. كشف الظنون ٢/ ١١١٨ – ١٧٩٩.

٥. معجم أعلام الكورد ٦٣ – ٦٤.

## شێخ ئەحمەد محەممەد جزیری ئەنصاری (مەلای جزیری) (١٨٦)

ناو و نژادی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا محەممەدە، خەڵکی جزیرەی بۆتانی کوردستانی (تورکیا)یە هۆزی (ئەنصاری)یە، باوکی سەرۆکی قازییان بووە لە (شام) ماوەکیش سەرۆکی قازییان بووە لە (ئەستەمبۆڵ). ئەو زاتە ساڵی ٩٧٥ك – ١٥٦٧ز لە شاری (جزیرە)ی بن چیای (جودی) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و چەند کتێبی سەرەتایی لە خزمەت باوکی تەواوکرد پاشان وەکو فەقێیانی کوردستان لە چەند شوێن گەڕا بۆوەی خوێندنەکەی بباتەسەر، لەوانە: جزیرە، هەکاری، دیاربەکر، ئامێدی، دوا قۆناغی چووە گوندی (ستڕباس) سەر بە دیاربەکر، لای مەلا طاها، پاش ئەوەی فێری زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بوو، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هێنا، بووە پێش نوێژ و دەرس بێژ، لە گوندی (سەربا) سەر بە دیاربەکر، دوایی باری کرد چووە (حەسەن کێف) کە ئێستا پێی دەڵێن: (شرناق)، لەوێ دەرسی دەدا، پاشان گەڕاوە (جزیرە) لە قوتابخانەی (سوور)ی بەناوبانگ کرا (مدرس)، بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێ کردنی کاروباری ئیسلامەتی تا ساڵی ١٠٥٠ك – ١٦٤٠ز کۆچی دوایی کرد، هەر لەو شوێنە بە خاك سپێردرا.

شاعیراتی جزیری: (شێخ ئەحمەد) جگە لە مەلایەتی شاعیر و ئەدیبێکی پایەدار بووە، چەند جۆرە نازناوی بۆ خۆی تەرخان کردووە، هەروەك لە شیعرەکانی دەدیترێن، جار وایە دەڵێ: (مەلێ) وەکو ئەو شیعرە:

سەلوا ڕەوان زەررین وەرەق، چیچەك (مەلێ) دین صەد نەسەق

(یاقوتها یحکی الشفق، یحکی عقوداً کوکبا)

جاروایە دەلێ، (مەلا)، وەکو ئەو شیعرە:

(مەلا) بێ قامەتا یەکتا، قیامەت من بە چەهڤان دی

فیراقێ ڕووسییابن تە، ژمن جانێ شرین چێدا

جاریش وایە دەنووسی، (نیشانی) وەکو ئەو شیعرە:

وەرە نیشان (نیشانی) دەخۆ بێ پەردە سەحەر

لێ ژ خۆنێ بکە پەڕ هێز، کو شەهیدان چ حیساب

(نیشانی) یا بە مانای نیشانەی تیری گەردوونە، یا نیشانەی چاوە بازەکەی یارە، یا نیشانەی سەرکولمەی یارە، جاریش وایە (نیشانی) و (مەلا) کۆدەکاتەوە بۆ نموونە:

جارەکی گوهت (نیشانی) نە (مەلا)یێ وەرە بانێ

وی ژمن خوست دل و جان و دەهەن و کامەلبالەب

جاریش وایە ناوەکەی خۆی (ئەحمەد)ی نووسیوە، وەك ئەم شیعرە:

ئەر ب کوشتن وەر ب هشتن ئەمر و فەرمانێ تەیە

{(أحمد) عبد رقیق واقف بین العبید}

جاریش وایە (مەلێ) و (مەلا)ی کۆدەکاتەوە، وەکو ئەم شیعرە:

هاتە دەستێ مە درەقصێ وە دگۆ بل ژ (مەلێ)

دەست بکەس دی دسەمایا، کو (مەلا)تێ نادەم

جاریش وایە نیشانی و مەلا و مەلێ کۆدەکاتەوە، بۆ نمونە:

قەصد سەرچەشمەیی حەیوانی حەقیقەت کە (نیشانی)

ب جیهانێ مەبە مەغرور کو جیهان عەینی سەرابە

سەرکەشی شێوەیی ئەڕبابی وەفا نینە ڕحێ من

تەژ دل صوهت (مەلا) بەس ب، (مەلێ) ڕابجفایە

جاریش وایە (نیشان) بەکاردێنێ بەبێ (یێ) یەك ئەلف لە دوا دادەنێ، دەڵێ:

(نیشانا) قاب قەوسەینێ کو قەوس ئاڤێتە ئەبصاران

د تەقویما تەجەللایێ بسەر لێ بوون هیلال ئەبرۆ

(شێخ ئەحمەد) لە چامەی (نیرۆ ژ دەربا خەنجەرێ.....)، حەڤدەجار (مەلا)ی بەکارهێناوە، لەو دیوانە بە ڕاستی شاعیراتی جزیری بە دەردەکەویت، شیعرەکانی بە هەموو جۆرە جوانکاری ڕازاندیتەوە، ناوەڕۆکەکەی پڕە لە (بەلاغە)، خوێندەوار لێ سەرسام دەبی، لەبەر جوانی دارشتنی ووشەکان و ڕێك و پێکی کێشەکە ئەوەی دەماناکەشی نەگا بەشی خۆی تامی لێ وەردەگری.

لەسەرڕا بڕوانی باسی یارە خۆشەویستەکەیەتی کە بە (سەلما) و (سەلوا) ناوی دەبات، بە بەژن و باڵا و قەدی ئەو شۆخە نازدارە هەڵدەڵێ، چەند لەسەر زاری خۆشە ناوی کولمە و خەت و خاڵ و ڕوخسار و چاو و برۆ و پەرچەمی، ئەگەر خۆت نقوم بکەی لە قوڵایی ئەو دەریایە بێ سنوورە، هێز و توانی ئەو مەلەوان بازیەت هەبی، دەبینی لەژێر ئەو هەموو چالاکییانە، مەبەستێکی هەرە گرینگی هەیە، ئەوەش هەموو تەسەووفی ئیسلامییە، خواناسین و خواپەرستییە، دیدار حەزرەتی جەمالی پێغەمبەرە (د.خ) ئەوەی من تێگەیشتوومە تا ئێستا ئەو دیوانە یەکەمین دیوانە، لە کوردی وێنەی دانەنراوە و نەگوتراوە و نەبیستراوە، نە لە سۆران، نە لە بادینان.

جزیری کاتی ئەو دیوانە بە نرخەی تەواو کرد، تەمەنی شەشت و شەش ساڵ بووە، ئەوەش بە لێکدانەوەی ئەبجەدی، لە وشەی: (الله) دەردەچیت، وەکو خۆی لەو شیعرە ئاماژە پێ دەکات:

الله ل من حەیاتە، چ شەککەر و نەباتە

ژ نو (مەلا) جەوان بم گەر بهن کەم گولا گەش

دەبێ ئەلفەکەی دوای لام نەژمێری، ئەمجا ئەلفی یەکەم و دوولام لەگەڵ هاکە، دەکاتە (٦٦)، نووسخەکی ئەو دیوانە لە لامانە کە دەست نووسی مەلا ئەحمەدی زڤنکی

خەڵکی (قامیشلی)یە و لە ساڵی ١٩١٤ز نووسیتیەوە، ئەو دیوانە زۆرجار چاپ کراوە، لەوانە: ساڵی ١٩٠٤ز لە (بەرلین) چاپ کرا، چەند شەرحی لەسەر نووسراوە، ئەوانەی لەلامان هەن ئەوانەن:

١. شەرحی مەلا عبدالسلامی جزیری بە عەرەبی، دوو بەرگە ساڵی ٢٠٠٤ز لە (دهۆك) چاپ کرا.

٢. شەرحی مەلا ئەحمەدی زڤنکی موفتی قامیشلی (سوریە) دوو بەرگە، ساڵی ١٩٥٩ز لە قامیشلی چاپ کرا.

٣. شەرحی هەژار موکریانی، بە کوردی، یەك بەرگە ساڵی ١٣٦١ك – ١٩٤٢ز لە (تاران) چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٢/ ٢٤٣ – ٣٠٣.
٢. العقد الجوهری / پێشەکی.
٣. شەرحی هەژار ١٣ – ٢٨.
٤. شەرحی عبدالسلام ٩/ ١٤.
٥. ژیناوەری زانیانی کورد ٢٠٠– ٢٠٤.
٦. الاكراد في بهدينان ٢٠٣.
٧. معجم أعلام الكورد ٧٢٣ – ٧٢٤.
٨. مشاهير الكورد ٢/ ٢٠٦ – ٢٠٧.
٩. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/ ١٨١ – ١٨٢ ، ٤/ ٣٥٠ – ٣٦٧.
١٠. خۆری ئیسلام (٨) ٢٠٠٠ز، ٥/٣٣٤ – ٣٤٣ – ٣٦٥ – ٣٨٠.

## ئەحمەد محەمەد حصکەفی (١٨٧)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەمەدی، کوڕی عەلی، کوڕی محەمەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی یوسفی کوڕی حوسێنی، کوڕی یوسفی، کوڕی موسایە، خەڵکی (حصن

کیفا)یە، ناسراوە بە: (ابن منلا) واتا کوڕە مەلا (مەلازادە)، ساڵی ٩٣٧ك ١٥٣٠ز لەشاری (حەلەب) هاتووتە دنیا، لەخزمەت باوکی پەروەردە بووە، دوو جار بۆ خوێندن چویتە (دیمشق)، ساڵی ٩٥٨ك ١٥٥١ز چووە (قوسطەنطینییە) ئوسطرلابی خوێند، ئیجازەی (بوخاری) لە مەلا سەیدعبدالرحیمی عەبباسی وەرگرت، مامۆستا ئەدیب و ڕۆشنبیر و نووسەر و زمان زان و زمان ڕەوان بوو.

چەند کتێبی دانراوی خۆی هەنە، لەوانە:

١. الروضة الوردية في الرحلة الرومية.
٢. طالبة الوصال من مقام ذلك الغزال.
٣. عقود الجمان في وصف نبذة من الغلمان.
٤. منتهى أمل الاديب من الكلام على مغنى اللبيب.
٥. حاشيه على موضع من أنوار التنزيل.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٠٠٠ یان ١٠٠٣ك – ١٥٩١ یان ١٥٩٤ز بە داخەوە مامۆستا لە ماڵی خۆی بە دەست چەند جەردە و دزان کە هاتبوونە سەر ماڵەکەی گیانی لە دەست دا.

سەرچاوەکان:

١. خلاصة الأثر ١/ ٢٧٧ – ٢٨٠.
٢. معجم المؤلفين ٢/ ١٣٣.
٣. إيضاح المكنون ٢/ ٥٧١.
٤. شذرات الذهب ٨/ ٤٤٠ – ٤٤٢.
٥. هدية العارفين ١/ ١٥١.
٦. كشف الظنون ٢/ ١٠٢١.
٧. الأعلام ١/ ٢٢٤ – ٢٢٥ /١٠/ ٣٠ – ٢٨٨.
٨. معجم أعلام الكورد ٦٥.

## ئەحمەد محەممەد خالید بروجەردی (١٨٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی کوڕی خالیدە، نازناوی (ئەبوبەکرە)، خەڵکی (بروجەرد)ە، دەرسی لە لای عەلی کوڕی محەممەدی عامیری نەهاوەندی خوێندیە، فەرموودەناسەکی بەناوبانگ بووە، لە بەغدا دەرسی داوە، ساڵی ٤٠٠ك - ١٠٠٩ز کۆچی دوایی کردیە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/ ١٤٤.

٢. الأنساب ١/ ٣٤٧.

## ئەحمەد محەممەد خەلیل هوزبانی (١٨٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەد خەلیلە، نازناوی (ئەبولعەبباسە) عەشیرەتی (هوزبانی)یە، لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، یەکە لە زانایە بەناوبانگەکانی ئەو شارە، شەریعەتی لە لای مامۆستا خضر نەصر عەقیل هەولێری[٢] خوێندووە، ناوبراو سەفەری (مەککە)ی پیرۆزی کرد، گەڕاوە کۆچی دوایی کرد.

(ئیبن مستەفی) دەڵێ: {مامۆستا ئەحمەد (ڕەبعە) بووە، واتە: نە کورت نە درێژ، ئەویش لە یەکی (ڕەبعە) دەگێڕتەوە، ئەوی تر لە یەکی تر، پێ بە پێ، بەڕستە بێ پسانەوە، تا دەگاتە ئەنەسی کوڕی مالیك (ئەویش ڕەبعە بووە) دەڵێ: {پێغەمبەر (د.خ) ڕەبعە بووە}، ئەم جۆرە حەدیسە نایابە لەناو زانایانی فەرموودەناس ناودەبردیت، بە: (المسلسل)، وە هەروەها ئەم حەدیسە تورمذی ریوایەتی کردیە سەیری: (تحفة الأحوذي ٣/٥٨) بکە، تێیدا هاتووە: (کان رسول الله صلی الله علية وسلم ربعة، لیس بالطويل ولا بالقصير).

سەرچاوە: تاریخ أربیل ١/ ٣٧٣.

---

[٢] لە ساڵی -٥٦٧ك - ١١٧١ز کۆچی دوایی کردووە.

## ئەحمەد محەممەد دەشتی (١٩٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەبوقاسمی، کوڕی بەدرانی کوردی دەشتی یە سالّی ٦٣٤ك – ١٢٣٦ز لە (حەلەب) هاتووتەدنیا، ماوەکی زۆر خەریکی خوێندن و بیستنی فەرموودە بووە، دوایی چوویتە (میصر) لەوێ دەرسی داوە، سالّی ٧١٣ك – ١٣١٣ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/ ١٧٢.

٢. شذرات الذهب ٦/ ٣٢.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١.

٤. معجم أعلام الكورد ٦٢.

## ئەحمەد محەممەد دێلژەیی (١٩١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حوسێنە، سالّی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە گوندی (دێلژە) سەر بە قەرەداغ هاتووتە دنیا، ماوەك لە قوتابخانەکانی ناوچەی خۆیانی خوێند، پاشان چووە (بەغدا) ماوەك لە لای محەممەد فەیزی زەهاوی ماوە، تا ئیجازەی دایێ، ئەمجا چووە (ئەستەمبۆڵ) لەوێ کرا قازی (شارباژێر)، پاشان وازی هێنا، گەڕاوە (سلێمانی) دەستی کرد بە دەرس دانەوە، مامۆستا زاتەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، بە توانا بووە، ئاوقەرانی مەلا عبدالرحمانی پێنجوینی بووە.

هەندێ دانراوی هەیە، لەوانە:

١. الرسالة الكلاميه: سەرەتایەکەی بە (فیقول الفقير الى الله الغنى أحمد بن محمد حسين السليماني ثم الدهليزي) دەست پێ دەکا، سالّی ١٢٨٤ك – ١٨٦٧ز تەواوی کردووە، لە بەغدا پێشکەشی بە ئەحمەد صیدقی ئەفەندی کردووە.

٢. فتاوی.

مامۆستا لە ١٢١٨ك – ١٩٠٠ز کۆچی دوایی کردووە، مەلا محەممەد سەعیدی کوڕی لە مزگەوتی (حمخانە) جێگری بوو.

سەرچاوەکان:


١. تاریخ السلیمانیة.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/ ٤٤٧ – ٣٥٠.

٣. معجم المؤلفین ١/ ١٣٢.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٨٢ – ٨٣.

٥. بنەماڵەی زانیاران ٤٦١.

٦. أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الاسلامیه ١٧٦.


## ئەحمەد محەممەد زڤنکی (١٩٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا محەممەدە، کوڕی ئیبراهیمە، ساڵی ١٣١١ك – ١٨٩٣ز لە شاری (سعێرت) سەر بە دیاربەکر هاتووتەدنیا.

لە (زڤنکی) ناوچەی بۆتان نیشتەجێ بووە، لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد هەر لە لای ئەو تەواوی کرد و ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٩١٣ز باوکی کۆچی دوایی کرد، مەلا ئەحمەدی لەجێ دانیشت، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، پاشان ناکۆکی لە نێوان خزمەکانی پەیدابوو، ئەویش باری کرد بۆ (جزیرە)، دوایی چووە گوندی (عین دبوار) لەوێ لە دەوزێی دیجلە، سێکووانەی سنووری عێراق و سوریا و تورکیا، لە لایەك مەلایەتی دەکرد، لەلایەکی دیکەش، کڕین و فرۆتنی دەکرد بۆ دابین کردنی ژیانی ماڵ و منداڵەکەی، ماوە لەوێ تا محەممەدی کوڕە گەورەکەی جوانەمەرگ بوو، لەوکاتە گوندەکەی لە پێش چاو کەت، چووە گوندی (خەزنە) لە قوتابخانەی شێخ ئەحمەدی خەزنەوی کوردی دەرسی دەداوە، دوایی کرا (موفتی) قامیشلی، پاشان خوای گەورە هەردوو چاوەکانی لێ ستاندەوە، چووە شاری (حەلەب) لە ماڵەوە دانیشت.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٦/١٢/١٩٧١ز ماڵئاوایی یەکجاری لە برادەران کرد، لە گۆڕستانی (تەل مەعرِوف) بە خاك سپێردرا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: سەید عەلی فندکی و مەلا سولەیمانی هوسری و مەلا یوسفی شاعیر و مەلا ئیبراهیمی برای.

مەلا ئەحمەد شەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری کردووە بە عەرەبی، ناوی ناوە (العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزري) لە ١٤/٩/١٩٥٩ز تەواوی کردووە، دوو بەرگە، خۆی دەڵێ: {مەلا عبدالسلام ناجی جزیری زۆر یارمەتی دام بۆ نووسینی ئەم شەرحە، بەڵام پێش تەواوبوونی کتێبەکە بە داخەوە کۆچی دوایی کرد، ئەم شەرحە لە ٥/١٠/١٩٥٩ز یەکەم جار لە قامیشلی چاپ کرا، جاری دووەم (ضیاء الدین) کوڕی مەلا محەممەد ئەویش لە بنەماڵەی زڤنکی یە ساڵی ١٩٨٧ز چاپی کرد. مەلا ئەحمەد خەتی خۆش بووە، دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری نووسیتەوە لە ساڵی ١٩١٣ز، ئەو نوسخە ئێستا لەلای ئێمەیە.

سەرچاوەکان:

١. العقد الجوهري / پێشەکی.
٢. دیوانی جزیری، دەستنووسی مەلا ئەحمەد زڤنکی.
٣. دەنگی زانا (٤٧)، ٢٠٠٠ز، ٥٣ – ٥٦.

## ئەحمەد محەممەد سعێرتی (١٩٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی عەلی، کوڕی موحسینی ئەسعەردی یە، لە خانەقای شاری (حومص) دەرسی داوە، ساڵی ٧٤٧ك – ١٣٤٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١.
٢. الدرر الكامنة ١/ ١٥١.

## ئەحمەد محەممەد سنەیی (١٩٤)

ناو و نژادی: ناوی ئەحمەدە، کوڕی شێخ محەممەد قەسیمی، کوری شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ مەحمودی، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەلامە، کوڕی شێخ مصطەفای، کوڕی شێخ شەمسەدینی، کوڕی شێخ عبدالغفارە، لە (٦)ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٠٨ك – ١٧٩٤ز هاتووتەدنیا، یەکەم مامۆستای ئەو بنەماڵەیە کە لە (بەغدا) نیشتەجێ بووە، خوێندنی تەواوکردووە، ئیجازەی مەلایەتی لە خزمەت باوکی وەرگرتووە، پاشان چوویتە (بەغدا) لە مزگەوتی حوسێن پاشا کرایتە پێش نوێژ و دەرس بێژ، دوای خۆی کوڕ و نەوەکانی تا ماوەك هەر لەو مزگەوتە بوون.

دانراوەکانی: مامۆستا چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. خلاصة المنطق، پیشکەشی بە عەلی ڕەزا پاشا کرد لە بەغدا.
٢. حاشیە لەسەر بەیزاوی و ئەبو سعود.
٣. نامیلکە لە مانای (لااله الا الله).
٤. نامیلکە لە مانای (هو الذی خلق السموات والارض في ستة أيام)
٥. هۆنراوەی کوردی و گۆرانی.

نووسینەوەکانی: مامۆستا چەند کتێبی بە دەستی خۆی نووسینەوە، لەوانە:

١. الورقات: لە (أصول الفقه).
٢. الرسالة الكميلية.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ١٢٧٤ك – ١٨٥٧ز لە (سنە) کۆچی دوایی کرد، بە عەرەبی مێژوویان بۆ داناوە: (لقد دخل الفردوس والله أحمد)، بە لێکدانەوەی ئەبجەدی دەکاتە: ١٢٧٤ك.

کوڕەکانی:

١. شێخ جەعفەر، لە ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز کۆچی دوایی کرد.
٢. شێخ طاها: لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد (٥/١٤٨، ١٥٩)، (٦/٣٢٥، ٣٢٨).

## ئەحمەد محەممەد شارەزوری (١٩٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبدالله، کوڕی قاسمی، کوڕی مظفری، کوڕی علی شارەزوری یە، ساڵی ٥٢٧ك – ١١٣٢ز لە (موصڵ) هاتووتەدنیا، ساڵی ٥٧٣ك – ١١٧٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: تاریخ أربیل ٢/ ٥٧٣.

## ئەحمەد محەممەد شەوەکی (١٩٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەلا محەممەدی، کوڕی مەلا عبدالقادرە، خەڵکی گوندی شەوەکە، دەکەوێتە بن زورگی سێنك لە ڕووی ڕۆژئاوا نزیك (مەلا ئۆمەر)، مامۆستا یەك بووە لە زانایە بەناوبانگەکانی چەرخی خۆی.

ساڵی ١٨٤٧ز لە گوندی (خۆران)ی خۆشناوەتی لە خزمەت باوکی خوێندووە، مامۆستا ساڵی ١٢٧٨ك – ١٨٦١ز مەلا بوو، لە گوندی (بەحرکە) خۆی دەڵێ: لەو کاتە شێخ محەممەد ئاغا لە بەحرکە بوو، وە دووعای خێری بۆدەکات، دەوری حوکمڕانی تەقیەدین پاشا بوو، هەر لەوێ ساڵی ١٢٨٠ك لە مانگی شەوال دەستی کرد بە نووسینەوەی بەرگی سێیەمی (تحفە)، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ١٢٨١ك تەواوی کرد، وادیارە زۆری پێ نەچووە لە بەحرکە باری کردووە، چونکە لە کۆتایی نووسینەوەی کتێبی (رفع الخفا) دەڵێت: {ساڵی ١٢٨٢ك لە (شەوەك) تەواوم کرد}، هەروەها دەڵێ: {لەو ساڵە لەبەر بێ بارانی و گرانی زۆر کەس وڵاتی هەولێریان بەجێهێشت لەبەر هیشکە ساڵی و نەبوونی}، مامۆستا لە کۆتایی بەرگی دووەمی (تحفە) دەڵێ: {لە مانگی صەفەری ساڵی ١٢٨٦ك دەستم پێ کرد بە نووسین لە گوندی (شەوەك) هەر لەوێ ڕۆژی پێنج شەمەی مانگی جیمادی یەکەم ساڵێ ١٢٨٧ك تەواوم کرد}، دیارە هەر

ەرگەك دەوری ساڵەکی خایاندووە، وە بەرگی سێیەمی پێش دووەم نووسیتەوە، وە لە سێیەم پتر پەلەی نووسینەوەی کردووە لە دووەم.

مامۆستا هاوچەرخ بووە لەگەڵ مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی و مەلا سەید ئەحمەدی زیارەتی و مەلا محەممەدی موفتی دێرە و قازی داودی دێری، ئەوەش بە پێی بەڵگەنامەك کە بەڕێز عبدالرقیب یوسف بۆی هێنام، مۆری مەلا ئەحمەد (مدرس) بەحرکە و ئەو زاتانەی پێوەیە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٢٢.

٢. بەرگی دووەمی (تحفة) خەتی مامۆستا.

٣. بەرگی سێیەمی (تحفة) خەتی مامۆستا.

٤. رفع الخفا شرح ذات الشفا، خەتی مامۆستا.

٥. بەڵگەنامەی عبدالرقیب یوسف.

٦. نامەی مەلا ئەنوەر عبدالکریم محەممەد (شەوەکی).

## ئەحمەد محەممەد صالح بروجردی (١٩٧)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی (ئەبو لعەبباسە) کوڕی محەممەدی کوڕی صاڵحە، خەڵکی (بروجرد)ە، دەرسی لەلای ئیبراهیمی هەمەدانی و چەند زانایان خوێندووە، چوویتە (بەغدا) دەرسی داوە، لە کۆتایی ساڵی ٣٦٨ك – ٩٧٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الانساب ١/ ٣٤٧.

## ئەحمەد محەممەد مەرعەشی (١٩٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حەجاجی، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (مەرعەش)ە، دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە، ئەبوحوسێن محەممەد ئەحمەد جەمیع غەسانی لە کتێبی فەرهەنگی مامۆستایەکانی ناوی ئەو زاتەی تۆمارکردووە.

سەرچاوە: الانساب ٥/ ١٤١.

## ئەحمەد محەممەد عەلی دنیسری (١٩٩)

ناوی ئەحمەدە، نازناوی شەهابەدینە، ناسراوە بە: (ابن العطار) کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی یە، خەڵکی (دنێسر)ی نزیك (ماردین)ە، لە ٧٤٦ك – ١٣٤٥ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (قاهیرە) دابەزیووە، شارەزا بووە لە ڕێزمان و زمانی عەرەبی، لە ساڵی ٧٩٤ك – ١٣٩٢ز کۆچی دوایی کردووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: لطائف الظرفاء، نزهة الناظر في المثل السائر، فرائد الاعصار في مدح النبي المختار، دیوانی شعر.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/ ٣٣٣.
٢. کشف الظنون ١/ ٢٣٥ /٢/ ١٢٣١.
٣. معجم المؤلفين ٢/ ١٣٠.
٤. هدية العارفين ١/١١٦.

## ئەحمەد محەممەد عبدالکریم خەواهیر زادە (٢٠٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبدالکریمە، (خەواهیرزادە) واتە: خوارزا، باوکی خوارزای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی بووە، ناوبراو ساڵی ١٩٢٠ز لە (پێنجوین) هاتووتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سلێمانی) و (سەنگاو) و (قەرەداغ)، ئاودیوی (ئێران) بوو چووە (سەقز) و (موکریان) و (مەهاباد) و (شنۆ) و (لاجان)، ماوەك لای مەلا حوسێنی کوڕی ڕاژی ماوە، پاشان گەڕاوە (پێنجوێن) لە خزمەت مەلا عارف دەرس بیژی مزگەوتی پاشا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، لە ساڵی ١٩٥٩ز کە پێنجوێن سووتا بە دەستی ڕژێمی ئاو ئاوچووی بەعس، مامۆستا باری کرد بۆ لای (مەریوان) و (سنە)، ساڵی ١٩٦٥ز گەڕاوە سلێمانی لە مزگەوتی مەلا سەید ئەحمەدی نەقیب کرا پێش نوێژ و (واعیز).

مامۆستا حەزی لە جێبەجێ كردنی وێردەكانی تەریقەتی نەقشبەندی بوو بۆ ئەو مەبەستە چووە خزمەت شێخ عەلائەدینی (بیارە) تەریقەتی لێ وەرگرت، كە شێخ كۆچی دوایی كرد، بووە مریدی سیراجەدین شێخ عوسمانی كوڕی، ئەو دەستووری پێدا و كردیە (خەلیفە). مامۆستا هەروەكو مەلا و سۆفی بوو، هەروەها شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، بۆ نموونە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئەڵێم بە دڵ لە ناخەوە | گەلێ گەلێ بە داخەوە |
| نەما گوڵێ لە گوڵشەنا | یا میوەیە بە باخەوە |
| هەر دڕك و داڵی جەهلە بەس | لە پاییزی زەمانەدا |
| سەوزەیی عیلم و مەعریفەت | نەما بە دەشت و شاخەوە |

كۆچی دوایی: لە شەوی هەینی ١٢/٨/١٩٨٣ز كۆچی دوایی كرد، لە گۆڕستانی گردی (سەیوان) لە پاڵ شێخ مەعروفی نۆدەی بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەكانی: دیوانی شیعر بە ناوی گەنجینەی گەوهەر، باخچەی بۆن خۆشان، الوسیلة.

سەرچاوە: دەنگی زانا ١٤ – ١٥، ١٩٩٨ز ، ٧٣ – ٧٤ ش م خ

## ئەحمەد محەممەد گەرموی (٢٠١)

ناوی ئەحمەدە، كوڕی محەممەدی، كوڕی داودی، كوڕی محەممەدە، خەڵكی گوندی (گەرەوان)ە، سەر بە (رواندز)، یەكە لە مەلایە چاكەكانی كۆتایی سەدەی (١٢) و سەرەتای سەدەی (١٣)، حاشیەكی بەناوبانگی لەسەر (سعداللە)ی گچكە هەیە، سەرەتایەكەی بە: (الحمدلله زيّن تراكيب العرب بزينة الإعراب)، دەست پێ دەكات لە كۆتایی دا دەڵێ: (الحمدلله الذي منّ علينا بالإتمام...) لەو حاشیە زۆر ڕەخنە لە مەلا حامیدی سوسەیی دەگرێت، كە ئەویش لە پێشدا حاشیەی لەسەر هەمان كتێب نووسیوە.

مامۆستا حاشیەی تری هەیە لەسەر حاشیەی (ئیبراهیم ناصیرەدینی لیقانی) و (ئیبن قاسم) لەسەر شەرحی تەصریفی عیززی (سەعدینی)، شایانی باسە نوسخەكی دەست

خەتمان لەو کتێبە لە لایە، هەروەها کتێبی (الإستعارة)ی داناوە، ساڵی ١٢٠٥ك – ١٧٩٠ز تەواوی کردووە، ساڵی ١٢٦٣ك دووبارە نووسیتیەوە.

مامۆستا کوڕێکی هەبووە ناو مەلا عەزیز، ئەویش کوڕێکی هەبووە ناو عبدالرحمان، ئەویش کوڕێکی هەبووە، ناسراوە بە: (مەلا صابیری نازەنینی)، ساڵی ١٣٢٤ك کتێبی (خادیم)ی لە گوندی (بەحرکە) نووسیتەوە لە خزمەت مەلا عوسمانی (شەوەکی)، ساڵی ١٣٢٦ك مەلا صابیر لە کەرکوك بووە. وە هەروەها مامۆستا کوڕی تری هەبووە ناو (ئەحمەد) ساڵی ١٢١٩ك لە بەغدا دانیشتووە.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانیانی کورد ٢/ ١٤٢ – ١٤٦، ٣/ ١٧ – ٢١٤ – ٢١٥، ٤/ ٣٩ ، ٧/ ٢٦

### ئەحمەد محەممەد موبارەك دینەوەری (٢٠٢)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی موبارەکی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی بەکروسی، کوڕی سەیفی دینەوەری یە، پاشان لە (بەغدا) دابەزیوە، لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد دەرسی داوە و فەتوای داوە، زانایەکی شەرع زان و بە دین و خواپەرست بووە، لە ڕۆژی سێشەمەی (٥)ی مانگی صەفەری ساڵی ٥٧٠ك – ١١٧٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الذیل علی طبقات الحنابله ٣/ ٣٣٨.

### ئەحمەد محەممەد محەممەد جزیری (٢٠٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی محەممەدی، کوڕی عەلی کوڕی یوسفی جزیری یە، ساڵی ٧٨٠ك – ١٣٧٨ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پێگەیشتووە دوایی چوویتە (برووسە) دەرسی داوە، سەرپەرشتی مزگەوتی گەورەی کردووە دوایی چوویتە (میصر) لەوێ سەفەری حەجی کردووە، لە ٨٢٩ك – ١٤٢٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم اعلام الكورد ٦٢٨

## ئەحمەد محەممەد مەحمود حەڕانی (٢٠٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی مەحمودی، کوڕی موعیززە، خەڵکی (حەڕان)ە لە (بەغدا) دانیشتووە، یەك بووە لە زنایەکانی ئەهلی تەسەووف لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٣٨ك – ١٢٤٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/ ١٨٩.

٢. سیر اعلام النبلاء ١٣/ ٢٥٠.

## ئەحمەد محەممەد نەصر سعێرتی (٢٠٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی نەصری (سعێرت)یە، ساڵی ٦٣٦ك – ١٢٣٨ز لە (ئەسکەندەریە) هاتووتەدنیا، خەریکی فێربوونی فەرموودە بووە، لەو بابەتە لە (ئەسکەندەریە) و لە (قاهیرە) دەرسی داوە، هەروەها مامۆستا بازرگانیشی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ١/ ١٧٩.

## ئەحمەد محەممەد هەکاری (٢٠٦)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەبو زەهرەی، کوڕی عەطییەی (هەکاری)یە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، بەدین بووە، بنەماڵەکەیان هەر لە کۆنەوە لەسەر زانیاری ڕۆیشتوونە و خەریکی خوێندن و دەرس دانەوە و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بووینە، لە شەوی هەینی (١٧)ی مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٧٦٠ك – ١٣٥٩ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الکامنة ١/١٥٦.

٢. شذرات الذهب ٦/١٨٨ – ١٨٩.

٣. معجم أعلام الکورد ٦٣.

## ئەحمەد محەممەد یوسف گۆران ( ٢٠٧ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی یوسفی، کوڕی عبداللّٰەی، کوڕی عومەری کوڕی عەلی، کوڕی خضری کوردی یە، ناسراوە بە (شەهابەدین گۆرانی شافیعی) لە ٨١٠ك – ١٤٠٧ز کۆچی دوایی کردووە، (منهاج الوصول)ی بەیزاوی کردیتە هۆنراوە، ناوی ناوە (نظم منهاج الوصول).

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٢/ ١٨٨.

٢. معجم المؤلفين ٢/ ٢١٢.

٣. هدية العارفين ١/ ١١٩.

٤. إيضاح المكنون ٢/ ٢٩٠.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٧.

٦. معجم أعلام الكورد ٦٩.

## ئەحمەد مەحمود ئەحمەد ( تەختی دووەم ) ( ٢٠٨ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەحمودی، کوڕی شێخ ئەحمەدی عەللامەیە، ساڵی ١١٠٦ك – ١٦٩٤ز لە گوندی (تەخت) سەر بە (سنە) هاتوتەدنیا. لە قوتابخانەی باب و باپیرانی خۆی خوێندووە، زۆر ئاگادار بووە، دنیاداری نەکردووە، خەریکی خواپەرستی بووە، ساڵی ١١٨١ك – ١٧٦٧ز کۆچی دوایی کردووە، دوو کوڕی مەلای هەبووە: محەممەد قەسیم و محەممەد سەعید.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٣٣.

## ئەحمەد مەحمود ئەحمەد چاومار (٢٠٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەحمودی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی محەممەدە، لەبەر چاوجوانی ناسراوە بە (چاومار)، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٢٠ك – ١٨٠٥ز هاتووتەدنیا لە شاری (سلێمانی)، لە خزمەت باوکی خوێندووە، ماوەك چووە خزمەت شێخ مەعروف نۆدەیی، ئیجازەی وەرگرت بووە مەلای مزگەوتی موفتی نزیك (سەرا)، چەند زانا لە لایان خوێندووە، لەوانە: محەممەد فەیزی زەهاوی، مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی. ساڵی ١٢٥٥ك – ١٨٣٩ز کرا سەرۆکی زانایانی (سلێمانی) وەماوەی چەند ساڵان موفتی (سلێمانی) بوو.

(دەگێڕنەوە) لە زیرەکی مامۆستا، جارەك فەقێیەکان جێیەکی (عصام الدین وەضع)یان نەزانی مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی یەك بوو لەوانە، هانای بردە بەر مامۆستا ئەویش لەوکاتە دەست نوێژی دەشوشت، یەکسەر فەرمووی: {ڕۆڵەم لە فلان جێ (نێوان دوو ووشەی بۆی دیارکرد)، فلان وشەی بۆی دابنێ (ووشەیەکی دیارکرد) ڕێك دەکەوی، وەیان کرد بە ئاسانی زانرا}، پاشان نوسخەی دەست نووسی ڕاستی ئەو کتێبەیان دەست کەوت، تەماشایان کرد، ئەوەی مامۆستا فەرمووی دەقاو دەق وەك خۆی وابوو، جا زیاتر سوپاسیان کرد، مامۆستا لە ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدئەمینی کوڕی جێگری بوو، دوای ویش مەلا عبدالعزیزی کوڕی.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٢٦١ – ٢٦٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧٦ – ٧٧.

## ئەحمەد مەحمود دێلزیان (٢١٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مەحمودی، کوڕی عومەرە شینی، کوڕی مەلا عەرەبە، زانایەکی مەزن بووە، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەداوە، لە چاکەی خەرج کردووە، دەرسی لە لای مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا محەممەدی خەتێ وەرگرتووە، ئەو بەرەبابە چەند پشت لەسەر مەلایەتی ڕۆییینە، دانراوی دەست نووسیان

زۆر بووە، بە داخەوە لە ئەنجامی هێرشە درِنـدەکانی (رِوسـیا) بۆسـەر ناوچـەی (رِوانـدز) هەموو سووتان.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٧٦ك – ١٨٥٩ز کۆچی دوایـی کـرد، مـەلا رەسـولی کورِی جێگری بوو، ئەویش لە لای باوکی و مـەلا غـەزالی زێـوەیی و مـەلا عبـدالغفوری گەڵاڵی و مەلا عبدالله ی پیرەبابی خوێندنەکەی بردەسەر، دوایی کۆچی دوایی کـرد مـەلا شەفیعی کورِی جێگری بوو، لەمەودوا بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٤٢١ – ٤٢٢.

## ئەحمەد مەحمود سیواسی (٢١١)

نـاوی ئەحمـەدە، کـورِی مـەحمودە، خـەڵکی شـاری (سیواس)ــە، سـاڵی ٨٠٣ك – ١٤٠٠ز کۆچی دوایی کردووە. دانراوی خۆی زۆرن، لەوانـە: عیـون التـواریخ، شـرح المصباح، النجاة مـن شـر الصـفاة، شـرح الفـرائض السـراجية، عيـون التفاسـير للفضـلاء السماسير.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/ ١٧٢ ، ٤/ ٣٠٩.
٢. كشف الظنون ١/ ٨٩٥.
٣. هدية العارفين ١/ ١١٨.
٤. معجم أعلام الكورد ٦٤.

## ئەحمەد مەحمود قوربانی (٢١٢)

ناوی ئەحمەدە، کورِی حاجی مەحمودی، کورِی حاجی مصطفای، کورِی قوربانی، کورِی عبـدالله ی (سیتەبەسـەر)ە، عەشـیرەتی (هەمەوەنـد)ە، سـاڵی ١٨٨٦ز لـە شـاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە منداڵییـەوە لەبـەر خوێنـدن دانـرا، لـە لایـەن کۆمـەڵێك لـە زانایەکانی سلێمانی و (بەغدا)ی خوێند، فێری زمانی عـەرەبی و فارسـی و تـورکی بـوو، جگە لە زمانە شیرینە کوردییەکەی خۆی. ناوبراو زەوقـی شـیعری هـەبوو، لـە (تەجویـد)

شارەزا بوو، لەو بابەتە کتێبی (الرسالة الموجزة في الهمزة المخففة)ی داناوە، شێخ عومەری قەرەداغی و مەلا محەممەد طاهیری مائی پەسندیان کردووە، لە ١٩٦٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: أعلام كورد العراق ٨١ – ٨٢.

## ئەحمەد مەروان دینەوەری (٢١٣)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی ئەبوبەکر، مەروانی دینەوەرییە، زانایەکی فەرموودەناس و شەرع زان بووە، مەزهەبی مالیکی بووە، لە (میصر) دابەزیوە هەر لەوێ ساڵی ٢٩٣ك – ٩٠٤ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون: فضائل مالك بن أنس، القناعة، مجالسة وجواهر العلم (٢٥ بەرگە).

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ٢/ ١٥٩١.
٢. هدية العارفين ١/ ٥٥.
٣. معجم المؤلفين ٢/ ١٧٤ – ١٧٥.

## ئەحمەد مصطفی (تەختی یەکەم) (٢١٤)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی مصطفای، کوڕی شەمسەدینی، کوڕی عبدالغفاری، کوڕی مەلا گۆشایشی، کوڕی شێخ محەممەدی مەردۆخی یە، ساڵی ١٠١٦ك – ١٦٠٧ لە گوندی (تەختە)ی سەر بە شاری (سنە) هاتووتەدنیا، لە لای باوکی خوێندووە و تەواوی کردووە، دەرسی داوە لەبەر زۆرزانی ناوبراوە بە (عەللامە)، مێژووی ژیاننامەی خۆی داناوە، ساڵی ١١١٤ك – ١٧٠٢ز لە (تەخت) کۆچی دوایی کرد. دوو کوڕی زانای هەبوو: ١. شێخ وەسیم، ٢. شێخ مەحمود، ئەوە باپیری شێخ قەسیمە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧٣ – ٧٤.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٣٠.

## ئەحمەد مصطفی گەزنەیی ( ٢١٥ )

نـاوی ئەحمـەدە، کـوڕی مصـطەفـای، کـوڕی عبـدالقادرە، سـاڵی ١٩٠٥ز هاتووتەدنیا، لە منداڵییەوە لەبەر خوێندنیان دانا، دوایـی چـووە (گردعازەبـان) لای مـەلا محەممەد ئەمینی گردمامکی، ماوەك چووە (شاوێس) لای مـەلا ڕەشـیدی موکریـان، پاشـان چووە (عەوێنە) لای مەلا عوسمانی خورمەڵە، چووە (بنەسراوە)ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، دوایی چووە (پردێ) لای مەلا عومەری (ڕەش)، پاشان هاتە (هەولێر) لای مەلا عبدالله ی بێتواتە لە مزگەوتی حـاجی قـادر دەبـاغ، مـاوە لـەوێ تـا ئیجـازەی مەلایـەتی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (پێمەڕەبڕ)، دوایی چووە (شاوێس)، لەوێ باری کرد بـۆ (گەزنە)ی بەڕانەتی، بەردەوام بوو لەسەر کاروباری مەلایەتی و دەرس دانەوەی فەقێیان، تا ساڵی ١٩٨٩ز لە (گەزنە) کۆچی دوایـی کـرد. مامۆسـتا چـەند کـوڕی هەنـە، کـوڕی گەورەی دکتۆر مەلا محەممەدە، ماوەك لە بەغدا پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو، دوایی گەڕاوە (هەولێر) کرا مامۆستای زانکۆ، پاشان کرا وەزیری ئەوقاف لە (سلێمانی) دوایی گـەڕاوە زانکۆ، تا ئێستا چەند کتێبـی ئاینی و مێژوو و کۆمەڵایەتی دەرکردووە.

سەرچاوە: کەشکۆڵی دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئەحمەد محەممەد مەعروف نۆدەیی ( کاك ئەحمەدی شێخ ) ( ٢١٦ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی شێخ محەممەد مەعروفی، کوڕی شـێخ مصـطەفـای، کـوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، لە نەوەی شێخ عیسـای بەرزنجەیە، سـاڵی ١٢٠٧ك - ١٧٩٢ز لەشاری (سلێمانی) هاتووتە دنیا، لەخزمەتی باوکی خوێندووە، هەر لەلای ئـەو پـەروەردە بووە و پێگەیشتووە، زانەیەکی پایەدار بووە لەزانیاری سەرەوە و نهێنی تەسەووف، وابـاوە کە نوشتەی گولـلە بەندی بۆ کەسێ کردبا ئەگەر چووبا شەڕو شۆڕ لە تەقەمـەنی و ئـازار چەپارە دەدرا، من خۆم ئەو گولـلە بەندەم نەدیتووە بەڵام لـە زۆر کەسـم بیسـتووە، کـاك ئەحمەد سەرپەرشتی پەرتوکخانەکەی بـاوکی دەکـرد، بەداخـەوە کـاتێ ئینگلیـز عـیراق و کوردستانی داگیر کرد، بەشی هەرە زۆری سووتان.

کاك ئەحمەد ساڵی ١٢٩٢-١٢٩٣ك ١٨٧٥-١٨٧٦ز سوپایەکی نارد بەسەرۆکایەتی شێخ سەعیدی نەوەی بۆ بەرگری کردنی سوپای رووسەکان، کەنیازی داگیرکردنی کوردستانیان هەبوو، کاك ئەحمەد ساڵی ١٣٠٥ك-١٨٨٧ز لەتەمەنێکی درێژ و پڕ تاعەت کۆچی دوایی کرد لە گۆرستانی مزگەوتی (سلێمانی) بەخاك سپێردرا.

شێخ ڕەزای طالەبانی لە مەتحی نووسیوە، هەروەك لە دیوانەکەی هاتووە، دەڵێ:

مەربوتە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی

خۆزگەم بە سەگی قاپیەکەی ئەحمەدی کاکی

ئەو قودرەتی ساداتە کە سوککانی سەماوات

شەڕیانە لەسەر سەجدە ئەبەر مەرقەدی پاکی[1]

ئەو مەرقەدی والایە کەوەك عەرشی موعەللا

مەحفوظە بەزوواری مەلەك دەوری شوبباکی

بۆ دەست و عەسا نازکەکەی داخە دەروونم

قوربانی عەسای دەستی دەبم سۆل و سیواکی

دنیا لەدوای حەزرەتی شێخ زێڕ و زەبەر بێ

وەك تاجی کەی و جامی جەم و بەختی زوحاکی

دەرحەق بەحەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار

قوربانی حەفیدانی دەبم بابی و داکی

بەم حاڵە پەرێشانە وەباز ئەشهەدوبیللا

شیعرت تەرەب ئەنگێزە (ڕەزا) شاعیری چاکی

دانراوەکانی کاك ئەحمەدی شێخ: جەنابی شێخ نوسین و کتێبی زۆرن، لەوانە:

---

[1] لەوانەیە مەبەستی لە سەجدە: دانیشتن و دوعا بێت، بەرانبەر و ڕۆخ گۆڕەکە، دەنا سەجدە تەنیا بۆ خودای گەورە دەبردرێ، بۆ کەسی دی نابی.

١. آداب الدنيا في التصوف والأخلاق: فارسيه.
٢. مكتوبات: فارسييه
٣. العقائد الصغرى.
٤. العقائد الكبرى.
٥. فك القفول: شەرحی (سلم الوصول)ی باوکییەتی.
٦. رسالة القلب.
٧. فتح الرؤف في معاني الحروف.
٨. فتح الجواد في معاني الجهاد.
٩. حاشية على الكمال شرح الشافية.
١٠. منظومة معاني الحروف.
١١. رسالة المعفوات.
١٢. رغبة الطالبين في فضيلة العلم والعلماء العاملين: لە ١٢٥٤ك تەواوی کردووە.

کوڕەکانی: ئەم زاتە دوو کوڕی هەبوو:

١. بابا عەلی: لە زووەوە جوانەمەرگ بوو.
٢. شێخ محەممەد: کۆچی دوایی کرد، شێخ سەعیدی کوڕی جێگری بوو، لە ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز سەفەری (ئەستەمبۆڵی) کرد، لە ١٣٢٠ك – ١٩٠٢ز چووە سەفەری حەج، بە (بێروت)دا، گەڕاوە کوردستان، لەساڵی ١٣٢٨ك – ١٩١٠ز چووە (موصڵ) لەوێ داروودەستەکەی لە بازاڕ لەگەڵ بازرگانەکان، ناکۆکییان لێ پەیدابوو، بە شەڕهاتن، لە ئەنجامدا شێخ سەعید بە دەستی چەپەڵی تاوانبارێك شەهید کرا.

چەند شاعیران سەردولکەیان پێدا هەڵگۆتووە، لەوانە کاکە حەمەی (ناری)یە، دەڵێ:

حەفیدی حەزرەتی کاکە ئەحمەدی قوتبی سلێمانی

کە بێ ئیمدادی فەیزی بەرگی گوڵ نەشئە و نوما ناکا

لە شاری (موصلا) وەصڵی بە ئەنواری شەهادەت بوو

بەڵێ ڕوتبەی شەهادەت تەرکی ئالی مصطەفا ناکا

کوڕی ویش شێخ مەحمودی حەفیدە مەلیکی کوردان، لە مەودوا باسی دەکەین بە یارمەتی خودا.

سەرچاوەکان:


١. معجم المؤلفين ٢/١٥٨.

٢. مکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ / پێشەکی.

٣. هدية العارفين ١/١٩٢ – ١٩٣.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایان ١/١٩١ – ١٩٩، ٣٤٧ – ٣٤٨، ٣/٣٧–٤٠.

٥. مشاهير الكورد ٣٤٦.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٧٤ – ٧٦.

٧. دیوانی شێخ ڕەزای طاڵەبانی ١٢٠ – ١٢١.

٨. تاريخ السليمانية ٢١٩ – ٢٢٤.

٩. الأكراد في بهدينان ٧٩.

١٠. معجم أعلام الكورد ٦٤ – ٥٥٨ – ٦٧٧.

١١. أعلام كورد العراق ٥٩٤ – ٥٩٥.

١٢. نور بەخش ٩ – ١٠.

١٣. مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/١٧٣ – ١٨٣.

١٤. جامع كرامات الأولياء ١/٥٨١ – ٥٨٢.

١٥. بنەماڵەی زانیاران ٣٤٥ – ٣٥٤.

١٦. الأعلام ٢/ ١٧.

١٧. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٨٨ – ٦٩٥.

١٨. تاریخ مشاهیر کورد ٣/ ٥٩٧ – ٦١٥.

## ئەحمەد موجەلی (٢١٧)

مامۆستا ئەحمەد موجەلی، لە ناو چیایەکانی (موجەل)ی دۆلی موجەل نزیك شاری (شنۆ) ژیاوە، ناسراوە بە (شێخی کورد ئەشنەوەیی) دەرسی لەلای (حبیب الله میرزاجان)ی شیرازی خوێندووە، خۆشی دەرسی بە مەلا عبدالکریمی چۆڕی کوڕی ئەبوبەکری (مصنف) دایە، هەروەها زەینەدینی بەلاتی پشدەری لەلای ئەو زاتەی خوێندووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٨.

## ئەحمەد موسا شنۆیی (٢١٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی موسای، کوڕی حوسێنە، ناسراوە بە (ئەبولعەبباس)، خەڵکی شاری (شنۆ)یە، ساڵی ٤٥٠ك – ١٠٥٨ز هاتووتەدنیا. ماوەك لە لای باش مەلایەکانی ولاتی خۆی خوێند، دوایی چووە (بەغدا) لەوێ لەلای مەلایە ناودارەکان خوێندنەکەی بردەسەر، مامۆستا زاتەکی بە دین و شەریعەت زان بوو، لە دووی مانگی ذي الحجەی ساڵی ٥١٥ك – ١١٢٢ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك ئەبوسەعیدی مامۆستای خاوەنی کتێبی (التنبیه) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعیةی ئەسنەوی ١/٨٨.

٢. طبقات الشافعیة الکبری ٣/٣٨٨.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٥.

٤. مشاهیر الکورد ١/٨٥ – ٨٦.

٥. معجم أعلام الکورد ٧١.

## ئەحمەد موسا هەولێری (٢١٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی موسای کوڕی یونسی کوڕی محەممەدی کوڕی مەنەعەی کوڕی مالیکی کوڕی محەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصیمی کوڕی عائیدی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی ئیبراهیمی (هەولێر)یە، سالی ٥٧٥ك – ١١٧٩ز لە (موصل) هاتووتەدنیا، یەکە لە زانایە بەرزەکانی مەزهەبی شافیعی، سالی ٦١٠ك – ١٢١٣ز هاتە (هەولێر) لەوێ سولتان (مظفر) کردیە (مدرس)، هەر لەو کاتە بوو کتێبی (التنبیه)ی شەرح کرد، وە (احیاء علوم الدین)ی ئیمامی غەزالی دووجار کورت کردەوە، (ئیبن خەلەکان) لە کتێبی (وفیات الأعیان) دەڵێ: {مامۆستای وامان نەدیوە، دەرسی (احیاء العلوم)ی هەر لەبەر دەداوە}.

مامۆستا چووە سەفەری حەج پاشان گەڕاوە (هەولێر)، سالی ٦١٧ك – ١٢٢٠ز گەڕاوە (موصل) ماوەك لەوێ دەرسی داوە، تا ڕۆژی دووشەمەی (٢٤)ی مانگی ڕەبیعی دووەم سالی ٦٢٢ك – ١٢٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. وفیات الأعیان ١/١٩٠.
٢. البدایة والنهایة ١٣/١٣.
٣. هدیة العارفین ٥/٩١.
٤. أربیل في مختلف العصور ٧٢.
٥. أربیل في العهد الأتابكي ٢٥١ – ٢٨٥.
٦. كشف الظنون ١/٤٨٥.
٧. مشاهیر الكورد ١/٨٢ – ٩٦.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٢ – ٤٣.
٩. معجم المؤلفین ١٩٠ – ١٩١.
١٠. شذرات الذهب ٥/٩٩.

١١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٢٥٨.
١٢. سير أعلام النبلاء ١٣/١٣١.
١٣. طبقات الشافعيةی ئەسنەوی ٢/٥٧٢.
١٤. الأعلام ١/٢٤٦ – ٢٧٥.
١٥. معجم أعلام الكورد ٣٨ – ٦٩ – ٧٠ – ٧١ – ٧٨.

## ئەحمەد هبةالله جزیری (٢٢٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی هبة اللهی، کوڕی ئەحمەد (جزیری)یە، نازناوی (ئەبوعەبباسە)، زانیاری لە قورئانی پیرۆز بە هێزبووە، کتێبی لە بابەت خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز وەك لە شێخ حەسەنی بەصری بیستراوە هەیە، مامۆستا لە سەدەی شەشەمی کۆچی ژیاوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/١٩٨.
٢. معجم أعلام الكورد ٦٨.

## ئەحمەد یەحیا جزیری (٢٢١)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یەحیای، کوڕی محەممەدی، کوڕی بەدری جزیری یە، لە دەوروبەری ساڵی ٦٧٠ك – ١٢٧١ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دابەزیوە، لە زانیاری قورئانی پیرۆز و لە شەریعەت دەستی باڵا بووە، لە ئەوپەڕی چاکی و بەدینی و ئاقڵی و حەق بێژی دا بووە، پشتی بە دنیا نەبەستاوە، لە مانگی مەولودیٚ ساڵی ٧٢٨ك – ١٣٢٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥١ – ٥٢.
٢. الذيل عل طبقات الحنابلة ٤/٤٠٨.
٣. شذرات الذهب ٦/٨٦.

## ئەحمەد یەحیا شارەزوری ( ٢٢٢ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یەحیای، کوڕی محەممەدی شارەزورییە، لە ٦٥٤ك – ١٢٥٦ز هاتووتەدنیا، زانای شەریعەت بووە، نووسەرەکی چاك بووە خاوەن هەست و بیر بووە، شاعیر بووە، لە خەت و مۆسیقا شارەزا بووە، لە لای مەلیکان بەڕێزبووە، دەرسی بە کوڕانی وەزیر و قازی و کاربەدەستان دەدا، لە ٧٤١ك – ١٣٤٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/١٩٦.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢.

## ئەحمەد یەحیا هەولێری ( ٢٢٣ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یەحیایە، ناسراوە بە (ئەبو عبدالله الكمال الأربلي)، یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی بە تایبەت لە شەریعەت زۆر ئاگادار بووە، بەسیەتی بۆ پایە بەرزی کە ئیمامی نەوەوی یەك بووە لە فەقێیانی ئەو، ناوبراو سالّی ٦٦٥ك – ١٢٦٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية ٨٥.

٢. أربيل في مختلف العصور ٩٣.

## ئەحمەد یوسف ئەخلاطي ( ٢٢٤ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عومەرە، نازناوی: (محب الدین)ە، خەڵکی (ئەخلاطە) لە خزمەت چەند زانایانی خوێندووە، بڕوانامەی بە کۆمەڵێك زانایان داوە، مامۆستا ماوەك خەریکی بازرگانی بوو، پاشان وازی هێنا، ڕوویدا زانست و خزمەتی ئایین، لە ٧٦٧ك – ١٣٦٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٢.

## ئەحمەد یوسف بەحرکەیی (٢٢٥)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفە، بابی مریدی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی بووە، بۆیە ناسراوە بە (سۆفی وسوو) عەشیرەتی گەردی یە، مەلایەکی باش و هێمن و لەسەرخۆ و قسەخۆش بووە، خەتی جوان بووە.

خوێندنی: ماوەك لە (بنەسراوە)ی گەورە لە خزمەت مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی خوێند، ماوەکیش چووە (بیرێژ) لای مەلا حوسێنی ئاشۆکانی، پاشان چووە (شەقڵاوە) لای مامۆستا طاها، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (بیرێژ)، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا و دەرسی فەقێیانی دەداوە، وە پێش نوێژ و ووتارخوێن بووە لە مزگەوتی (دیانا)، وە لەو کاتی نامەیەکی بۆ مەلا فتح الله أفندی ناردیە، بەروارەکەی ٢٥/١١/١٩٣٦ ز یە، دانەیەکی ئەو نامەیەمان هەیە، پاشان لە (کەرکوك) کرا پێش نوێژی سوپا، دوایی خانەنشین کرا، دوا عەمری تووشی نەخۆشی (شەکر) هات، لە ئەنجامدا چەند پەنجەی پێی بڕانەوە.

بەشێك لە فەقییەکانی ئەمانەن: مەلا محەممەد مصطفا بەحرکەیی و مەلا عبدالقادر عارەبکەندی و مەلا عوسمان مەلا عبدالله هەرشەمی.

کۆچی دوایی: لە دەوروبەری ساڵی ١٩٨١ز لە کەرکوك کۆچی دوایی کرد، پەرتوکخانەکی دەوڵەمەند لە کتێبی ئاینی لە دوا بە جێما، چەند کوڕی خوێندەواری هەیە، بەشێك لە دەرەوەن، بەشێك لە کەرکوك، بەشێك لە هەولێر.

ناوبراو دوو مێژووی ئەبجەدی بۆ کۆچی دوایی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی داناوە، بە عەرەبی:

یەکەم: (أفينا مات قطب المرشدين؟)

١٤٢+٤٤١+١١١+٦٣٤ = ١٣٢٨ك

دووەم: (كمل أبوبكر الراجي وهو قطب المرشدين)

٩٠+٢٣١+٢٤٥+١٧+١١١+٦٣٤ = ١٣٢٨ك

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١٢٠

## ئەحمەد یوسف حەڕانی ( ٢٢٦ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە (دیاربەکر) نیشتەجێ بووە لە شەریعەت و عەرەبی و بەلاغە زانیاری بەهێز بووە، شاعیرەکی چاك بووە، زانای بەناوبانگ (جمال الدولة)ی نەسطوری مەسیحی نامەکی هۆنراوەی بەهێز و پڕ لە پرسیاری بۆ نارد بە مەرجێك ئەگەر مامۆستا توانی وەڵامی ڕاستی هەموویان بداتەوە، (جمال الدولة) ئیسلام بێت، کە نامەکە بە دەست مامۆستا گەیشت، یەکسەر وەڵامی پرسیارەکانی هەر هەموو داوە، ڕەوانی کرد بە نامەکی هۆنراوە، زۆر لە نامەی کابرا جوانتر بوو، مەسیحییەکە کە نامەکەی خوێندەوە سەرسام بوو، لە ترسی ئەوەی قسە کورت بێت بەرانبەر خەڵکان، یا بە سەر خۆدا بشکێتەوە و چاو مۆن بکاەوە، وڵاتەکەی بە جێهێشت و باری کرد و هەڵات، بۆ شوێنەك کەس سۆراغی نەزانی.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/٢٠٠.

٢. معجم المؤلفين ٢/٢١١.

٣. معجم أعلام الكورد ٦٩.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣ – ٥٤.

## ئەحمەد یوسف حصکەفی ( ٢٢٧ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، لە شاری (حەلەب) دانیشتووە، ماوەك (قازی) بووە، لە ٨٩٥ – ١٤٨٩ز کۆچی دوایی کردووە.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: كشف الدرر في شرح المحرر: چوار بەرگە، شرح طوالع الأنوار، شرح فصوص الحكم، شرح حرز الأماني، تحفة الفوائد في شرح العقائد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢١٠.

٢. كشف الظنون ٢/١١١٦.
٣. إيضاح المكنون ١/٤٠٠.
٤. الضوء اللامع ٢/٢١٨.
٥. الأعلام ١/٢٦٠ – ٢٦١ /٢/– ٢٨٨.
٦. معجم أعلام الكورد ٦٩.

## ئەحمەد یوسف دیاربەکری (٢٢٨)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفی، کوڕی سعداللە یە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، لە دەوری ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز لە (دیاربەکر) هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە زانیاری قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) شارەزابووە، سەفەری بۆ (بەغدا) و (دیمشق) و (میصر) و (حیجاز) کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/١٩٨.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣.

## ئەحمەد یوسف فارقی (٢٢٩)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفی، کوڕی عەلی، کوڕی ئەزرەقە، خەڵکی شاری (میافارقینە) لە کوردستانی تورکیا، ساڵی ٥١٠ك – ١١١٦ز لەو شارە هاتووتەدنیا.

مێژووناس و گەڕیدە بووە، (تاريخ الفارقي) لە مێژووی میافارقین و دیاربەکر داناوە، لە ٥٤٣ك کرا چاودێری ئەوقافی میافارقین، لە ٥٦٢ك کرا چاودێری ئەوقاف (حصن كيفا)، مامۆستا گەڕیدە بووە، لە چەند شوێنان گەڕاوە، بۆ وەگرتنی زانیاری، و شارەزایی وڵاتان و شارستانیەکان، لە ٥٤٣ك چووە (بەغدا)، لە ٥٤٤ك چووە (دیاربەکر) و (موصل)، لە ٥٦٥ك چووە (ماردین) و (دیمشق)، لە ٥٤٨ك چووە (تەفلیس)، هەروەها سەفەری عێراق و ئێران و جزیرە و ئەرمینیە و شامی کردووە، چوویتە (ئەخلاط)و (رەی) و (نوشەهر) و (تەبریز) و (حومص) و (حەما) و (حەلەب) و (مەنبەج)

و (حەڕان) و (رأس العين) و (مەداین) و (دێرحەلـەب) و (بـەرجیس)، هـەروەها چـوویتە (جۆرجیا) لـەگەڵ مەلیکی ئەوجێ یە کۆبوویتەوە، لـە ٥٧٢ك – ١١٧٤ز کۆچـی دوایـی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/ ٢١٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٧٠.

## ئەحمەد یوسف کەواشی (٢٣٠)

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفی، کوڕی حەسەنی، کوڕی رافیعی، کوڕی حوسـێنی، کوڕی سووەیدانە، مەزهەبی شافیعی بووە، ناسراوە بە (موفق الدين أبو العبـاس) خـەڵکی (کەواشا)یە، یاقوت حەمەوی دەڵێ: {کەواشا: ناوێکی نوێیە، لە پێشدا ناوی (اردمشـت) بوو، قەڵاتێکی بەهێزە، دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری (دیجلە) لـەسـەر لوتکـەکانی کێـوی (جودی)، سەر بە (موصلە) جێگایەکی زۆر عاسێیە تەنیا یەك ڕێی تەسکی یەك نەفـەری بـۆ دەچی}.

ئەو زاتـە سـاڵی ٥٩١ك – ١١٩٥ز لـە (کەواشـا) هاتووتـەدنیا، پاشـان چـووە (موصل) لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی خوێند، بەرەبەرە چووە پێش تـا زەریـف شـارەزا بوو لە تەفسیر و زانستەکانی قورئانی پیرۆز، دوایی چووە (دیمشق) ماوە لەوێ لای ئیمامی سەخاوی خوێند، دوایی چووە (حەج) هاتەوە (قودس) گەڕاوە (موصل) دەسـتی کـرد بـە خواپەرستی.

خووڕەوشتی: لە چەرخی خۆی بێ وێنە بوو لە خواپەرسـتی، ڕاسـتگۆ و ڕاسـت کردەوە بوو، ڕووی خۆی نەدەدا کەسانی دنیا، سوڵتان دەهاتە لای لەبەری هەڵنەدەستا و ڕووی نەدەدایێ و شتی لێ وەرنەدەگرت، چەند کـەراماتی لێ دەگێڕنـەوە، دە سـاڵ پـێش کۆچی دوایی چاوەکانی تاریك بوون، یەك لە فەقێیەکانی ناو ئەبوبەکرە دەڵـێ: {مامۆسـتا کـە چـاوەکانی ئـەوها لێ هـات، هـەژدە مـانگ بـوو نەچـوو بوومـە خزمـەتی، کـە لـە

دەرگاکەمدا، پێش ئەوەی ناوی خۆم بدەم، یەکسەر فەرمووی: {کێیە؟ ئەبوبەکرە؟}، ئەوەشم بە یەکێ دانا، لە کەراماتەکانی.

کۆچی دوایی: لە بەرواری (١٧)ی مانگی جیمادی دووەمی ساڵی ٦٨٠ک – ١٢٨١ز لە شاری (موصل) کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی بە نرخی هەنە، لەوانە:

١. تبصرة المتذكر وتذكرة المتبصر: ئەوە تەفسیرە گەورەکەیتی، لەو تەفسیرە بە تێری باسی ئیعراب و وقف دەکا، نووسخەی بۆ (مەککە) و (مەدینە) و (قودس) ناردووە. دانەرەکانی تەفسیری جەلالەین هەردووکیان سوودیان لەو تەفسیرە وەرگرتووە.

٢. تلخيص التفسير مايتعلق بالرواية والتأويل: ئەوە تەفسیرە گچکەکەیتی، لە (٢٣) رەبیعی دووەمی ساڵی ٦٤٩ک – ١٢٥١ز تەواوی کردووە.

٣. روضة وجنة المناظر.

٤. كتاب الوقف.

٥. كشف الحقائق في التفسير: لەوانەیە ئەوە ناوەنجی بێت.

٦. المطالع في المبادئ والمقاطع.

٧. المواقيت في القرآن.

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرين ١/٤٨.

٢. منهل الأولياء ٢/١٢٩.

٣. بغيه الوعاة ١/٤٠١

٤. شذرات الذهب ٥/٣٦٥ – ٣٦٦.

٥. معجم المؤلفين ٢/٢٠٩ – ٢١٠.

٦. كشف الظنون ١/٤٥٧ – ٤٨٠.

٧. إيضاح المكنون ١/٢٢٢.

٨. هدية العارفين ١/٩٨.

٩. الأعلام ١/٢٥٩ – ٢٦٠ /٦/ ٩٧ /١٠/ ٣٥.

١٠. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٣٠٧ – ٣١٠.

١١. الأكراد في بهدينان ١٩٠.

١٢. معجم البلدان ٤/٤٨٦.

## ئەحمەد یوسف ماردینی ( ٢٣١ )

ناوی ئەحمەدە، کوڕی یوسفی، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (ماردین)ە، زانیاری تایبەتی هەبووە لە (عەروز) لەوبابەتە هۆنراوەی هەیە، هاتووچووی وولاتی (شام)ی کردووە لە ٧١١ك – ١٣١١ز هاتووتەدنیا، لە ٧٧١ك – ١٣٦٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/١٩٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٣.

## ئەرسەلان داود سوڵتان صەلاحەدین ( ٢٣٢ )

ناوی ئەرسەلانە، کوڕی داودی، کوڕی سوڵتان صەلاحەدینی ئەییوبییە، ساڵی ٥٩١ك – ١١٩٥ز لە قەڵاتی (بیرە) نزیك (حەلەب) هاتووتەدنیا، ئیجازەی فەرموودەی لە مامۆستا محەممەدی ئەصفەهانی وەرگرتووە، ئەمجا دەستی کردووە، بە دەرسدانەوە، لە (دیمشق) و لە (قاهیرە) خۆشی ئیجازەی داوە، لە ٦٧٨ك – ١٢٧٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم اعلام الكورد ٩٥.

## ئیدریس عەلی بەدلیسی (٢٣٣)

ناوی ئیدریسە، کوڕی عەلی یە، نازناوی حیسامەدینە، خەڵکی (بەدلیسە)ناسراوە بە (حەکاری – هەکاری) مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (ئێران) خوێندنی تەواو کردووە، لە عەرەبی و فارسي و تورکی زمان ڕەوان بووە، چەند پلە و پایەی حکومی پێدراوە، لە دەوری سوڵتان سەلیمی عوسمانی دەستووری قانوونی فیدراڵی بۆ کوردستان دارشت، بەڵام لەو سەردەمی لەبەر ناکۆکی لە نێوان هۆز و سەرکردەکانی کورد بەداخەوە سوودیان لێ وەرنەگرت، مامۆستا شاعیر بووە، نازناوی شیعری (ئەمیرك)ە.

لە زیرەکی مامۆستا دەڵێن: شا ئیسماعیلی صەفەوی مەزهەبی شیعەی لە (ئێران) ڕازاندەوە و پەری پێدا، مەلا ئیدریس ناوی دەبرد بە (مەزهەب ناحەق) واتە: مەزهەبێکی بەتاڵ و ناهەق، کە شا ئیسماعیل ئەوەی بیست، لە دووی نارد، کە مەلا هات (شا) سەرکۆنەی کرد و گلەیی زۆر لێکرد و پێی ووت: {ئێمە برادەری کۆن بووین، نابا ئەو قسە بڵاوبکەیەوە، (مەلا) وەڵامی داوە: جەنابی شا، قسەکەیان خراپ بۆ توو گێڕایتەوە، من نووسیتم (مذهبنا حق) واتە: مەزهەبی ئێمە ڕاستە و ڕەوایە. (شا) دڵی خۆش بوو و ڕازی بوو.

کۆچی دوایی: سالی ٩٢٧ك – ١٥٢١ز لە ئەستەمبۆڵ کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی: لە چەند بابەتان دانراوی هەیە، لەوانە:

١. الحق المبين في شرح الحق اليقين في علم الكلام (فارسی)یە.
٢. رسالة الآباء عن مواقع الوباء، وجواز الفرار عنه.
٣. شرح فصوص الحكم للشيخ محي الدين.
٤. شرح گلشن راز للعطار (فارسی)یە.
٥. مرآة الجمال (فارسی)یە.
٦. هەشت بە هەشت: هەشت هەزار بەیتە شیعرە، لە باسی هەشت سوڵتانی عوسمانی، هەریەکی هەزار بەیتی بۆ داناوە.

ناوبراو دوو کوڕی هەبوو: محەممەد و مصطەفا عەلی.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٧.

٢. معجم المؤلفين ٢/٢١٧.

٣. هدية العارفين ١/١٩٦.

٤. إيضاح المكنون ١/٤١٠.

٥. مشاهير الكورد ١/١٠٤ – ١٠٦.

٦. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣٤٥ – ٣٥٠.

٧. كشف الظنون ١/٨٤٠.

٨. الأكراد في بهدينان ١٢٦ – ١٢٧.

٩. معجم أعلام الكورد ٩١ – ٩٢.

١٠. شەرەفنامە / پەراوێز ٥٧٨.


## ئەسباه میر محەممەد حەڕانی (٢٣٤)

ناوی ئەسباهە، ناسراوە بە (میر)، کوڕی محەممەدی کوڕی نەعمانە، خەڵکی (حەڕانە) مەزهەبی حەنبەلی بووە، چوویتە (بەغدا) لە خزمەت شێخ عبدالقادری گەیلانی شەریعەتی خوێند، هەر لەو قوتابخانەیە ماوە، زاتەکی چاك و بەخێر بوو، لە تەمەنی سەد ساڵیدا شەوی هەینی مانگی مەولودی ساڵی ٦٠٧ك – ١٢١٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. شذرات الذهب ٥٣٣.

٢. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٦٣.


## ئیسحاق ئەفەندی خەرپوتی (٢٣٥)

مامۆستا ئیسحاق ئەفەندی، خەڵکی شاری (خەرپوتە) لە کوردستانی تورکیا، ماوەك دەرسی داوە، پاشان ساڵی ١٢٩٦ك – ١٨٧٨ز چەند پلەی ئەوقافی پێدرا،

ماوەی چل ساڵان لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٠٩ك – ١٨٩٢ز لە تەمەنی نۆهەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: شمس الحقيقة، أسئلة وأجوبة حكمية، زبدة علم الكلام، ضياء القلوب، مفتاح العيون.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢٣٣.

٢. هدية العارفين ١/٢٠٣.

٣. مشاهير الكورد ١١٣.

## ئیسحاق رەزیق ڕەسعەنی (٢٣٦)

ناوی ئیسحاقە، کوڕی ڕەزیقە، ڕەسعەن: کورتکراوەی (رأس العين)ە، گوندێکە سەر بە (دیاربەکر) فەرموودەی لە ئەبو نەعیمی مەلاتی وەرگرتووە، خۆشی دەرسی بە ئیبراهیمی کوڕی خالید و ئەبو عوروبەی حەڕانی داوە، ساڵی ٢٥٩ك – ٩٦٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٣/٧٠.

٢. اللباب ٢/٢٥ – ٢٦.

## ئیسحاق مەنصور نەصیبی (٢٣٧)

ناوی ئیسحاقە، کوڕی مەنصوری، کوڕی سیارە، نازناوی (ئەبو یەعقوبە)، خەڵکی شاری (نەصیبین)ە، بەشێکی زۆر لە زانایانی جزیرە دەرسیان لەلا خوێندووە، لە مەلا چاکی و ڕاستگۆیی و بڕوایێکراوی ناوبانگی دەرکردووە، لە مانگی ذي الحجەی ساڵی ٢٧٣ك – ٨٨٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٥/٣٩٤.

٢. شذرات الذهب ٢/١٦٣.

## ئیسحاق هەولێری (٢٣٨)

مامۆستا ئیسحاق، یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی (هەولێر) لە مزگەوتی گەڕەکی (تەعجیل) دەرسی دەداوە، پاشان ساڵی ١٢٩٤ك – ١٨٧٧ز کرا ئەندامی کۆڕی داواکاری دادگای سەرەتایی لە (هەولێر)، مامۆستا ئیسحاق نامیلکەکی لە مەنتیق هەیە، کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالرحمانی کوڕی بووە جێگری بۆ پێش نوێژی و دەرس دانەوە، دوایی کرا ئەندامی کۆڕی بەڕێوەبەرایەتی قازییان لە (هەولێر)، دوایی کرا (موفتی) بۆیە ئەو مزگەوتە ئێستاش ناودەبردرێ بە مزگەوتی (موفتی) ئەویش کۆچی دوایی کرد، مەلا عبداللە ی کوڕی جێگری بوو، ساڵی ١٩٢١ کرا سەرۆکی شارەوانی لە (هەولێر)، خوا لێ خۆشبوو زوبێر بیلال دەڵێ: {بە کۆچی دوایی ئەو زاتە لەو بنەماڵە کەس نەما دەرس بداتەوە، لەو مزگەوتە}.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٨١ – ٨٢.
٣. هەولێرم وادیوە ٧٧ – ٧٩.

## ئیسحاق یەحیا ئورمەوی (٢٣٩)

ناوی ئیسحاقە، کوڕی یەحیایە، خەڵکی (ورمێ)یە، پاش تەواوکردنی خوێندنی چووە (ئەستانە) لەوێ کرا (مدرس)، مامۆستا لە تەفسیری قورئانی پیرۆز شارەزا بوو، ساڵی ١٠٨٢ك – ١٦٧١ز لە ئەستانە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١١٤.
٢. معجم أعلام الكورد ١٠٩.

## ئیسحاق یەحیا دیاربەکری (٢٤٠)

ناوی ئیسحاقە، کوڕی یەحیای، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی ئیسماعیلە، نازناوی (عفیف الدین)ە، خەڵکی (دیاربەکرە)، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە دەوروبەری ساڵی ٦٤٢ك – ١٢٤٤ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دابەزیوە، مامۆستایەکی فەرموودەناس بووە، دەرسی لەلای یوسف خەلیل و مەجدەدین کوڕی تەیمییە خوێندووە، خەریکی دەرس و بەلاوکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بووە، زاتەکی پاك و خاوێن و دیمەن جوان و قیافەت ڕێك بووە، لە شەوی دووشەمەی (١٢)ی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ٧٢٥ك – ١٣٢٥ز کۆچی دوایی کرد، لە کێوی (قاسیۆن) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١٢٧.
٢. شذرات الذهب ٦/٦٦.
٣. معجم المؤلفين ٢/٢٣٩.
٤. الدرر الكامنة ١/٢٠٩.
٥. معجم أعلام الكورد ١٠٩.

## ئەسعەد خالید مەحوی (٢٤١)

ناوی ئەسعەدە، کوڕی شێخ خالیدی، کوڕی مەلا محەممەدی (مەحوی) شاعیرە، ساڵی ١٨٩٨ز لە بنەماڵەکی ئایین پەروەر و سەر بە تەریقەت لە شاری سلێمانی هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی ناردیانە حوجرەی (خواجە ئەفەندی) ماوەکی زۆر لەوێ خەریکی خوێندن بوو، ساڵی ١٩١٥ز چووە (ئامادەیی) پاشان مەراقی فێربوونی ئایین لە دڵی چەسپا، گەڕاوە ناو فەقێیان، ماوەك لە

لای شێخ بابا عەلی ماوێك لە لای شێخ عومەری قەرەداغی بووە، ئەمجا چووە لای مەلا حوسێنی (پسکەند)ی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کرا (مدرس) لە مزگەوتی (خومخانە) لە سلێمانی، پاشان گەڕاوە خانەقاکەی خۆیان لە جیاتی باوکی – کە زەعیف و بێ هێز ببوو- کاروباری تەریقەت و دەرسی فەقێیانی ئەنجام دەدا.

ناوبراو هەستی نەتەوایەتی بەهێز بوو، بۆیە لەلایەن حکومەت ئازار دەدرا، چەند جار لە (سلێمانی) و لە (کەرکوك) تووشی بەندیخانە دەهات و دەگیرا هەر لەبەر ئەوە بوو، لەگەڵ چەند برادەران ئاوارەی (ئێران) بوو، مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیرێکی دڵسۆز و زمان پاراو و قەڵەم لە کار بوو شیعری ئاینی و دڵداری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری هەنە.

نموونەی شیعری دڵداری:

بهێنە جامی مەی ساقی بە پێوان    گوڵ و بولبول بە جووتێ بوونە مێوان
هەناسەم لائەخا زولفی خەیاتەی    شوعاعی دێتە دەر خۆری بەیانیان
ئەوا مرد (ئەسعەد)ی بێچارە یاران    لە دەست جەور و جەفا کاری ڕەقیبان

بەڵام دوا عەمری وازی لە هەموو شت هێنا، تەنیا خواپەرستی دەکرد، هەروەکو خۆی لەو بابەتەیە دەڵێ:

تۆ کە مردی (ئەسعەد)ە، با گەنجی قارونت هەبێ
خاوەنی کفنێکی ڕووتی، ئێ کە ئەم بەدکارە بۆچ؟

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٢٥/٤/١٩٧٦ز ماڵئاوایی لە دۆست و برادەران کرد، لەسەر وەصیەتی خۆی لە گۆڕستانی گردی (سەیوان) لە تەك مامۆستا حوسێنی پسکەندی بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەکانی: دیوانی شیعر: ساڵی ١٩٧٠ز لە چاپخانەی ڕاپەڕین لە سلێمانی چاپ کرا، العقائد الرحمانية، شرح العقائد الرحمانية، تحسين البيانية.

سەرچاوەکان:
١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/٤٦١ – ٤٧٢.
٢. کاروان ١٦/ ١٩٨٣ز، سۆران مەحوی.

**ئەسعەد صەدرەدین حەیدەری ( ٢٤٢ )**

ناوی ئەسعەدە، کوڕی عبداللەی، کوڕی صبغە اللەی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی حەیدەری دووەمە، لە لای باوکی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە، ماوەکیش لە لای مەلا ڕەسوولی (شەوەکی) خوێندووە، موفتی حەنەفیەکان بووە لە (بەغدا)، چل ساڵ لەوێ دەرسی داوە، داود پاشای والی بەغدا، پێش ئەوەی ببێتە وەزیر، ماوەی حەڤدە ساڵان لای مامۆستا ئەسعەدی خوێندووە، هەروەها کوڕەکانی خۆی صبغەاللە و عبداللە و عبدالقادر لە خزمەت ئەو پێگەیشتوونە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا مصطەفای کورانی کوردی، مەحمود بەگی عبدالرحمان پاشای بابان، محەممەد ئەسعەد نائیب زادە، عبدالغفور کەرکوکی، مەلا عومەر ئەفەندی هەولێری، عبدالغنی جەمیل موفتی بەغدا، محەممەد سەعید موفتی حەنەفیەکان لە بەغدا.

مامۆستا تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزووری وەرگرتبوو، بەلام مەولانا بە چاوی مرید و صۆفی تەماشای نەدەکرد، هەر بە چاوی برادەرەکی خۆشەویست دەیڕوانیێ.

مامۆستا چووە (شام) لەوێوە چووە (حەج)، هەر لەوێش مەلا عبداللە ی بێتوشی دیت، ساڵی ١٢٤٣ك – ١٨٢٧ز کۆچی دوایی کرد، محەممەد زەینەدینی سیاهپووش سەردولکەکی عەرەبی هۆنراوەی بۆ نووسییە، کوڕێکی هەبوو ناو عبدالغفور ئەویش کوڕێکی ناو عبیداللە ی هەبوو.

دانراوەکانی مامۆستا ئەسعەد: حاشية على التحفة، حاشية على السيلكوتي في العقائد، حاشية على المصري في الصرف، حاشية على القرەباغي في المنطق، حاشية على الدر المختار، شرح الألغاز في البيان.

سەرچاوەکان:
١. عنوان المجد ٩٢، ٩٣، ٩٤، ١٢٠، ١٢٢، ١٣١، ١٣٥، ١٥٦، ١٦٦، ٢٣٦.
٢. بوژاندنەوەی میژووی زانایانی کورد ٦/ ٨٥، ٩٢، ٢١٦.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٧ – ٨٨.
٤. علماء ومدارس في أربيل ٥٤ – ٥٧.
٥. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٨.
٦. مشاهير الكورد ١١٤.
٧. معجم أعلام الكورد ١١٠.

## ئەسعەد عبدالله جەلی (٢٤٣)

ناوی ئەسعەدە، نازناوی (ضیاء الدین)ە، کوڕی مەلا عبداللهی، کوڕی مەلا عبدالرحمانی جەلییە، ساڵی ١٨١١ز هاتووتەدنیا. لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٨٣٠ز باوکی کۆچی دوایی کرد، لەو کاتە محەممەد پاشای (رواندز) هاتە (کۆیە) چاوی بە مامۆستا کەوت فەرمانی دا هەموو پلە و پایەکانی باوکیان پێ بەخشی، لەو کاتە کتێبی عصام الدینی وەضعی دەخوێند، یەکسەر دەستی کرد بە درەس دانەوە، وە لەلایەکی دیکەش خەریکی خوێندن بوو لەلای مەلا محەممەدی قازی، ساڵی ١٨٤٤ز چووە (شام)، لەوێ ئیجازەی تەفسیر و فەرموودە و شەریعەتی لە شێخ عبدالرحمانی (الکزبری) وەرگرت، لەوێ چووە (حەج) دوایی گەڕاوە (کۆیە)، ماوەك چووە لای مەلا محەممەدی خەتێ، دوایی چووە (بەغدا) ئیجازەی گشتی لە مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی وەرگرت.

مامۆستا تەریقەتی نەقشبەندی بە کاردەهینا، لە شەریعەت زۆر ئاگادار بوو، بۆیە ناودەبردرا، بە شافیعی دووەم.

کۆچی دوایی: دووبارە چۆوە سەفەری (حەج) ئەمجارە مەلا عبدالله ی کوڕی لە خزمەت بوو، لەوێ نەخۆش کەوت، دوای نوێژی عەسری ڕۆژی هەینی ساڵی ١٨٧٢ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، لە (مولتەزەم) نوێژیان لەسەر کرد، لە گۆڕستانی (المعلا) نزیك گۆڕی شێخ ئیبن حەجەر بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. المصقول ٧.

٢. علماء ومدارس في اربيل ٦٣.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٥٥٨ – ٥٦٠.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٨٨ – ٨٩.

٥. محەممەد بن عبدالله الجلي ٩١ – ٩٤.

### ئەسعەد مەحمود صاحیب (٢٤٤)

ناوی ئەسعەدە، کوڕی مەحمود صاحیبی شارەزوورییە، باب و باپیرانی چووینە (دیمشق)، لەوێ ساڵی ١٢٧١ك – ١٨٥٤ز هاتووتەدنیا، ساڵی ١٩٢٨ز کۆچی دوایی کردووە، یەك بووە لە زانایەکانی تەریقەتی نەقشبەندی.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: الجوهر المكنون، نور الهداية والعرفان، الفيوضات الخالدية، رجال الطريقة النقشبندية.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/ ٤٤٨ – /٩/ ٥١.

٢. إيضاح المكنون ١/٣٦٧.

٣. نثر الجواهر والدرر ١/٢٣٥ – ٢٣٦.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٠٥.

٥. معجم أعلام الكورد ١١٠.

## ئەسعەد یەحیا ژەنگاری ( ٢٤٥ )

ناوی ئەسعەدە، کوڕی یەحیای، کوڕی موسای، کوڕی مەنصوری، کوڕی عبدالعزیزی، کوڕی وەهەبە، نازناوی: (بەها – ابو السعادات) بووە، ساڵی ٥٣٣ك – ١١٣٨ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و شاعیر بووە، ساڵی ٦٢٢ك – ١٢٢٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:


١. الأعلام ١/ ٢٩٥ /٣/ ٢٠٧.
٢. سیر أعلام النبلاء ١٣/١٦٠.
٣. معجم المؤلفين ٢/٢٥٠.
٤. وفيات الأعيان ١/٨٦ – ٨٨.
٥. البداية والنهاية ١٣/١١٠.
٦. معجم البلدان ٣/١٥٩ – ١٦٠.
٧. شذرات الذهب ٥/١٠٤ – ١٠٥.
٨. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٣١٠.
٩. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٦٦.
١٠. معجم أعلام الكورد ١١١.


## ئەسمائە ئەحمەد هەکاری ( ٢٤٦ )

ناوی ئەسمائەیە، کچی ئەحمەدی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی ئەحمەدی هەکارییە، ساڵی ٧١٥ك – ١٣١٥ز هاتووتەدنیا، ئەسمائە خاتوون ژنەکی شارەزا بووە لە زانیارییەکانی تایبەت بە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)، ساڵی ٧٧٠ك مامۆستا بووە و دەرسی داوە، پاش ئەو بەروارە، کۆچی دوایی کردووە، نەزانراوە کەی؟ خوشکێکی زانای هەبووە، ناو (جووەیرییە)یە، لەمەودوا باسی دەکەین – إن شاء الله –.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/٦١ – ٢١٠.

٢. معجم أعلام الكورد ١١ – ١٩٥.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٨ – ٩٣ – ٩٤.

## ئیسماعیل ئیبراهیم جزیری (٢٤٧)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی ئەبوبەکری (جزیری)یە، لە (دیمشق) دابەزیوە، لەوێ خوێندویەتی، هەر لەوێ کرایتە (مدرس)، دەرسی داوە ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١ / ٢١١.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٢.

## ئیسماعیل ئیبراهیم حەیدەری (٢٤٨)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی حەیدەری دووەمە، بەپێی نووسینی باوکی ساڵی ١١٠٧ك – ١٦٩٥ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی خوێندووە و ئیجازەی هەر لەو وەرگرتووە، زانایەکی مەزن بووە، ڕۆشنبیران لە ڕەوانبێژی ئەو زاتە سەرسام بووینە، کە دەرسی دەداوە وادەزانرا وەك دەریایەکی قوولی بێ بنە، کۆتایی نایەت، دانراوەکانی شایەدی دەست درێژی مامۆستانە، بۆ نموونە:

١. نان و خورما: هۆنراوەکی فارسی یە، ناوە ناوە پەخشانە، ناوە دەبیتە شیعری عەرەبی، زۆر خۆش و بە تامە.

٢. حاشیە لەسەر شەرحی (عضدیە)ی قۆشەجی.

٣. حاشیە لەسەر (قەرەباغی) بە (الحمدالله رب العالمین) دەست پێ دەکا.

٤. (نقش الصحیفة) شەرحی ئوسطرلابە، لە ١١٥٤ك تەواوی کردووە.

٥. چەند حاشیە لەسەر (الجفر الجامع)ی شێخ محیەدینی عەرەبی.

٦. چەند حاشیە لەسەر تەفسیری (بەیزاوی).

٧. حاشیە لەسەر (فەنناری) مەنتیق.

٨. حاشیە لەسەر چەند باس لە (مطول).

٩. حاشیە لەسەر (خلاصة الحساب)ی بەهائەدینی عاميلی.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٧ – ١٢٨.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٤٧.

٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٥٦ – ٢٦٤.

٤. مشاهير الكورد ١/١٨٩.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٢.

٦. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٥ – ٢٣٦.

٧. گۆڤاری کاروان ٨٧، ١٩٩٠ز.

## ئیسماعیل ئیبراهیم دیاربەکری (٢٤٩)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی ئیبراهیمە، خەڵکی (ئامود)ی دیاربەکرە، لە (مەدینە)ی پیرۆز قازی بووە، کتێبی (درر النفائس في زجر الأشرار و الخبائث)ی داناوە، ساڵی ١١٢٤ك – ١٧١٢ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢٥٤.

٢. إيضاح المكنون ١/٤٧٠.

٣. معجم أعلام الكورد ٩٧.

## ئیسماعیل ئیبراهیم کوردی (٢٥٠)

ناوی ئیسماعیلە، نازناوی عیمادەدینە، کوڕی ئیبراهیمە، لە دەوری ساڵی ٦٩٠ك – ١٢٩١ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان بووە، بۆ قازییاتی شاری (غەزە)

کرایتە جێگری ئیمامی سوبکی، پاشان چوویتە (دیمشق)، لە ڕۆژی هـەینی (١١)ی مـانگی ذی القعده ساڵی ٧٥٥ك – ١٣٥٤ز کتووپڕ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ١/ ٢١٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٢.

## ئیسماعیل ئیبراهیم ماردینی (٢٥١)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی ئیبراهیم شەمسەدین حەنەفی ماردینی یە، ناسراوە بە (ابـن فلوس) ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: إرشاد الحساب في الفتـوح مـن الحسـاب، إعـداد الأسـرار وأسـرار الأعداد، نصاب الجبر فى حساب الجبر.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢٥٥ – ٢٥٦.

٢. كشف الظنون ٢/ ١٩٥٤.

٣. هدية العارفين ٥/٢١٢.

## ئیسماعیل ئەحمەد دیاربەکری (٢٥٢)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عەلی (ئـامود)ی دیاربـەکرە، نازنـاوی شەرەفەدینە، زانایەکی فەرموودەناس و مێژووناس بووە، کتێبـی (تاریخ ئامد)ی داناوە، لـە ٦٧٧ك – ١٢٧٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ١/٢١١.

٢. معجم المؤلفين ٢/٢٦٠.

٣. معجم أعلام الكورد ٩٨.

## ئیسماعیل بایەزیدی ( ٢٥٣ )

ناوی ئیسماعیلە، خەڵکی (بایەزید)ە، شاعیر و نووسەر بووە، لە هۆنراوە چاوی لە (ئەحمەدی خانی) کردووە، کتێبی (گوڵزاری) داناوە: قاموسی کوردی و عەرەبی و فارسی یە، مامۆستا شیعر و چامەی زۆرن، ساڵی ١١٢١ك - ١٧٠٩ز کۆچی دوایی کرد، لە شاری (بایەزید)ی ڕۆژهەڵاتی شاری (وان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١١٥.

٢. معجم أعلام الكورد ٩٧.

## ئیسماعیل حبیب اللە مەردۆخی ( ٢٥٤ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی حەبیب اللّٰەی، کوڕی ئیسماعیلە، ناسراوە بە (بابا مەردۆخی) ساڵی ١٣٤٠ك - ١٩٢١ز لە گوندی (کاشتەر) سەر بە (سنە) هاتووتەدنیا.

لە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای (بدیع الزمان)ی (سنە)یی، لەوێ فێری نووسینی فارسی بوو، لەسەر فەرموودەی مامۆستاکەی قەصیدەی (بوردیە) و (بانت سعاد)ی هەردووك لەبەر کردن، ئەمجا چووە لای مەلا محەممەد سەعیدی دەربەندی، (بوستانی) شێخی سەعدی خوێند، گەڕاوە خزمەت باوکی کتێبەکانی (مقدمات)ی خوێندن، پاشان بۆ خوێندنی ئاداب و مەنتیق چووە لای مەلا محەممەدی گورجی. وەکتێبی تەشریحی لای مەلا عبدالمجیدی ئوصوڵی خوێند، گەڕاوە خزمەت باوکی (مختصر) و (تحفە) و (جمع الجوامع)ی تەواوکرد، ساڵی ١٣٦٠ك - ١٩٤١ز باوکی کۆچی دوایی کرد، ماوەی دوو ساڵی تری خوێند ئیجازەی وەرگرت.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٤٠٨ك - ١٩٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی ئەمانەن: الصغري في المنطق، فەرهەنگی نەوزاد، قارورة الصحو في شرح باكورة النحو، دانش سەرایش: عەروز و قافیەیە، مرآة الأسامي: شەرحی وەضع و ئیستعارەی مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەیە، الیم الغيث: باسی میراتە، ارمغان گرامي:

شەریعەتە، مآدب القوم بمآرب الصوم، أحسن الإتحاف في الإعتكاف، أبهي المصباح في النكاح، بەدیعی ڕووحانی، أسهل الوصول إلى نظم لب الاصول، دەریای گەوهەر، شەرحی (المعلقات السبعة)، شەرحی (لامية العرب) و (لامية العجم) و (لامية الكرد)، شاهراه رهایی، شێوەی موسولمانی، دەورەی تەعلیمات، ئایینەی درستکاری، صەفوەتی ڕووحانی دەرمەناقیبی غەوسی گەیلانی، بەدیع و قافیە، مەناسیکی حەج، تاریخ مشاهیر الكورد: سێ بەرگە، خاطرات ویادداشهای من، دیوانی شیعر.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام ٢٤، ٢٠٠٤ز

## ئیسماعیل سەعید زەرزاری ( ٢٥٥ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی سەعیدی، کوڕی ئیسماعیل (زەرزاری)یە، زانایەکی شەریعەت زان بووە، لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی شارەزابووە، خۆی و مەلا یوسفی برای دەرسیان لەلای مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا محەممەدی، کوڕی (ئوستاز) خوێندووە، لە مانگی مەولوودی ساڵی ٥٠٤ك -١١١٠ز.

سەرچاوە: تاریخ أربيل ١/٢٧١.

## ئیسماعیل شەمسەدین گۆران ( ٢٥٦ )

ناوی ئیسماعیلە، نازناوی شەمسەدینە، مەزهەبی حەنەفی یە، زانیاری لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) هەبووە، ساڵی ٨٩٣ك – ١٤٨٨ز، لە قوسطەنطینیە کۆچی دوایی کردووە، تەفسیری هەیە بە ناوی (غاية الأماني) هەروەها شەرحی بوخاری کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٢/٢٨٨.

## ئیسماعیل صاڵح نانەکەلی ( ٢٥٧ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی صاڵحی، کوڕی مەحمودە، عەشیرەتی (نانەکەلی)یە، ساڵی ١٩٢٢ز لە گوندی (قەتەوی) هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، لە چەند شوێنان خوێندنەکەی بردەسەر، بووە مەلا لە گوندی (شێخ شەروان) لە ساڵی ١٩٤٨ز تا

ساڵی ١٩٦١ز لەو گوندە بووە، بۆیە ناسرابوو بە مەلا ئیسماعیلی شێخ شەروانی، پاشان باری کرد، چووە گوندی (پەلکانە) لەوێش باری کرد، بۆ گوندی (عالللا) دوایی هاتە (هەولێر).

کوڕەکانی: مامۆستا چەند کوڕی هەنە، مەلا کامەران و کاك ئەحمەد و عومەر و نەریمان و چەندانی تر لە زەنگینەکانی هەولێرن، دەزگای نانەکەلی بۆ دابەشکردنی زەکاتیان داناوە لە کاتی قاتی و گرانی و نەبوونی، بە هۆی ئابلۆقەی ئابوری سەر عێراق و سەر کوردستان خێراتەکی زۆریان بەخشی و بە هانای هەژاران هاتن، هەروەها مزگەوت و نەخۆشخانە و قوتابخانەی نانەکەلی و چەندان خێراتی تریان هەیە، خوا دەست درێژتریان بکا و لێیان قەبول بکا.

سەرچاوە: هەولێرم وادیوە ١١٣.

**ئیسماعیل عبدالقادر سوسەیی ( ٢٥٨ )**

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی مەلا عبدالقادری، کوڕی مەلا مەعروفە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٢ز هاتووتەدنیا، زاتێکی هێمن و نەرم و لەسەرخۆ بووە، لە دین و لە دنیا شارەزا بووە، ئاقڵ مەند بووە، بۆ ئیشی ئالۆز خەڵکان پرس و ڕایان پێ دەکرد.

خوێندنی: لە سەرەتاوە لە (جدیدە)ی بەڕانیان، لە لای مەلا (حوسێنی ئاشۆکانی) بوو، دوایی چووە (بنەسراوە)ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، ماوەك چووە (قەراسنج) لای مەلا شێخ حوسێنی سورچی، لەوێ هاتە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، هەر لەوێ ساڵی ١٩٢٣ز (جهة الوحدة)ی مەنتیقی نووسیەوە، پاشان چووە (قازیخانە) لای مەلا عوسمانی خورمەڵە، لەوێ ساڵی ١٩٢٤ز قزلجی سەر تەصریفی نووسیەوە، ئەمجا چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشبەندی، لە خزمەت جەنابی شێخ کۆتایی بە خوێندن هێنا، ساڵی ١٩٣٢ز لەگەڵ ئەو بەرێزانە ئیجازەی پێ درا: مەلا مصطەفا مەلا سولەیمان ئاشوکانی، مەلا عبداللە مەلا سولەیمان بەحرکەیی، مەلا محەممەد مەلا طاها باشوری.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (سێبیرانی گەورە)، پاشان چووە (پیرزین).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەد گەزنەیی، مەلا عبدالله سێبەردانی، مەلا کەریم سێبیرانی، مەلا طاهیری سوسەیی، مەلا جەمیلی کاوانی، دکتۆر شێخ عبدالله نەقشبەندی، شێخ ئەنوەری هەرشەمی، مەلا صابیری شەوەکی، مەلا صابیری شێخ مەموندی، مەلا شێخ محەممەدی شەوەکی، مەلا شێخ محەممەدی شاوێسی، مەلا محەممەدی زیارەتی، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا عوسمان مەلا عبدالله هەرشەمی، مەلا ئەحمەدی دووگوندان.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٠ز لە (پیرزین) کۆچی دوایی کرد، نەجمەدینی کوڕی لە پاش بە جێما: لە (بەحرکە) و (براغ) و (هەولێر)ی خوێند، بووە مەلا لە مزگەوتی عەقید حەیدەر، لە هەولێر، دوایی چووە مزگەوتی (مەجید قەردار) پاشان بووە دەرس بێژ لە قوتابخانەی ئاینی ئەوقاف، لە ٢٦/٧/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد مەلا ئیسماعیلی کوڕی ئێستا پێش نوێژ و ووتارخوێنە لە مزگەوتی عوزێری.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٨.

٢. دەستنووسەکانی مامۆستا لای مەلا ئیسماعیل سوسەیی.

## ئیسماعیل عەلی ئەییوبی (٢٥٩)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی، کوڕی عومەری، کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەییوبی، کوڕی شادیە، نازناوی (ئەبوفیدایە) ناسراوە بە: خاوەنی شاری (حەما)، یەکە لە مەلیکەکانی خزمی سولتان صەلاحەدینی ئەییوبی، ساڵی ٦٧٢ك – ١٢٧٣ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا.

زانیاری: قورئانی پیرۆز و چەندان کتێبی لەبەر بوون، شارەزا بوو، لە ڕێزمانی عەرەبی و شەریعەت و مێژوو و ئەدەبیات، لە تەفسیر و فەلسەفە و مەنتیق بەهێزبوو، جگە

لە ڕۆژنامەناسی و ئەستێرەناسی فەلەك و دختۆری، زانایانی بانگی قەسرەکەی خۆی دەکردن و قسەی خۆشی بۆ دەکردن.

کۆچی دوایی: ساڵی ٧٣٢ك – ١٣٣١ز لە شاری (حەما) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: تقويم البلدان، تاريخ الدولة الخوارزمية، نوادر العلم، الكنائس، الموازين، الحاوي، نظم الحاوي الصغير، الطريق الرشاد الى تعريف الممالك والبلاد، المختصر في أخبار البشر: دوو بەرگە.

سەرچاوەکان:


١. شذرات الذهب٦/٩٨ – ٩٩.

٢. إيضاح المكنون ٢/ ٣٨٢.

٣. البداية والنهاية ١٤/١٦٥ – ١٦٦.

٤. معجم المؤلفين ٢/٢٨٢ – ٢٨٣.

٥. مشاهير الكورد ٨٧ – ٩٠.

٦. معجم أعلام الكورد ١٠٠.

٧. كشف الظنون ١/٤٦٨ ، ٢/ ١٦٣٩.

٨. فوات الوفيات ١/١٨٣ – ١٨٨.

٩. البدر الطالع ١/١٥١ – ١٥٣.


## ئیسماعیل قاسم (قالی) (٢٦٠)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی قاسمی، کوڕی عیذونی، کوڕی هارونی، کوڕی عیسای، کوڕی محەممەدی، کوڕی سەلمانە، لە مانگی جیمادی دووەمی ساڵی ٢٨٨ك – ٩٠١ز لە (مەنازجود – مەلازگیرد) نزیك دەریاچەی (وان) هاتووتەدنیا، زاناترین کەسانی سەردەمی خۆی بوو، لە ڕێزمانی عەرەبی و شیعر ئازابوو، ناوبراوە بە: (قالی) چونکە ساڵی ٣٠٣ك لەگەڵ خەڵکی (قالی – قلا) چووە بەغدا.

مامۆستا ماوەك چووە (موصل) بۆ خوێندن، ساڵی ٣٣٠ك چووە (قورطبە) ماوە لەوێ تا مانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی ٣٥٠ك - ٩٦١ز کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبی بە نرخی داناون، لەوانە: الأمالي، البارع: دە هەزار لاپەڕەیە، المقصور والممدود، كتاب في الإبل ونتائجها، حلى الانسان والخيل وشياتها، فعلت وافعل، مقاتل الفرسان، شرح قصائد المعلقات.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ١/٢٠٤ - ٢٠٦.

٢. شذرات الذهب ٣/١٨.

٣. معجم المؤلفين ٢/٢٨٦.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٤.

٥. مشاهير الكورد ٣٤٣.

٦. البداية والنهاية ١١/٢٨١.

٧. كشف الظنون ١/٥٦٥.

## ئیسماعیل کوردی (٢٦١)

مامۆستا ئیسماعیل کوردی، زاتەکی بە دین و خواناس و خواپەرست بووە، ڕووی بە دنیا نەداوە، لە (دیمشق) دابەزیوە، چوویتە (حەج) لە (مەککە)ی پیرۆز مایتەوە، ژنێکی ئامێدی هێناوە، گەڕایتەوە (دیمشق) لەوێ کوڕێکی لێ بووە، ناوی ناوە (سولەیمان) گەڕایتەوە کوردستان، ژنێکی تری هێناوە، گەڕایتەوە (دیمشق) لەوێ چەند منداڵی بووینە، مامۆستا لە (شام) نیشتەجێ بووە، قوتابیان لە دەورەی کۆبوونەوە، لە لایان خوێندووە.

کۆچی دوایی: لە شەوی شەمەی (٥) جیمادی یەکەم دوای نوێژی عیشا، ساڵی ٩٥٦ك - ١٥٤٩ز کۆچی دوایی کرد، کاتی هەڵکەندنی گۆڕەکەی بەردێك دەرچوو، لەسەری نووسرابوو (يبشرهم ربهم برحمة منه ورضوان وجنات لهم فيها نعيم مقيم)، (تەوبە / ٢١).

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/٣٠٩.

٢. مشاهير الكورد ١١٧..

٣. معجم أعلام الكورد ١٠٧ – ١٠٨.

## ئیسماعیل محەممەد ئەمین بابانی (٢٦٢)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدئەمینی، کوڕی سەلیمی بابانی یە، لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ نیشتەجێ بووە، چەند پلە و پایەی سەربازی وەرگرت، پاشان دەستی کرد بە نووسین، ماوەك لە (مقری کوی) نزیك (ئەستانە) بوو، لەوێ (إیضاح المکنون)ی، پاشکۆی (کشف الظنون) لە پێناسەی کتێبان دانا، دوو بەرگە، ساڵی ١٩٤٥ز لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا، لە ١٩٦٧ز دووبارە لە (تاران) چاپ کراوە، هەروەها (هدیة العارفین)ی داناوە، دوو بەرگە، پێناسەی ئەو زانایانەیە، کە دانراویان هەیە، ساڵی ١٩٥١ز لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا، لە ١٩٦٧ز دووبارە لە (تاران) چاپ کراوە، ناوبراو ساڵی ١٣٣٩ك – ١٩٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٢/٢٨٩ – ٢٩٠.

٢. معجم أعلام الکورد ٩٧.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٩٣.

٤. الأعلام ١/ ٣٢٥، ٢/ ٣.

٥. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ١٨١٤.

## ئیسماعیل محەممەد پیرداودی (٢٦٣)

ناوی ئیسماعیلە،کوڕی مەلا محەممەدی،کوڕی مەلا عبداللە یە، لەبنەماڵەکی ئایین پەروەرە، بەعەشیرەت (شێخ مەموندییە)، لەگوندی (پیرداود) هاتووتە دنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، چووە ناو فـەقێیان لـە چەند شوێنان گەڕا بۆ خوێنـدن، لـە قۆنـاغی کۆتـایی چـووە لای مامۆسـتا محەممەدئـەمینی (کونەفلوسە) لە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر) لەوێ ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: مەلایـەتی لـەو گوندانـە کـردووە: (قـاوغ)، (پـیرداود)، (تەلـەرخێمی کچکە)، (یاروەلی)، (بالیسـان)، (ئاقوبان).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەدئەمینی سوێری، مـەلا عبـدالقادری سـورێژەیی، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی.

کۆچی دوایی: سالّی ۱۹۳۹ز کۆچی دوایی کرد، مـەلا محەممـەدی کـوڕی، پـاش خوێنـدنی مەلایـەتی چـووە (قـاهیرە) بڕوانامـەی خوێنـدنی زانکـۆی وەرگـرت، گـەڕاوە کوردستان، ماوەك بریکاری وەزارەتی پەروەردە بوو لە (هەولێر)، ئێستا خانەنشین کراوە.

سەرچاوە: کەشکوڵی دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئیسماعیل محەممەد جدیدەیی (٢٦٤)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدی، کوڕی قادری، کوڕی جێزنی، کوڕی یوسفی، کوڕی ئیبراهیمە، بە عەشـیرەت (لەکـە) سـالّی ۱۸۸۷ز لـە (جدیـدە) هاتووتـەدنیا، لـە گوندەکەی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (قوشاغلو)، ماوەك لەگەڵ مـەلا شەریفی دووشیوانی لە (گردعازەبان) بوو، مـاوەك چـووە (بەحرکـە) لای مـەلا عوسمـانی (شەوەکی)، ماوەك چووە (کەرکوك) لای مەلا سولەیمانی تـورك، لـەوێ سـالّی ۱۹۱۲ز کەمالی صەرفی خوێند، پاشان چووە (هەولێر) لە مزگـەوتی (قـەلات) لای مـەلا ئەفەنـدی ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (جدیدە)، دوایی لەوێ باری کرد چووە (دیبەگە)، لـەوێ سـولەیمان ئاغـا زۆر ڕێـزی لێنـا، مـاوەی چـل سـالاّن لـەوێ نیشـتەجێ بـوو، خـەریکی کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان بوو، دەوری نۆزدە مەلای ئیجازە پێداون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا خەلیلی (مخلص)، مەلا کەریمی سێبیرانی، مەلا محەممەدئەمینی جدیدەیی، مەلا سەلیمی دیبەگەیی، مەلا عبدالفتاحی برای، مەلا صابیری کوڕی، مەلا عبدالحمیدی کوڕی، مەلا عبدالقادر مەلا سولەیمان بەحرکەیی، مەلا سەید ئیسماعیل دەربەندی.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٤/١/١٩٦٩ز لە ئەنجامی ڕووداوێکی ئۆتۆمبیل لە ڕێگای دیبەگە - هەولێر کۆچی دوایی کرد.

نووسینەکانی:

١. شەرحی فەرائیزی سەید شەریفی جورجانی، مەزهەبی حەنەفی.
٢. چەند پەراوێز لەسەر قزلجی تەصریف و ئەبوطالیب و کەمال لە کۆتایی دا دەینووسی: (أ س م ج)، واتە: اسماعیل جدیدی.
٣. حاشیە لەسەر تەفسیری (مەداریك) مامۆستا عبدالحمیدی کوڕی کۆی کردیتەوە لە دوو بەرگ، لە ٢٤/١٠/١٩٨٩ز تەواوی کردیە، دانەکی کۆپی لەلای ئێمە هەیە.

کوڕەکانی: مەلا عبدالحمید و مەلا صابیر و عبدالقادر و طاهیر.

سەرچاوەکان:

١. نامەی مەلا عبدالحمید.
٢. علماء ومدارس في أربیل ١٢٠.

## ئیسماعیل محەممەد سیواسی (٢٦٥)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەد سەنانی، کوڕی حەسەنی (سیواسی)یە، برای شەمسەدین (محرم) ئەفەندییە، مەزهەبی حەنەفی یە.

دانراوەکانی: الفوائد في شرح ملتقی الأبحر، شرح رسالة الصغائر والکبائر.

کۆچی دوایی: لە ١٠٤٧ك - ١٦٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/ ١٨١٥.

٢. معجم المؤلفين ٢/٢٧١ – ٢٩٠.

٣. هدية العارفين ١/٢١٨.

٤. معجم أعلام الكورد ٩٩.

## ئیسماعیل محەممەد ولیانی (شێخ سمایلی ولیان) (٢٦٦)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عەلی، کوڕی بابارەسولی (بەرزنجی)یە، ساڵی ١٠٨١ك – ١٦٧٠ز لە گوندی (نۆدێ) سەر بە (قەلاچوالان) هاتووتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر و ڕوو لە زانیاری پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی نەحو و صەرفی تەواوکرد، بەرە بەرە پێداچوو تا سەرکەوت بۆ زانستەکانی سەرەوە ئەمجا گەڕاوە خزمەت باوکی، تەریقەتی (قادری) لێ وەرگرت، لە لایەن باوکی کرا (خەلیفە)، پاش ماوەك سەفەری (بەغدا)ی کرد، چووە خزمەت شێخ ئەحمەدی (ئەحسائی) لە تەکیەی ئەحسائی – کە ئێستا پێی دەوترێ تەکیەی خالیدیە – تەریقەتی وەرگرت، ئەویش ئیجازەی خەلیفاتی پێدا، گەڕاوە کوردستان، لە گوندی (قازانقایە) نیشتەجێ بوو، دوایی چووە (ولیان) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی تەریقەت، خەڵکان دەهاتنە لای بۆ زیارەت، لەوانە: (میر ئەحمەدی زەنگەنە)بوو لەسەر فەرمانی سوڵتانی عوسمانی هاتە لای، گوندی (ولیان)ی پێشکەش کرد، هەروەها (گلەزەردە)ی بەخشی بە شێخ حەسەنی برای، تا بەروبوومەکەیان خەرج بکرێن بۆ خۆراکی مریدان و هەژاران، (شێخ ئیسماعیل) لە (ولیان) شێخ حەسەنی برای لە (گلەزەردە) شان بەشان یەك خەریك بوون بە خزمەتی ئاینی پیرۆز.

پاشان شێخ ئیسماعیل باری کرد چووە گوندی (روفیە – ریویە) نزیك (ئاکرە) لەوێ نیشتەجێ بوو، خەریکی ڕێگا نیشاندانی خەڵکان بوو، تا ساڵی ١١٥٨ك – ١٧٤٥ز کۆچی دوایی کرد، دە کوڕی هەبوون: عبدالرزاق و عبدالقادر و عبدالرحمان و عبدالکریم و رەسول و مەحمود و مەعروف و عبد الله و عبدالسلام و یەحیا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٥ – ٩٦.

## ئیسماعیل محەممەد گردعازەبانی (٢٦٧)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدی، کوڕی داود ئاغایە، ساڵی ١٨٨٥ز لە گوندی (گورگەیی) هاتووتە دنیا، بەعەشیرەت (شوان)ە، باوکی لە ناوچەی شوان باری کرد، بۆ گوندی (گردعازەبان).

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، پاشان بۆ بردنە سەری خوێندنی گەڕا لە چەند شوێنان، لە حوجرەکانی فەقێیان، لە (کەرکوك) و لە (هەولێر) و لە ناوچەی خۆشناوەتی، تا لە کۆتایی هاتە قوتابخانەی قەلاتی هەولێر لە لای بەڕێز جەنابی مەلا ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (گردعازەبان) ماوەك لەوێ دەرسی داوە، دوایی باری کرد بۆ گوندی (کەور) لەویش هاتە (هەولێر)، لە ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: محەممەد عەلی: پێش نوێژ بوو، عبدالله و عبدالرحمان و طاهر، وە مەلا صابیر: زانا و زیرەك بوو، لە ١٩٨٧ز کۆچی دوایی کرد، دلاوەری کوڕی دکتۆرای هەیە مامۆستایە لە زانکۆ، چەند کتێبی داناون، لەو کتێبانە هەوڵی داوە هەماهەنگی نێوان ئایین و زانست بکا.

سەرچاوە: کەشکۆڵی دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ئیسماعیل محەممەد گەلالی (٢٦٨)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (گەلالە)ی ناوچەی بالەکایەتی یە، شێخ ئیبراهیم فەصیح لە عنوان المجد باسی دەکات، بە زانایەکی بڕواپێکراوی ناودەبات.

سەرچاوە: عنوان المجد ١٢٤.

## ئیسماعیل محەممەد (ماویلی) (٢٦٩)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی خەلیفە محەممەدی، کوڕی مەلا عبدالله یە، ساڵی ١٨٩٧ز لە گوندی (ماویلیان) سەر بە ڕواندز هاتووتەدنیا، دوای تەواوکردنی قۆناغی سوختایەتی، چووە (رواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی مەنتیق و بەلاغە و ئوصولی

فیقهی خوێند، پاشان چووە (هەولێر) لای جەنابی شێخ مصطفای نەقشبەندی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: مەلایەتی لەو گوندانە کرد: (هەریر)، (هیران)، (سکتان).

فەقێیەکانی: مەلا عبداللەی کوڕی، مەلا محەممەدی کوڕی، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا مصطفا صۆفی عەلی.

خووڕەوشتی: زاتەکی خێرخواز بوو، بە دین بوو، بار قۆر بوو، بۆ پیاوانی ئاینی ملکەچ بوو نەرم بوو، بە سام بوو، لە خوارازی بوو، هێمن بوو، ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١٢١.

## ئیسماعیل محەممەد مەجدەدین حەڕانی (٢٧٠)

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیسماعیلە، نازناوی مەجدەدینە، ساڵی ٦٤٨ك – ١٢٥٠ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، لە ٦٧١ك چوویتە (دیمشق)، مامۆستای زانایەکانی مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە شەریعەت و تەفسیر و فەرموودە و ژمێریاری شارەزابووە، ناسراوە بە زاتەکی دڵپاك و ڕەوشت چاك شەوی یەك شەممەی (٩) جیمادی یەکەم ساڵی ٧٢٩ك – ١٣٢٩ز کۆچی دوایی کرد،

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٤٠٨ – ٤١٠.
٢. معجم أعلام الكورد ١٠١ – ١٠٢.
٣. شذرات الذهب ٦/٨٩.
٤. البداية والنهاية ١٤/١٥٣.
٥. الدرر الكامنة ١/٢٢٠.

## ئیسماعیل محەممەد (ناقیص) (٢٧١)

ناوی ئیبسماعیلە، کوڕی محەممەدی، کوڕی کانەبی یە، عەشیرەتی (سیان)ە، ناسراوە بە (ناقیص)، ڕۆن نیە هۆی ئەو نازناوە، چیە، بۆیە مەلا خەلیلی (مخلص) بە عەرەبی دەڵێ:

أيها الزائرُ زرْ ثم الإلهَ سَلْ تَنَلْ — إِنَّ هَذا الْقَبْرَ قَبْرٌ فيهِ عِلْمٌ وَعَمَلْ

حَارَ فِيهِ الْخَلْقُ إِنَّهُ فِي فَضْلِهِ — كَانَ بِـ (النَّاقِصِ) مَشْهُوراً وَمَا فِيهِ خَلَلْ

زۆربەی کەسان دەڵێن: دایکی کە ئەو منداڵەی بووە، ئەو کۆرپە تەمەنی شەش مانگ بووە، کەواتە لە نۆ مانگ کەمترە (ناقیصە)، وە بیستومە دەڵێن: لەگەڵ برایەکی خۆی (جمك) بوە بۆیە (ناقیصە)، هەروەها هەندێك دەڵێن: تۆزەك زمانی لەنگ بووە و بە گرێ دوایە.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند حوجرانی فەقێیان گەڕا، بە شێوەی قوتابیانی کوردستان، چووە گوندی (کەپەنك ڕەش)، لەوی ساڵی ١٨٩٧ز چوار بەرگی شەرحی مەنهەجی نووسییەوە، دوایی چووە (دیبەگە) ساڵی ١٨٩٩ز تەصریفی مەلا عەلی لەگەڵ چەند پەراوێز نووسییەوە، پاشان چووە (تەلەرخێم) لەوێ (مەلا حەمزە)ی سەر سعداللەی گەورەی نووسییەوە، چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها لەوێ لە ساڵی ١٩٠٤ز شەرحی وەضع و ئیستعارەی لەگەڵ چەند پەراوێز نووسییەوە، ئەمجا چووە (کەرکوك) لای مەلا طاهیر (تەشریح)ی نووسییەوە، پاشان هاتە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر) لە خزمەت مامۆستا محەممەدئەمینی (کونەفلوسە) ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: مەلایەتی لەو گوندانە کردووە، (نۆغەران) و (قەشقە) و (جدیدە)ی لەك و (یەدیقزلەر).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا شەریفی دوو شیوانی، مەلا ئیسماعیلی جدیدەیی، مەلا عبدالمجیدی گڕاوی، مەلا عوسمانی هەرشەمی. وە ئەو مەلایانەی زۆر خۆشویستوونە: مەلا سەید محەممەدی پیرداودی، مەلا عبدالقادری سووریژەیی، مەلا خەلیلی (مخلص).

خوورەوشتی: مامۆستا زانایەکی بەرزی سەردەمی خۆی بووە، زۆر بە دین بووە، مریدی شێخ ئەبوبەکری (هەرشەمی) بووە، دوایی بووە خەلیفەی شێخ مصطفای نەقشبەندی، مامۆستا ئامۆژگاری مەلایانی دەکرد، خۆشی وای دادەنا قسووری کردووە، ئەو پەندە فارسییەی زۆر لەسەر زاری شیرین بوو: {ما نکردیم شما حزر بکنید}، واتە: من چاکەم نەکرد، لە کیس خۆم دا، ئێوە ئاگاداری خۆتان بن، مامۆستا خەتی خۆش بوو، زۆر خەریکی نووسینەوە بوو، کتێبی خۆی زۆر خۆش دەویست نابا کەس لەسەر کتێبی وی، کاتی خوێندنەوە (جغارە) بکێشی.

لە خوالێخۆشبوو مەلا خدری شەمامەریم بیست: جارەك مەلایەك کتێبەکی مامۆستای برد لێی بخوێنی، ماوەك لە لای بوو، کە هێنایەوە دیتی تۆزەك سۆتەکەی (جغارە) لە ناو پەڕەکاندا بوو، مامۆستا گازاندەی دەکرد و دەیگوت: (مەلا خەلك چەند بێ ویژدانە، جغارەیان لەسەر کتێبی من کێشاوە!).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٨ز لە گوندی (یەدیقزلەر) کۆچی دوایی کرد.

(کوڕەکانی): محەممەدئەمین، عبدالکریم، عبدالمجید، مەلا عبدالقادر: ئەویش بە داخەوە عومری کورت بوو لە بەرواری ١٦/٥/١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في اربيل ١٢٠.
٢. النجم الزاهر.
٣. هەندێ زانیاری پێشتر لە مامۆستا مەلا شەریف دووشیوانی وەرم گرتووە.
٤. هەندێ زانیاری پێشتر لە مامۆستا مەلا خەلیل (موخلیص) وەرم گرتووە.
٥. چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی محەممەد و ئەحمەد کوڕانی مەلا عبدالقادری کوڕی مامۆستا لە ٢٥/١/٢٠٠٦ز

## ئیسماعیل مەحمود ڕەشیدەدین کوردی ( ٢٧٢ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی مەحمودی، کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە: (ڕەشیدەدینی کوردی) مەزهەبی شافیعی یە، کتێبی: (سراج العابدین) شەرحی ئەربەعینی داناوە، ساڵی ٧٧٥ك – ١٣٧٣ز تەواوی کردووە، سەرەتایەکەی بە: (الحمدلله الذي هدانا لكتابه) دەست پێ دەکات، هەر لەو ساڵەی کتیبەکەی سەرەوەی دانا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢٩٥.

٢. ايضاح المكنون ٤/٧.

٣. هدية العارفين ٥/٢١٥.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٣.

## ئیسماعیل موسەللەم هەولێری ( ٢٧٣ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی موسەللەمی، کوڕی سەلمانە، لە (هەولێر) هاتووتەدنیا هەر لەوێش پەروەردە بووە، چوویتە (بەغدا) ماوەکی زۆر لە لای (ئەبولفەرەج محەممەدی کوڕی عبدالله)ی سەرۆك وەزیران مایتەوە، پاشان لەگەڵ ئەو چوویتە سەفەری (حەج)، لە (مەککە)ی پیرۆز مایتەوە تا کۆچی دوایی کردووە. مامۆستا زانایەکی بە دین و صۆفی و ئەهلی تەرقەت بووە، لە صەدەی شەشەم ژیاوە، برایەکی زانای هەبووە ناوی (ئیبراهیم) بووە.

سەرچاوە: تاريخ أربيل ١/٢١٢ ، ٢/٣٦٣.

## ئیسماعیل مصطفی ئەرزڕۆمی ( ٢٧٤ )

ناوی ئیسماعیلە، کوڕی مصطەفایە، نازناوی (نائیب)ە، خەڵکی (ئەرزڕۆمە) مەزهەبی حەنەفییە، لە (عەینتاب) قازی بووە، لە (قوسطەنطینە) ساڵی ١٢١٤ك – ١٧٩٩ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون: حاشية على شرح الفرائد الليثية للقازآبادي، حاشية علي أوائل الجامي. شرح منتهى السول.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٢/٢٩٥.

٢. إيضاح المكنون ٢/٥٧٢.

٣. هدية العارفين ١/٢٢٢.

## ئیسماعیل مصطفی بابان (٢٧٥)

ناوی ئیسماعیلە، ناسراوە بە (حەقی بەگ) کوڕی مصطەفا زیهنی پاشای بابانە، ووتارخوێنێکی بە توانا بووە، لە دەوری عوسمانیەکان کرا وەزیری زانستی، زانایەکی نووسەر و زیرەك بووە، لەگەڵ عەلی ڕەشاد بەگ کتێبانی: (حياة بسمارك السياسية) و (قضية دريفوس)ی داناوە بە تورکی، هەروەها بە تورکی (الحقوق الأساسية) و (رسائل العرفان)ی هەیە، ساڵی ١٣٢٩ك – ١٩١١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: مشاهير الكورد ١١٦.

## ئیلیاس ئیبراهیم کوردی (٢٧٦)

ناوی ئیلیاسە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی داودی، کڕی خضری شافیعی یە، ساڵی ١٠٤٧ك – ١٦٣٧ز هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە دەرسی لە لای مەلا داودی مامی و چەند زانایان خوێند، لە دەوری ساڵی ١٠٧٠ك – ١٦٥٩ز چووە (دیمشق)، لەوێ لە لای مەلا حەیدەری کوردی ماوەکی خوێند، ئیجازەی لە مەلا ئیبراهیم حەسەن کوردی و محەممەد عبدالرسول بەرزنجی وەرگرت.

مامۆستا شیخەکی کەرامەت دار بوو، لە چەند قوتابخانان دەرسی داوە، زۆرجار سەفەری (حەج) و (قودس)ی کردووە، لە لای سەرکردە و کاربەدەستان بەرێز بووە، ساڵی ١١٣٨ك – ١٧٢٥ز کۆچی دوایی کردووە. حاشیەی لەسەر شەرحی (جمع الجوامع) و شەرحی عەقائید و شەرحی ئیساغۆجی و عەوامیل و (فقه الأكبر) و سنووسية و ئیقلید و فەریدە و ئیستیعارە هەیە.

سەرچاوەکان:
١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٨ – ١٠٠.
٢. هدية العارفين ٥/ ٢٢٦.
٣. كشف الظنون ٢/١٢٨٧.
٤. معجم المؤلفين ٢/٣١٠ – ٣١١.
٥. معجم أعلام الكورد ١٢٧ – ١٢٨.
٦. سلك الدرر ١/٢٧٢ – ٢٧٤.

## ئیلیاس ئەییوبی (٢٧٧)

ناوی ئیلیاسە، بەنەتەوە ئەییوبییە، لە ١٢٩١ك–١٨٧٤ز هاتووتە دنیا، زانایەکی مێژووناس بووە، ناوبانگی رۆییوە.

دانراوەکانی: تأريخ مصر: دوو بەرگە، قطف الأزهار في أهم حوادث الأمصار. ساڵی ١٣٤٦ك – ١٩٢٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٨.

## ئیلیاس حامید حەڕانی (٢٧٨)

ناوی ئیلیاسە، کوڕی حامیدی، کوڕی مەحمودی، کوڕی حامیدی، کوری محەممەدی، کوڕی ئەبو حەجەری (حەڕانی) یە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، مامۆستایەکی فەرموودەناس و شەرع زان بووە، لە (بەغدا)ی خوێندووە، لە (موصل) نیشتەجێ بووە، هەر لەوێ کرایتە شێخی (دارالحدیث) لە سەرەتای مانگی شەوالی ساڵی ٥٩٢ك – ١١٩٦ز لە (موصل) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:
١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/٣٨٧.
٢. شذرات الذهب ٤/ ٣٠٩.

## ئیلیاس سەردەشتی (٢٧٩)

مامۆستا ئیلیاس، ناسراوە بە (مەلای گەورە)، خەڵکی سەردەشتی ئێرانە، لە وڵاتی خۆی ماوەکی خوێند، دوایی بۆ پەرەپێدانی زانیاری چووە (میصر) لە لای پسپۆڕی فەرموودەناس ئیبن حەجەری عەسقەلانی خوێند، پاشان دڵی بۆ مەفتەن بزفت، گەڕاوە کوردستان، دەستی کرد بە دەرس دانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی پیرۆز، تا لە سەرەتای نیوەی یەکەمی صەدەی دەیەمی کۆچی، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ١/ ١٤٨.

## ئەمەتو اللە عەلی ئەحمەد کوردی (٢٨٠)

ناوی ئەمەتواللە یە، کچی عەلییە، کوڕی ئەحمەدی کوردییە، خەڵکی شاری (بەعلەبەك)ە، مامۆستا محەممەد عبدالرحمان سەخاوی دەڵێ: {لە دەوریساڵی ٨٦٠ك – ١٤٥٦ز لە شاری بەعلەبەکەم دیت، دەرسم لە لای خوێند، ئیجازەی پێدام} دوای ئەو مێژووە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١٢/١٠.

٢. معجم أعلام الکورد ١١٨.

٣. مشاهیر الکورد ٤٣٥.

## ئەمجەد محەممەد ئەییوبی (٢٨١)

ناوی ئەمجەدە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئەییوبە، نازناوی (تەقیەدینە) لە مەلیکەکانی خزمی سوڵتان صەلاحەدینە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، دەرسی فەرموودەی داوە، مامۆستا دمیاطي و ئیبن خەبباز زانیاریان لێ وەرگرتووە، ناوبراو لە لای مەلیکان ڕێزی تایبەتی خۆی هەبووە، بە تایبەت مەلیك ظاهیر بیبەرس زۆر حورمەتی گرتووە، هەروەها خەلکان بە پیش خۆیان دەدا و بە پێشی نەدەکەوتن لە ٦٦٩ك – ١٢٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ١١٧.

## ئەمجەد محەممەد سەعید زەهاوی (٢٨٢)

ناوی ئەمجەدە، کوڕی محەممەد سەعیدی، کوڕی محەممەد فەیزی زەهاوییە، خەڵکی (پشدەرە)، بەڵام باپیری ماوەك لە زەهاوی (ئێران) بووە و خوێندوویەتی بۆیە ناوبراوە بە: (زەهاوی)، ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لە شاری (بەغدا) هاتووتەدنیا.

لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان سێ ساڵ لە قوتابخانەی (الرشدية)ی خوێند، دوایی چووە قوتابخانەی ئیعدادی مەلەکی، بە چوار ساڵ ئەوی تەواوکرد، دوایی لەگەڵ پەنجا قوتابی چوونە قوتابخانەی (نواب) لە ئەستەمبوڵ بە شەش ساڵ ئەوی تەواو کرد، لەبەر ئەوەی پلەی یەکەمی وەرگرت، سوڵتان (عبدالحميد) حەزی کرد بیکات بە ئەندامی دادگای ئەستەمبوڵ بەڵام مامۆستا لەسەر ئەو پێشنیارە سوپاسی سوڵتانی کرد و گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی هەڵبژارد، گەڕاوە (بەغدا) هەرچەندە زۆر پەرۆشی بەجێهێشتنی برادەرەکانی بوو بە تایبەت (بديع الزمان) شێخ محەممەد سەعید نورسی.

پلەو پایەکانی: ساڵی ١٩١١ز کرا ئەندامی دادگای (بەغدا)، دوایی گواستراوە (بەصرا) لەوێ کرا سەرۆکی دادگای سەرەتایی، ماوەی سێ ساڵ لەوێ ماوە، دوایی لەسەر داوای خۆی ناردرا (موصل) لەوێ کرا سەرۆکی دادگا، پێنج ساڵ لەوێ ماوە، هەر لە موصڵ لە ١/١/١٩١٨ز کرا ئەندامی دادگای سەرەتایی، لە ١/٤/١٩١٩ز گواستراوە (بەعقوبة) دوایی گەڕاوە (بەغدا) دەستی کرد بە (پارێزەر)ی، لە ١٩٢٠ز کرا ڕاوێژکاری مافپەروەران لە ئەوقاف (بەغدا)، هەروەها وانەبێژ بوو لە کۆلێژی مافپەروەران لە زانکۆی (آل البيت)، دەرس بێژ بوو لە قوتابخانەی (سليمانية) لە بەغدا، پاشان کرا سەرۆکی ئەنجومەنی تەمیزی شەرعی سونی، لە (بەغدا)، لە بەرواری ١٩/٣/١٩٤٦ز خانەنشین کرا.

خوێندنی مەلایەتی: لە سەرەتاوە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لەسەر فەرموودەی باوکی چووە لای شێخ عەبباس حیلمی قەساب (مغنی اللبیب)ی تەواوکرد، بۆ خوێندنی فەلەك و حیکمەت چووە لای مەلا غولام رەسولی هیندی، وە لە لای شێخ عبدالرحمان قەرەداغی (ابن الخیاط) جمع الجوامعی تەواوکرد، هەروەها لەو ماوەی لە ئەستەمبۆل بوو، کتێبی (الدرر)ی لە لای مامۆستای قوتابخانەی (بایەزید) خوێند، هەر لە لای ئەو بەرێزە ئیجازەی وەرگرت.

دەرسدانەوەی: لەو ماوەی لە (تورکیا) بوو سێ ساڵ لەو قوتابخانانە دەرسی داوە: (ئەیا صوفیا)، (شەریف)، (بایەزید)، دوایی کرا دەرس بێژ لە قوتابخانەی (نائیلە خاتوون) لە بەغدا، لە ٢٤/٥/١٩٢١ز کرا دەرس بێژ لە قوتابخانەی (سلیمانیة) لە بەغدا، لە ساڵی ١٩٤٠ز تا ساڵی ١٩٤٦ز لە بەیانی تاکو نێوەڕۆ دەچووە ئەنجومەنی تەمیزی شەرعی، دوای نیوەڕۆ تاکو ئێوارە دەرسی فەقێیەکانی دەدا لە قوتابخانەکەی خۆی. لە ١٩/٣/١٩٤٦ز کە خانەنشین کرا، دەس بەتاڵ ماوە پتر ڕووی خۆیدا دەرسی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ عبدالقادر (خطیب)، شێخ فوئادی ئالووسی، محەممەد صادق موختار (هەولێری)، مەحمود عبطه (پارێزەر)، مەلا عبدالله ی فەرهادی، دکتۆر محەممەد شەریف دووشیوانی، نیهال خانی کچی خۆی.

سەفەرەکانی: مامۆستا لەبەر ئەوەی سەرۆکی یەکگرتووی زانایانی عێراق و سەرۆکی ئەنجومەنی پەروەردەی ئیسلامی بوو، سەفەری بۆ زۆر وڵاتان دەکرد، بە مەبەستی کۆبوونەوەی ئەندامەکان بۆ لابردنی ئەو گیروگرفتانەی دێنە پێش مرۆڤی موسولمان و نەهێشتنی کێشەکان، لەوانە: ئەندەنوسیا، ئوردن، میصر، تورکیا، سعودییە، سوریا، لبنان، هیندوستان، پاکستان.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی هەینی (١٤) مانگی شەعبان ساڵی ١٣٨٧ك – ١٩٦٧ز لە ماڵی خۆی لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، کوردستان و بەغدای چۆڵکرد، یونس

ئەفەندی كوڕی ١٩١٨ز لە موصل هاتووتەدنیا، لە بەغدا و لە (قاهیرە)ی خوێندووە، لەو شوێنانە (قازی) بووە: هەولێر، كەركوك، موصل، بەصرا، بەغدا.

سەرچاوەكان:

١. الإمام أمجد الزهاوي ٧٣.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی كورد ٤/٢٣١ – ٢٤٦.

٣. علماء الإسلام ١٩٨ – ٢٠٧.

## ئەمیری بەختیار شنۆیی (٢٨٣)

ناوی ئەمیرە، كوڕی بەختیاری، كوڕی خلەی، كوڕی محەممەدی، كوڕی عبدالله یە، نازناوی (ئەبومحەممەد)ە، ساڵی ٥٤٥ك – ١١٥٠ز لە (شنۆ) هاتووتەدنیا، ساڵی ٥٥١ك لە ئەنجامی لافاوێكی گەورە شنۆی بەجێ هێشت هاتە (هەولێر)، لە سەرەتاوە خەریكی فێربوونی شەریعەت بوو، كتێبی شەهابی قوضاعی هەموو لەبەركرد، پاشان چووە لای مامۆستا محەممەدی كوڕی یونس، لە (موصل) ماوەكیش لە لای مەلا عبدالله ی كوڕی ئەحمەدی طوسی خوێند.

خووڕەوشتی: زانایەكی لە خواترس بووە، بە دین بووە، دنیای نەویستووە قیافەتی ڕێك بووە، زاتەكی بە سام بووە، لە كاری خێر خۆی ماندوو دەكرد پێكەنینی گرژینەوە بوو، زۆر تەماشای كتێبانی تەسەووف دەكرد، لەسەر ئەو ڕێبازە دەڕۆیشت نانی دەستی خۆی دەخوارد، شەوان نوێژی دەكرد، ڕۆژان تەسبێحاتی دەكرد.

كۆچی دوایی: لە ٦١٤ك – ١٢١٧ز كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوەكان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٠١.

٢. طبقات الشافعيه الكبرى ٤/٣١١.

٣. تاريخ أربيل ١/٥١ – ٣٠٦.

## ئەمین ئەحمەد موفتی (٢٨٤)

ناوی ئەمینە، کوڕی مەلا ئەحمەدە، ناسراوە بە (موفتی)، زانایەکی بە توانا بووە لە ١٣٠٣ك کرا حاکمی (سلێمانی)، لە ١٣٠٨ك کرا موفتی، سەفەری ئەستەمبولی کرد، کتێبێکی لە زانستی (کەلام) دانابوو، پێشکەشی بە سوڵتان عبدالحمید کرد، ناوینابوو (الرسالة الحمیدیة) لە ڕێگای (شێخ الاسلام) لێی وەرگیرا، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) حاشیەی لەسەر ئەو کتێبە هەیە. مامۆستا ئەمین ساڵی ١٣١١ك – ١٨٩٣ز کۆچی دوایی کرد، لە گردی (سەیوان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٤٦٣.

٢. تاریخ مشاهیر الکورد ٢/٥٧.

## ئەمین باوەکۆچەکی (٢٨٥)

مامۆستا شێخ ئەمین لە سەیدەکانی گوندی (باوەکۆچەکی) سەر بە قەزای (هەڵەبجە)یە، دەچێتەوە سەر سەیدەکانی گوندی (سازانی) سەر زێی (سیروان)، دەوری ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، لە قوتابخانەکانی هەڵەبجە و ئەبوعوبەیدە و بیارە زانیاری وەرگرت، لە خزمەت مامۆستا عبدالقادر (مدرس)ی بیارە کۆتایی پێ هینا، گەڕاوە (باوەکۆچەك) قوتابخانەی دامەزراند و دەستی کرد بە دەرس دانەوە، چەند باخچەی هەبوون، بەروبوومەکەیانی خەرج دەکرد لە بەخێوکردنی فەقییەکان تا دەبوونە مەلا.

مامۆستا دوای نوێژان دەپاڕاوە خوایە حەجم بە قسمەت بێ و نێمەوە لەوێ بمرم، خوای گەورە دوعایەکانی قەبول کرد، ساڵی ١٣٣٣ك – ١٩١٤ز چووە حەج، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد و نەهاتەوە. مەلا محەممەدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٠٢ – ١٠٣.

## ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی ( ٢٨٦ )

ناوی ئەمینە، کوڕی شێخ عەلائەدینی، کوڕی شێخ عومەری نەقشبەندییە، ساڵی ١٩٣١ز لە گوندی (بیارە) ناحیەی (خورماڵ) قەزای (هەڵەبجە) پارێزگای (سلێمانی) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی بە خوێندن کرد لە خزمەت مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) و مەلا بەهائەدین، قورئانی پیرۆز و ڕێزمانی عەرەبی و تەجوید و زانیاری ئاینی خوێند، ساڵی ١٩٤٤ز لەگەڵ برایەکانی چووە (دێرەزۆڕ) سەردانی ماڵە خالانی، لەوێ بە چاکی فێری زمانی عەرەبی بوو، گەڕاوە (بیارە) باوکی گوندی (ئەحمەد ئاوا)ی پێ بەخشی، دەستی کرد بە ئیش و کاری کشتوکاڵ لە ١٩٦٣ز چووە (دزلی)، دوایی چووە (تاران) لە زانکۆی بەشی عەرەبی وەرگیرا، فێری زمانی فارسی بوو، لە ١٩٧٨ز چووە (سنە)، لە ١٩٧٩ز گەڕاوە وڵات، دوایی لە (بەغدا) نیشتەجێ بوو، پرس پێکراوی سەرۆکی دیوانی ئەوقاف بوو.

کۆچی دوایی: لە ١٩٩٨ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (دیوانی بێوەی) هەیە: لە ١٩٨٧ز لە چاپ دراوە، (تەسەووف چیێ یە؟)ی هەیە: لە ١٩٨٥ز لە چاپ درا، دکتۆر محەممەد شەریف تەرجومەی کردووە وەلای عەرەبی.

سەرچاوە: اعلام کورد العراق ١٣٥ – ١٣٦.

## ئەمین شێخ محەممەد خال ( ٢٨٧ )

ناو و نژادی: ناوی ئەمینە، کوڕی شێخ محەممەدی خالە، کوڕی مەلا ئیسماعیلی، کوڕی مەلا مصطەفای کوڕی مەلا شەمسەدینە، لە نەتەوەی ئەبوبەکری (مصنف)ە، ساڵی ١٢٥٩ك – ١٨٤٣ز لە شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لە لایەن زانایە بەناوبانگەکانی وەکو مامۆستا محەممەدی

کوانەدولی و شێخ عبـدالقادر موهـاجیری (سـنە) قۆناغـەکانی بـڕی، ئیجـازەی مەلایـەتی وەرگرت.

پاشان بە نیازی پاك بوونـەوەی دەروون لـە خواسـتەی نـەفس و شـەیتان وە بـۆ بەهێزکردنی خواپەرستی چووە (تەوێڵە)، تەریقەتی نەقشبەندی لـە شـێخ بەهائـەدینی شـێخ عوسمان وەرگرت، لە لایەن شێخ کرا بە (خەلیفە)، گەڕاوە (سلێمانی) دەستی کرد بە ڕێ نیشاندانی خەڵکان و خواپەرستی، پلە و پایە و موچەی حکومـەتی وەرنـەگرت. (شـێخی خال) زمان ڕەوان بوو، بە کوردی و عەرەبی و فارسی شیعری هەیە.

کۆچی دوایی: لە ساڵی ١٣٥٠ك - ١٩٣١ز کۆچی دوایـی کـرد. لـە گـردی (سەیوان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٠١ - ١٠٢.

٢. تاريخ السليمانية ٢٣١.

٣. یادی مەردان ٢/٥٠٩ - ٥١٠.

## مەلا ئەمین هەولێری (٢٨٨)

مامۆستا ئەمین، زانایەکی مەزن بووە، لە حیکمەت و فەلەك زانیاری بەهێز بـووە، خەڵکی (هەولێر)ە، ماوەك لە گوندی (عـالـلا) مـەلا بـوو، فـەقێی هـەبوون مـەلا طاهـای قوشاغلو یەکە لەوانەی لەلایان خوێندووە، چەند کورتە حاشیەی لەسەر توحفە و کـەمالی صەرف هەیە، سەفەری حەجی کرد، بە ڕێگای میصر و لوبنـان، سـاڵەکی خایانـد، دوای هاتنەوە دەشتی بە جێ هێشت، گەڕاوە (هەولێر) لە قوتابخانەی مەلا ئەحمـەدی گـڕاوی لـە (قەلات) دەرسی دەدا، تا کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو بە ناوی مەلا سولەیمان.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٢٨٩.

- ب -

## بابارەسول بێدەنی (٢٨٩)

ناو و نژادی: ناوی رەسولە کوڕی ئەحمەدی عبدالصمدی، شێخ سولەیمانی صولەیی قەرەداغی یە، لە نەتەوەی سەید قەلەندەرە، سالّی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز لە گوندی (بێدەن) هاتووتەدنیا، لە لای مەلا محەممەدی بێدەنی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە زووەوە باوکی کۆچی دوایی کرد دایکی ناردیە لای شێخ مەحمودی موفتی (هەڵەبجە)، ماوەك لەوێ ماوە دوایی چووە (پرێس) لای مەلا قادری مەلا مونمین، هەر لە خزمەت ئەو مامۆستایە، چووە (قزلبات)، دوایی گەڕاوە (سلێمانی) ماوەك لە لایەن مەلا محەممەد کوکوئی و مەلا بابا عەلی تەکیەی خوێند، پاشان چووە (بیارە) جەنابی شێخ نەجمەدین لە لای مەلا قادری دامەزراند، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هێنا، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ نەجمەدین وەرگرت، ماوە لەوێ خەریکی دەرسی فەقێیان و خواپەرستی بوو، کە سالّی ١٩١٨ز شێخ نەجمەدین کۆچی دوایی کرد، مەلا قادریش هەروەها کۆچی دوایی کرد، جەنابی شێخ عەلائەدین گەڕاوە (بیارە) بابارەسولی کردە (مدرس) ماوەك دەرسی داوە، دوایی باری کرد بۆ (هەڵەبجە) لەوێش ڕۆیشت چووە (سۆلا) لەوێش باری کرد چووە (زەڵەڕەش) لای حوسێن بەگی مەحمود پاشا سالّی ١٣٤٦ك – ١٩٢٧ز چووە (عەبابیلێ) ماوە لەوێ تا سالّی ١٣٦٣ك – ١٩٤٤ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا هەروەکو مەلایەکی چاك بوو، هەروەها شاعیر و ئەدیب و ڕۆشنبیر بوو شیعری کوردی و فارسی هەیە، نموونەی شیعرە کوردیەکان:

ناتیقەی حالی وەتەن دەرسی وەتەن تەقریر ئەکا

کاتبی دل حەرفەکانی، یەك بە یەك تەحریر ئەکا

بەعزە ئەشخاسێ هەیە، مەیلی لە خورما خواردنە

زائیقەی بەعزێکی تر، مەیلی ترێ و هەنجیر ئەکا

کەعبە کەچ نابی بە کوردی، ناوی کوردستان ئەبەم
پێم بلێن واعیز بە تورکی بۆچی من تەکفیر ئەکا؟
پێنج خشتەکی لەسەر شیعری مەحرِوم:
حالە بەدحالی ئەمن مەعلومە ئیفشای عالەمە
دیدە پڕ ئاب و جگەر داغ و زوبانم ئەبکەمە
عەیش و شادیم چاوەکەم گریان و شین و ماتەمە
ساکینی گۆشەی دەروونم، پێم مەڵێ: دەردت کەمە
خۆ لە باتی لەعلی فەننەر حوجرەکەم مەملوی خەمە
تاقەتی سەبر و قەرار و هۆش و ئارامم چووە
مەسلەحەت وایە سەری خۆم هەڵگرم تاکو زووە
بۆ کەسێ دینی ببێ لەم جێگە نیشتن قەت بووە؟
حوجرەکەی ئەم دیو یەقینەن هەروەکو قەبری جووە
چۆن لە باتی لەعل و لەمپا دود و عەقرەب هەمدەمە
من فیرارم کرد لە دەست ئەو جێگە ڕێم تێ کەوتەوە
بەختم هەڵسابوو لە خەو دووبارە بۆ خۆی خەوتەوە
ڕەبی وێران بی بە حوجرەو مەدرەسە و مزگەوتەوە
من خۆ مەحرومم لە چایێ، هەم لە دار و نەوتەوە
بەحسی (دۆینەش) خۆت ئەزانی دەردو و حەفتە یەك ژەمە

سەرچاوەکان:
١. یادی مەردان ٢/٥٩١ – ٦١٧.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١١٦ – ١٢٠ – ٣٢٢ – ٣٢٤.
٣. کەشکۆڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی ٤/١٠٤ – ١٠٥

## بابا رەسول عبدالسید بەرزنجی (٢٩٠)

ناوی بابا رەسولە، کوڕی عبدالسیدی، کوڕی عبدالرسولی، کوڕی قەلەندەری، کوڕی عبدالسیدی، کوڕی عیسای، کوڕی حوسێنی، کوڕی بایەزیدی، کوڕی عبدالکریمی، کوڕی شێخ عیسایە – کە یەکەم کەسە لە (بەرزنجە) دابەزیوە–، (سەید بابارەسول) لە دەوروبەری ساڵی ٩٧٠ك – ١٥٦٢ز لە (بەرزنجە) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، بۆ دەست کەوتنی زانیاری لە چەند شوێنان گەڕا، شەریعەتی لای شکر اللهی شێخ نیعمەت اللهی خوێند، هەروەها کتێبی (مەصابیح) لە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)، دوایی چووە لای مەلا موسای تەوەککەلی (جمع الجوامع)ی خوێند، وضوحی شەرحی (محرر)ی لە خزمەت مەلا ئەبوبەکری (مصنف) خوێند، هەر لە خزمەت ئەو ئیجازەی وەرگرت.

(بابارەسول) گەڕاوە (بەرزنجە) دەستی کرد بە درەس دانەوەی فەقێیان و ئامۆژگاری موسوڵمانان، زانا و پیاوچاکان دەستە دەستە دەهاتنە لای بۆ وەرگرتنی زانیاری گەیشتە پلەیەکی وا، فەرموودەکانی بە پەند دەگێڕدرانەوە. مامۆستا هەرچەندە خەریکی دەرس و تەریقەت و تاعەت بوو حەزی لە ڕاووشکار دەکرد، زۆر جار دەردەچوو بۆ دەشت.

مامۆستا لە ژیانیدا پێنج ژنی هێنابوو، لە هەموویان حەڤدە کوڕی هەبوو ناوەکانیان ئەوانەن: عبدالصمد، عبدالکریم، عبدالسید، علی، ئیسماعیل، ئیسحاق، حەسەن، حوسێن، یوسف، ئەحمەد، محەممەد، ئیبراهیم، حەیدەر، ذوالنون، عبدالرسول، بایەزید، زین العابدین، دەڵێن کوڕەکی تری هەبوو ناو: (سوڵتان).

زنجیرەی سەیدەکانی (بەرزنجە) لە کوردستان هەموویان دەچنەوە سەر ئەو زاتانە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٠٧ – ١١١.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٢٩٧ – ٣٠٨.

## بابا شیخ عبد اللە کاژاوی (٢٩١)

ناوی باباشێخە، کوڕی عبداللەی، کوڕی محەممەدە، ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز لە شاری (بانە) هاتووتەدنیا، لە قوتابخانەی باوك و باپیرانی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە چەند شوێنان بۆوەی قۆناغەکانی خوێندن ببڕی، باوکی کۆچی دوایی کرد، مامی شێخ یحیی لە جێی دانیشت، (بابەشێخ) چووە (بیارە) ماوەکی زۆر لەلای مەلا عبدالقادری (مدرس)ی خوێند، پاشان گەڕاوە لای مامی یارمەتی دەدا بۆ دەرس دانەوە و کاروباری ئاینی.

ساڵی ١٣٣٦ك چوونە (چۆیە) نزیك (پێنجوین) لەوێ مامی کۆچی دوایی کرد، باباشێخ باری کرد، بۆ گوندی (دیمەیەو) لە هەورامان پاشان چووە (بارام ئاوا)، دوو ساڵ لەوێ بوو، دوایی چووە (ئەلمانە) لەوێ فەرەجو اللە بەگی هەورامی قوتابخانەی بۆ دامەزراند، دەستی کرد بە دەرسدانەوە ساڵی ١٣٥٠ك چوونە حەج، لە ١٣٧٥ك – ١٩٥٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٢١ –١٢٢.

## باباشێخ عبدالکریم زەنبیلی (٢٩٢)

ناوی باباشێخە، کوڕی عبدالکریمی، کوڕی عەلی، کوڕی باباشێخی، کوڕی عبدالقادری، کوڕی مەحمودی، کوڕی عبدالغفوری کوڕی مصطەفای کوڕی حەسەنی، کوڕی جامی کوڕی عبدالکریمی، کوڕی سەید حەسەنی ناسراو بە: (ئەبوبەکری مصنف پیرخضری شاهۆیی) – خوا لێی خۆش بی –.

لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٥ك – ١٨٨٧ز هاتووتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر و ماقووڵ و ڕوو لە زانیاری پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، خەریکی فێربوونی زانستەکان بوو، تا تێربوو لە زانیاری قورئان و فەرموودە بەشێکیشی لە زانستە عەقلیەکان خوێند، گەڕاوە گوندەکەی خۆی، قوتابخانەی فەقێیانی دانا.

مامۆستا زەنگین بوو، خاوەن ڕەز و باغ بوو، خەرجی فەقێیەکان و مێوانەکانی هەموو لە ئەستۆی خۆی بوو، شتی لە کەس وەرنەدەگرت ساڵی ۱۹۱۷ز- ۱۳۳٦ك لەشکری ڕووسە قەیسەرەکان هێرشیان هێنا سەر ناوچەی موکریان و زەنبیل، مامۆستا خۆی و منداڵەکانی و برایەکانی ئاوارە بوون، بۆ شاری (سلێمانی)، پاشان دوشمن پاشەکشەی کرد، مامۆستا گەڕاوە جێگای خۆی دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە و خزمەتی ئاینی پیرۆز، لە دەوروبەری ساڵی ۱۳٦۳ك - ۱۹٤٤ز کۆچی دوایی کرد، سەید عەزیزی کوڕی جیگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ۱۲۲ - ۱۲۳.

## بابا شێخ مەعروفی قەرەداغی (۲۹۳)

ناوی بابا شێخە، کوڕی شێخ مەعروفی، کوڕی شێخ عومەرە، لە دەوروبەری ساڵی ۱۲٦۰ك - ۱۸٤٤ز لە شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە مزگەوتی باباشێخ لەبەر خوێندن دانرا، چووە دوو خوێندن، وازی نەهێنا تا کۆتایی پێ هینا، ئیجازەی وەرگرت، هەر لەو مزگەوتە دەستی کرد بە دەرسدانەوە، مامۆستا زانایەکی بە توانا بوو، چەند حاشیەی لەسەر (تقریب المرام)ی شەرحی تهذیب هەیە، خەریکی خزمەتی ئاین بوو، تا کۆچی دوایی کرد، لە گردی (سەیوان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ۱۱٦.

## بابا طاهیر فەریدون هەمەدانی (بابا طاهیری عوریان) (۲۹٤)

ناوی طاهیرە، کوڕی فەریدونە، لە پیاوە چاکەکانی ئاینی بووە، بۆیە ناوبراوە بە (بابا) دەستی لە دنیا بەرداوە، خەریکی ماڵداری و سامان و سەروەت نەبووە، ناوبراوە بە (عوریان) واتە: (ڕووت - ڕووتەڵە)، خەڵکی (هەمەدان)ە، ساڵی ۳۲٦ك - ۹۳۷ز هاتووتەدنیا، زانایەکی زەین تیژ و بیر قوڵ و خاوەن هەست بووە، شیعری کوردی و لوڕی و گۆرانی هەیە، لە زانیاری فەلسەفە و گەردووناسی و تەسەووف سەرکەوتوو بووە،

شیعرەکانی جگە لە مانای سەرەوە مانای نهێنییان هەیە، کە تایبەت بەو سوارانەن بتوانن لەو مەیدانە قۆشمە بکەن.

شیعرەکانی (بابا طاهیر) لە کوردیدا بە شیعرەکانی (ابن الفارض) دەچن لە عەربی، بۆیە نووسەران سەریان سوڕمایە و زەریف تێ نەگەیشتوونە لەبیروڕای باباطاهیر، هەندەك دەڵێن: (حەققە)بووە، هەندەکی دی دەڵێن: (عەلی ئیلاهی – عەلیەللایی) بووە، هەندێك دەڵێن: (شیعە) بووە، هەندێکیش دەڵێن: یەك بووە لە زانا و دانایەکانی سەردەمی خۆی خاوەنی کەشف و کەرامات و مەقاماتی بڵند بووە، منیش هەروەها – بە پێی چەند شیعرێك، کە دکتۆر مارف خەزنەدار مانای کردوون – وا تێدەگەم: کە زاتەکی خواناس و ئایین پەروەر و ڕوو لە خوا و دڵپاك و بڕوا صاف و ئەهلی تەسەووف بووە، بۆ نمونە، دەڵێ:

گەر ئەژ زەر ئەو نەهی دیوانە ئەز گل	بە پەرچینەش کری وانووشەو و ول
گەر ئەو بشنەش نەهی ئان داری ششماد	گەر ئەو روونەش کری ئاواجی بلبل
سەرەنجامان بشی بە پا بە هەرزی	پایی تە گوروی ماوایی تە گل

واتە:

با لەباتی گڵ و خاك تەلارێك لە زێڕ دروست بکەی
لەگول و وەنەوشە، پەرژینی بۆ بکەی
با لە سایەی ئەو داری شمشادە دابنیشی
با لە هەموو لایێکەوە بلبل ئاواز بپڕژێنی
سەرەنجام، لە ناودەچی و نامێنێ
جێگەت، گۆڕ و مەئوات (گل) دەبی

ئەو مانایە لە ئایەتی: ﴿كل من عليها فان﴾ (الرحمن / ٢٦) وەرگیراوە. جارەکی دیکە دەڵێ:

ئەلف ژ کاف و نونەش سەر بەر کەرد	هەمەش هامان گهان ئەو لاجیوەر کەرد

ئانکیش ئەو ئافیری گەردونی گەردان      ئانیش ئەد سات و مەن ئەنداجە ئەر کەرد

واتە:

کە کافو نوونی وت و گێتی دروست کرد

گێتی بە ڕەنگی لاجیوەردی خستەڕوو

ئەو کەسەی گەردوونی گەردان دەسوڕێنێتەوە

هەر ئەویشە ئەدگاری ئێمەشی داڕشتووە

ئەو بڕوایيە لە ئایەتی: ﴿إنما أمره إذا أراد شيئاً أن يقول له كن فيكون﴾ (یاسین / ٨٢) وەرگرتووە، باباطاهیر لە ٤١٠ك – ١٠١٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. دەقەکانی ئەدەبی کوردی ٤٤ – ٤٥.

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ١/١٨٤ – ٢٠١.

٣. تاريخ مشاهير كورد ١/ ٢٥ – ٢٩.

٤. مشاهير الكورد ١٣٣ – ١٣٥.

٥. معجم أعلام الكورد ١٣٤ – ١٣٥.

## بابا عەلی عبدالله تەکیەیی (٢٩٥)

ناوی بابا عەلییە، کوڕی شێخ عبداللّەی، کوڕی عەلییە، لە نەتەوەی ئیمام هەمزەی زیارەتگای گوندی (تەکیە)ی قەرەداغە، ساڵی ١٢٧٥ك – ١٨٥٨ز لە گوندی (تەکیە) هاتوتەدنیا، هەر لەو گوندە پەروەردەبووە و لەبەر خوێندن دانراوە، ماوەك چووە قوتابخانەکانی قەرەداغ و سلێمانی، پاشان چووە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ نامەکی لێ وەرگرت بۆ مەلا عومەر ئەفەندی (هەولێر)، جەنابی شێخ لەو نامەیە داوای جێکردنی لێ کردبوو بۆ بابا عەلی، هەروەها لەو نامەیەدا نووسی بۆ مەلا عومەر: مزگێنی بێت دووژمنەکەت لەو زووانە دێتە لات داوای لێبوردنت لێ دەکات.

بابا عەلی هاتە هەولێر نامەکەی دادەست مامۆستا، کە خوێندییەوە لەوکاتەش دووشمنکە هاتبوو، زۆر کەیفی هات، زانی ئەوە کەرامەتی شێخە، بابا عەلی ماچ کرد پێی گۆت: خۆت خاوەنی قوتابخانەکەی فەرموو تەشریف بکە، (بابا عەلی) ماوەك لەوی لەگەڵ مەلا عبداللەی وەلزی لە مزگەوتی قەڵات خەریکی خوێندن بوو، تا ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوە (سلێمانی) لە مزگەوتی باباعەلی کرا (مدرس)، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، لەوانە شێخ نوری کوڕی بوو، مامۆستا لە ١٣٥٩ك – ١٩٤٠ز لە (سلێمانی) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٢١٤ – ٢١٨.

٢. أعلام کورد العراق ١٤٧ – ١٤٨.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١١٣ – ١١٥.

## باقر حوسێن بالکی (٢٩٦)

ناوی باقرە، کوڕی مەلا حوسێنە، ناسراوە بە حوسێن خان، لە نەتەوەی ئەحمەدی خانی ئەردەلانی یە، ساڵی ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز لە گوندی (هەنی مەن) نزیك شاری (سنە) هاتوەتەدنیا.

خوێندنی: لە تەمەنی حەوت ساڵی دا دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، لەبەر زیرەکی لە ماوەی سێ مانگ خەتمی کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، لە چەند شوێن گەڕا تا خوێندنەکەی بباتە سەر ئەوەبوو ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز چووە قوتابخانەی (بوری دەرە) لە ناوچەی (ژاوەرود)، شەرحی شەمسیەی لە لای مەلا ئەسعەد تەواوکرد، پاشان ئیجازەی لە مەلا محەممەدی عارفی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی وەرگرت، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) (خوا لێی خۆش بی) دەڵێ: بیستوومە ئیجازەی لە مەلا عبداللەی موفتی کوڕی مەلا مەحمودی دەشی وەرگرتووە.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (چۆڕە)، سێ ساڵ لەوێ دەرسی داوە، ساڵی ١٣٤١ك چووە گوندی (بالك) - لامەکەی تۆزەك بۆلای ژێر دەخوێندرێتەوە، وەکو لامی باڵەکی چۆمان نیە - لە ناوچەی (مەریوان)، پاشان چووە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلائەدین وەرگرت، ماوەك لەوێ لەسەر فەرموودەی شێخ دەرسی داوە، دوایی گەڕاوە (بالك)، مامۆستا لە کاتی فەقێیەتی و مەلایەتی برادەراتی بتونی لەگەڵ مامۆستا عبدالکریم (مدرس) هەبوو، زۆرجاران لەگەڵ یەك کۆدەبوونەوە، لە بالك، لە بیارە، لە بەغدا.

کۆچی دوایی: پاش شەش سعات لە کۆتایی دەرسی (جمع الجوامع) لە ١٩ مانگی ذي القعده ساڵی ١٣٩٢ك - ١٩٧٣ز ماڵئاوایی لە فەقێیان کرد.

بەرهەمەکانی:

١. الألطاف الإلهية: شەرحی (الدرر الجلالية في الكلام والحكمة)، دووبەرگە، لە ١٣٧٤ك - ١٩٥٤ز تەواوی کردووە، لەسەر ئەرکی شێخ عوسمان سیراجەدین لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا.
٢. الرد على منكري الطلقات الثلاث: لە دەنگی زانا ١٩٩٧/١٠ز بەلاوکراوە.
٣. ئەرمەغانی جەوانان: لە زانستی (نەحو)ە، بە زمانی فارسی.
٤. مەحمودییە: باسی نیکاح و تەڵاقە بە کوردی لە ١٩٨٣ز چاپ کراوە
٥. التوفيق بين الشريعة والطريقة: مەلا محەممەدی (بداقی) لە فارسی تەرجومەی کردووە، وەلای عەرەبی.
٦. مدیحەی موحەممەدییە: هۆنراوەی فارسییە لە ١٣٥٣ك تەواوی کردووە.
٧. الفريدة في العقيدة: هۆنراوەی باوەڕییە (٤٣٠) بەیتە لە ١٣٣٧ك تەواوی کردیە.
٨. : هۆنراوەی کوردییە، لە بابەت (باوەڕ) بۆ فاتیحی کوڕی داناوە.
٩. فائقیة: هۆنراوەی کوردییە، لە ئەوسافی پێغەمبەر (د.خ) لە ١٣٧٦ك تەواوی کردووە، لە ژمارە (٦) تا کۆتایی، بە ناوی دیوانی (مدرس)ی کوردستانی مەلا

محەممەد باقر بالك مەریوانی (متخلص) بە (غەریق) ساڵی ١٤٠٦ك لە (ئێران) چاپ کران.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٢٥ – ١٢٨.

٢. تاريخ مشاهير الكورد ٢/٤٢٩.

٣. دەنگی زانا (١٠) ١٩٩٧ز، ٧٠ – ٧٥.

## بەختیار نامدار کوردی ( ٢٩٧ )

ناوی بەختیارە، کوڕی نامداری، کوڕی جەعفەرە، نازناوی (ئەبولخەیر)ە، ساڵی ٥٤٥ك – ١١٥٠ز فەرموودەکان و ئامۆژگارییەکانی کتێبی (تنبيه الغافلين)ی لە مامۆستا ئەحمەد موسای شنۆیی وەرگرتووە، وەمامۆستا ئیجازەی پێداوە، لەو خوێندنە دوو هاوڕێی هەبووە: عبدالوەهابی کوڕی عەلی ئەمین و محەممەد کوڕی حوسێن تکریتی.

سەرچاوە: الكفايه في المواريث /ملحق/ ١٨٧.

## بەدرەدین سنجاری ( ٢٩٨ )

مامۆستا قازی بەدرەدین، خەڵکی (ژەنگار)ە، چەند جار کرایتە قازی (میصر)، زاتەکی چاوبلێند و سەخی بووە، ساڵی ٦٦٣ك – ١٢٦٤ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: البداية والنهاية ١٣/٢٥٠.

## بەرەکە ئەحمەد عبدالرحیم ( عیراقی ) ( ٢٩٩ )

بەرەکەخان: ناز ناوی (ئوم ئەیمەنە)، کچی فەرموودەناس ئەحمەدی (ئەبوزەرعە)ی کوڕی عبدالرحیمی حافیزی عیراقییە، لە مانگی شەوالی ساڵی ٧٩٣ك – ١٣٩١ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە خزمەت باپیری خوێندییە و ئیجازەشی لێ وەرگرتییە، بە خۆشی دەرسی فەرموودەی داوە، ساڵی ٨٤١ك – ١٣٣٧ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کردییە.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٢/١٣.

## بورهانەدین عبدالحمید ( حەمدی ) ( ٣٠٠ )

ناوی بورهانەدینە، کوڕی مەلا عبدالحمیدە، نازناوی (حەمدی)یە، ساڵی ١٣٢٢ك – ١٩٠٤ز لە شاری (سنە) چاوی خۆی لە دنیا هەڵێناوە، منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، ناردیانە بەر خوێندن، لە چەند شوێنان گەڕا، لە لایەن چەندان زانایان، لەوانە: مەلا صادق و مەلا حبیب الله و مەلا عبدالعظیم، چەند مەتنی لەبەر کردن، لە ئەنجامدا ساڵی ١٩٥٣ز لای مەلا صادقی مینبەری ئیجازەی وەرگرت، ماوەك لە سنە دەرسیداوە، ساڵی ١٣٥٦ك کرا بەرپرسی ئەوقاف لە ١٤٠٧ك – ١٩٨٦ز کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی تەرجومە کردووە: (الأربعین للغزالي)، (رسائل حي بن يقظان)، (العقائد للتفتازاني)، (بانت سعاد)، (لامية العرب)، (لامية العجم)، (لامية الكرد)ی عیرفان سنەیی.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر الكورد ٥٣٠ – ٥٣١.

## بشر یەحیا عەلی ( ٣٠١ )

ناوی بشرە، کوڕی یەحیای کوڕی عەلییە، نازناوی (ئەبوضیایە) خەڵکی شاری (نوسەیبینە)، شاعیر و ڕۆشنبیر بووە، چەند کتێبی داناون لەوانە: سرقات البحتري من أبي تمام، الجواهر، الآداب، كتاب السرقات الكبير: ئەوەی تەواو نەکردووە.

سەرچاوەکان:

١. الفهرست ١٤٩.

٢. هدية العارفين ١/٢٣٢.

## بەکر وەلی هەولێری ( ٣٠٢ )

مامۆستا بەکر، کوڕی مەلا وەلی هەولێرییە، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی ئیجازەی لە مەلا عبدالرحمانی دەباغ موصلی وەرگرت، مێژوونووس یاسین عومەری دەڵێ: {من لەوێ حازربووم کە ساڵی ١٢١٨ك – ١٨٠٣ز ئیجازەی

وەرگرت، پاشان کرا ووتارخوێن لە مزگەوتی (وەزیر)، هەروەها پێش نوێژی تایبەتی والی موصل بوو}.

سەرچاوەکان:

١. غاية المرام ٨١ – ٨٢.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٣٤ – ٢٣٥.

## بیلال ڕەمەزان قازی (٣٠٣)

ناوی بیلالە، کوڕی ڕەمەزانی، کوڕی بیلالی، کوڕی جەلالی، کوڕی حەسەنە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری هەولێرە، بەژنی کورت بووە و کوور بووە، ئیبن مستەفی[1] دەڵێ: {بە منداڵی گوێم لە دەرسی ئەو زاتە گرتووە، لە قوتابخانەی (قەلات) لە هەولێر دەرسی دەدا، پاشان کرا قازی لە کەرکوك}.

سەرچاوە: تاريخ أربيل ١/٨٦.

## بەهائەدین ئەحمەد خەتێ (٣٠٤)

ناوی بەهائەدینە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عبداللهیە، ساڵی ١٩٢٩ز لە گوندی (خەتە)ی خۆشناوەتی هاتووتەدنیا، تەمەنی سێ ساڵان بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، پاش چوار ساڵ لای مەلا عبداللهی ئامۆزای لە گوندی خۆیان دەستی بە خوێندن کرد، بەشێکی باشی لە قۆناغەکان بڕی، دوایی چووە لای مەلا محەممەدی بالیسانی مەنتیق و ئادابی خوێند، پاشان چووە (ئەسپیندارە) لای مەلا محەمەدئەمینی سوێری عەقیدە و بەلاغەی خوێند، گەڕاوە (خەتە) لای مەلا ئیبراهیمی مامی ماوەکی خوێند، ئەمجا چووە (هەولێر) لە مزگەوتی شێخ نورەدین لە لای مامۆستا مەلا صالحی کۆزە پانکە کۆتایی بە خوێندن هێنا، لەگەڵ ئەو بەڕێزانە ئیجازەی وەرگرت: مەلا عوسمانی کوڕی مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکەیی، مەلا صالحی (ئەختەتەری)، مەلا سولەیمان.

---

[1] لە ٥٦٤ ك – ١١٦٩ز لە دایکبووە، لە ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

گەڕاوە (خەتە) لەگەڵ مەلا ئیبراهیمی مامی دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٦٥ز هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی سەید غەریب لە گەڕەکی سێتاقان کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، هەروەها لە مزگەوتی شێخ محیەدین لە گەڕەکی (برایەتی) لەگەڵ مەلا صادقی (خەتێ) دەرسی دەدا، تا ئێستا چەند ئیجازەی مەلایانی داوە.

سەرچاوەکان:

١. أسهام علماء کردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣٧.

٢. خۆری ئیسلام (٢٦) ٢٠٠٤ز، ٣٨ – ٤١.

## بەهائەدین محەممەد ئیمام (٣٠٥)

ناوی بەهائەدینە، کوڕی محەممەدە، ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتووتە دنیا، دەستی بەخوێندن کرد، قورئانی پیرۆزو کتێبە سەرەتاییەکان و رێزمانی عەرەبی تەواو کرد، ساڵی ١٣١٤ك چووە لای مەلا عبداللەی وەلزیێ لەناوچەی (موکریان) لەوێ ریازیاتی خوێند، لە ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز گەڕاوە (هەورامان) لەلای مەلا عبدالقادری (بیارە) کۆتایی بەخوێندن هینا.

هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەری بیارە وەرگرت،دوای کۆچی دوایی شێخ هاتووچوی شێخ نەجمەدینی کوڕی دەکرد، پاشان لەلایەن شێخ نەجمەدین کرا (خەلیفە) هۆدەی تایبەتی لە خانەقای بیارە بۆ تەرخان کرا، خەریکی داب و رەوشتی صۆفیەتی بوو.

لە١٣٣٠ك ژنی هینا، کە شێخ نەجمەدین ساڵی ١٣٣٧ك ـــ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد و شێخ نورەدینی کوڕی کرا جێگیری، مامۆستا باری کرد بۆناو خزمەکانی لەناوچەی خۆی، دوایی جەنابی شێخ عەلائەدین هاتەوە (بیارە) مامۆستای هیناوە لای خۆی کردیە پێش نوێژ و سەرخەتم، مامۆستا هۆدەی تایبەتی خۆی هەبوو، یا قورئانی پیرۆزی دەخوێند، یا زیکری خوای دەکرد، یا دەرسی فەقێیانی دەدا، لە (فەرائیز) زانیاری بەهێز بوو.

ساڵی١٣٦٧ك ئیزنی لە شێخ وەرگرت، لە دامەنی گۆڕستانی شێخەکان گۆڕەکی بۆ خۆی هەڵکەنی، ماوە ماوە قورئانی لەسەر دەخوێند، زۆر بێ نەچوو نەخۆش کەوت، لە١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز لەو گۆڕە نێژرا، مەلا محەممەدی کوڕی پێش نوێژ و وتار خوێن بوو لە (خورمال).

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٢٤-١٢٥.

– پ –

## مەلا پیرۆت کۆیی (٣٠٦)

زانیاری تەواومان دەربارەی ئەو مامۆستایە نیە، تەنها ئەوەی لێ دەزانین کە لەکتێبەکەی خۆی – شەرحی تەصریفی مەلا عەلی – دەردەکەوێت.

مامۆستا پیرۆت کاتی موستەعیدی کە شەرحی شەمسییەی مەنتیقی خوێندووە لە ساڵی ١٢٦١ك – ١٨٤٥ز ئەو کتێبەی داناوە، پێشکەشی کردووە بە حاکمی کۆیە ئەبابەکر ئاغای حەوێزی، (بابەکر ئاغا): ئەدیب و شاعیر بووە، نازناوی (قاصید)بووە، لە١٢٠٠ك -١٧٨٥ز هاتووتە دنیا، لە ١٢٧٠ك -١٨٥٣ز کۆچی دوایی کردووە.

شەرحەکەی مامۆستا پیرۆت ئاسان و ڕەوانە، نوسخەکی کۆپیمان لەلایە لەسەر دەستخەتی مەلا مەعروفی کوڕی خضری زینوەیی وەرگیراوە، ساڵی١٣٤٩ك -١٩٣٠ز لەمزگەوتی حەتك لە (کۆیە)ی نووسیتەوە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٧٤-,٢٧٧

٢. شەرحی مەلا پیرۆت لەسەر تەصریفی مەلا عەلی.

– ت –

## تەمیم ئەحمەد بەندەنیجی (٣٠٧)

ناوی تەمیمە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەحمەدە، خەلکی (بەندەنیج)ی مەندەلی یە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە بەغدا دەرسی داوە، ئیجازەی بە حافیزی مونزیری داوە، لە

ڕۆژی شەممەی (٣)ی مانگی جیمادی دووەم ساڵی ٥٩٧ك – ١٢٠١ز کۆچی دوایی کرد، تەمەنی (٥٤) ساڵ بوو.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤/٣٢٩.

٢. سير أعلام النبلاء ١٣/٣٤.

## تۆرانشاه یوسف ئەییوبی (٣٠٨)

ناوی تۆرانشایە،کوڕی مەلیك صەلاحەدینە، کوڕی یوسفی ئەیوبی یە، ناسراوە بە: (الملك المعظم – مەلیکی گەورە)، ساڵی ٥٧٧ك ـ١١٨١ز لە (میصر) هاتووتە دنیا، زانایەکی نووسەر و شاعیر بووە، فەرموودەناس بووە، شەریعەتی لە (دیمشق) تەواو کردووە، ئیجازەی لە عبداللەی کوڕی (بری)و هبةاللەی بوصیری و قاسمی عەساکیر وەرگرتووە، مامۆستای دمیاطی چەند فەرموودەی لێ گێڕایەوە، جەنابی مەلیك هەروەکو زانا بوو هەروەها پاڵەوانەکی ڕەشید و بەجەرگ بوو، ماوەك سەر لەشکری شاری (حەلەب)بوو، کاتی تەتەرە داگیرکەرەکان هێرشی دڕندانەیان هێناسەر (حەلەب) خۆی نەدا دەست، لە قەلات خۆی حەشاردا، شەڕێکی مەردانەی کرد، بەداخەوە لە ئەنجامدا خۆی بێ ڕانەگیرا، هاتە خوارەوە و بەجێی هێشت هەر لەو خەفەتە زۆر پێ نەچوو، لە ٦٥٨ ك – ١٢٦٠ز کۆچی دوایی کرد، لەبن هەیوانی خانووەکەی خۆی لە (حەلەب)بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الکورد وکوردستان ١٥٣.

٢. معجم أعلام الکورد ١٦١ـ١٦٢.

## مەلا تەوفیق ئیمام (٣٠٩)

مامۆستا تەوفیق ئیمام یەك بووە لە مەلایە باشەکانی شاری (کۆیە)، لە مزگەوتی (پەرکێ) پێش نوێژی کردووە و دەرسی داوە، دەڵێن: زانیاری هەبووە لە زانستی

(الکیماء) و دروست کردنی زێڕو زیو، بەردەوام بوو لە سەر خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، تا کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی ناو فائیقی هەبوو، سەرنووسەری دادگای کەرکوك بوو.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن اربيل ٢٩٥ - ٢٩٦.

## تەوفیق مەحمود ( پیرەمێرد ) (٣١٠)

ناوی تەوفیقە، کوڕی مەحمودی، کوڕی هەمزە ئاغایە، نازناوی (پیرەمێردە)، باپیری سەرۆکی وەزیرانی ئەحمەد پاشای بابان بووە، ساڵی ١٢٨٦ك - ١٨٦٩ز لە (سلێمانی) هاتووتە دنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە شارەکەی خۆی بوو، دوایی چووە (بانە)ی ئێران، ماوەك لەلایەن مەلا حوسێنی گۆجە و مەلا سەعیدی زەلزەلەی خوێند، فێری زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بوو، هەر لەو کاتە دەستی کرد بە نووسینی شیعر، جارجاریش حەزی لەسوار سوارانێ و قۆشمە و تەڕاد بوو، سواری ئەسپەکەی دەبوو دەچووە دەرەوە.

(پیرەمێرد) ماوەك فەرمانبەر بوو، ساڵی ١٨٨٦ز کرا سەرۆکی نووسەری دادگا لە (شارباژێر)، لە ١٨٩٥ز کرا جێگری داواکاری گشتی دادگا لە (کەربەلا)، پاشان وازی لە فەرمانبەری هینا، ساڵی١٨٩٩ز لەگەڵ شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودی حەفید چووە (ئەستانە)، ساڵی ١٩٠٠ز پێکەوە چوونە حەج، دوای گەڕانەوە لەلایەن حکومەتی عوسمانی کرا ئەندامی کۆڕی زانستی بالا لە ئەستانە، لە ١٩٠٩ز کرا قائیمقام لە (جۆلەمێرگ)، پاشان خوێندنی مافپەروەری لە (ئەستەمبۆل) تەواو کرد، بڕوانامەی وەرگرت، دەستی کرد بە پارێزەری و رۆژنامەنووسی، گۆڤاری (رسملی کتاب)ی بەتورکی دەرکرد.

پاشان لەگەڵ شێخ عبدالقادری شێخ عوبەیداللە ی شەمزینان کۆمەڵەی کوردی دروست کرد، گۆڤاری کوردی دەرکرد بەناوی (کورد)، گۆڤاری تری دەرکرد بەزمانی

تورکی، دووبارە گەڕاوە فەرمانبەری، لەلایەن حکومەتی عوسمانی کرا پارێزەری (ئاماسیا) لەبەرواری ١٩١٨ز تا ١٩٢٠ز.

ساڵی ١٩٢٥ز گەڕاوە (سلێمانی) لە ڕێگای (حەلەب)، بە یەکجاری وازی لە فەرمانبەری هێنا، خۆیدا ژێر ئاڵای شێخ مەحمودی حەفید کە تازە بۆ کوردی هەڵدا بوو، لە ١٩٢٦ز ڕۆژنامەی (ژین)ی دەرکرد، لە ١٩٩٢ز کرا سەرۆکی ڕۆژنامەکە، لە ١٩٣٤ز بووە خاوەنی ڕۆژنامەکە.

(پیرەمێرد) خەریکی نووسین و بەلاوکردنەوەی شیعرەکانی شاعیرانی پێشوو بووە، هەروەها ڕووداو و بەسەرهاتەکانی گەلی کوردی نووسیوە، لەوانە:

١. پەندی پێشینان، ٤٨٠٠ پەندی هۆنراوەیە، لە ١٩٣٦ بەلاوکراوە.

٢. دوازدە سوارەی مەریوان، لە ١٩٣٥ز بەلاوکرایەوە.

٣. مەحمود ئاغای شیوکەلی لە ١٩٤٢ز بەلاوکراوە.

٤. مەم و زین، لە ١٩٣٥ز بەلاوکراوە.

٥. مەولەوی، دوو بەرگە لە ١٩٣٥ز بەلاوکرایەوە.

هەروەها شیعری نیشتمانپەروەری و ئایینی و کۆمەلایەتی هەیە، بۆ نموونە دەڵێ:

خوایە ئەوانەی کە بێ باوەڕن هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەڕن
ئەگینا سەیری باغێکی گوڵ کەن تەماشایەکی بە عەقل و دڵ کەن
ئەو ڕەنگە جوانەی پەڕەی (هەرجایی) بە زەررەبینی تیشکی بینایی
لێی وردبینەوە، کە ئەو صنعەتە کێ دەڵێ زادەی خووی تەبیعەتە؟
کێ هات (لاولاو)ی بە داران ئاڵاند؟ کام دەست گەردنی (وەنەوشە)[1]ی شکاند؟
ئەمانە ئێستا بلێن بێگیانن ماددەیەك ڕوویدا زۆر کەس ئەیزانن
ئاغای سێوەگەل یەکێکیان تیابوو کە ئاغاڵ ئاغای قادراغای ناوبوو

[1] ئەوانەی لە ناو کەوانەکاندان، ناوی گوڵانن.

پێی بریندار‌بوو، لێی کرد بە خۆرە
ئەهاتنە سەری حەکیم بە نۆرە

ڕۆژێك مەولەوی حەکیمی بانە
پێی وت ڕەحمەت بێ بەم منالانە

ئەم دەردە پیسە ئەتەنێتەوە
پیاو ئەبێ لێیان دوورکەوێتەوە

ئاغا لە دوور دێ چووە بندارێك
ڕاکشا و ڕوانی بۆی کشا مارێك

ئەمیش بێزاربوو چاوی لێ قوچان
تا هاتە سەرپێی خۆی هیچ نەجوولاند

هەرچەند خەڵك و خوا لە دوور پەیدابوو
کە ئەوان هاتن مار پێی وەدابوو

پێی چاك بووەوە وەك دوخی جاردی
خۆنالێن ئەمەش تەبیعەت ناردی؟

بەردە زلەکەی ناو ئاوی دووکان
کە بۆئەندازەی ئاو بووە نیشان

شارە مێروولەی لە ناودا ئەژی
ئەویش تەبیعەت هێناویەتەدی؟

ئەو ئاسمانە، کە بێ ستوونە
بۆ کردەوەی تۆ بوو بە نموونە

چەرخی ماکینەی ئەم ڕۆژ و شەوە
بێ هەڵم و بەنزین ئەسوڕێتەوە

چەوری پێ ناوێ هیچ ژەنگ ناگرێ
لێك هەڵناوەشێ دەستی تێ نابڕێ

ئاش بێ ئاش وەستا، نانڕێتەوە
گاجۆت بێ جوتیار ناگەڕێتەوە

پیرەمێرد لە ١٩/٦/١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. مشاهیر الکورد ١٤٩ – ١٥٠.

٢. معجم أعلام الکورد ١٦٢ – ١٦٤.

٣. هەوێنی عیشق و ئازادی ٤ – ٦.

٤. أعلام کورد العراق ١٨٦ – ١٩٠.


– ث–

## ثابت محەممەد (جزیری) (٣١١)

ناوی ثابتە، کوڕی محەممەدی، کوڕی مەشیعە، نازناوی (تەقیەدینە)، خەڵکی جزیرەیە، چوویتە (دیمشق) لەوێ کرایتە پێش نوێژ و دەرس بێژ، لە زانیاریەکانی قورئانی

پیرۆز شارەزا بووە، لە مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٧١٣ك – ١٣١٣ز لە تەمەنی زیاتر لە هەشتا ساڵیدا، لە شاری (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٢.

٢. معجم أعلام الكورد ١٦٩.

– ج –

**جابانی کوردی (خوای لێ رازی بی) (٣١٢)**

چەند زانیارییەك دەربارەی مێژووی ئەو زاتە: مامۆستای پسپۆڕ و فەرموودەناس، شێخ ئەحمەدی کوڕی عەلی، کوڕی حەجەری (عەسقەلانی) لە کتێبە بەناوبانگەکەی ناو و نیشانەی یارەکانی خۆشەویست (د.خ) (الإصابة في تمييز الصحابة) دەڵێ: {(ئیبن مەندە) دەگێڕیتەوە، لە ڕێگای (باوکی سەعیدی) بەندەی (هاشیمیان)، ئەویش لە (باوکی) کە گوێی لە (مەیمونی) کوڕی (جابانی) کوردی بووە، ئەویش لە (باوکی) بیستووە، ئەویش لە پێغەمبەر (د.خ)، نەك تەنیا جارەك بەڵکو دە جار فەرموویتی: {کەسێك ژنێك مارە بکا و لە دڵەوە نیازی وابێت مارەیەکەی لێ بخوات و حەقی ژنەکە نەدات، لە ڕۆژی دوایی کە بە خزمەت خودای پەروەدگار دەگات، بە (زینا)کار دەنووسرێ}.

هەروەها مامۆستا ئیبراهیم حەسەن شارانی گۆڕانی موفتی و مودەڕریسی شاری مەدینەی پیرۆز لە ڕیوایەتی موسنەدی (الحافظ عبد بن حميد بن نصر الكشي) دەڵێ: {لە مەیمونی کوردی (کە ئەبو بەصیرە) کوڕی جابانی کوردی بیستراوە...کە یەکە لە یارەکانی خۆشەویست (د.خ)}[٢].

محەممەدئەمین زەکی مێژوونووس لە کتێبی (مشاهير الكورد) دەڵێ: {(جابان – کابان): کوردە، یەکە لە یارەکانی پێغەمبەر (د.خ)}، مەحمود ئەفەندی ئالوسی لە تەفسیری

---

[٢] بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٢٥٥ – ٢٥٦.

ڕوح المعانی باسی دەكات: لە (الإصابة)ی ئیبن حەجەر فەرموودەی باسی مارەیی و شتی تر باس دەكات، خۆی و كوڕەكەی ناو مەیمون كە بە تابیعین دەژمێردرێت}.

مەلا جەمیل ڕۆژبیانی دەڵێ: {جابانی باوكی مەیمون یەكە لە یارەكانی پێغەمبەر (د.خ) وە لەو بەرەبابانەیە لە كوردان كە ناو دەبردرێن بە (جاوانی)}[٤].

سەید مەحمودی ئالوسی بەغدایی لە تەفسیری (روح المعانی) شەرحی ئایەتی: ﴿ ستدعون إلى قوم أولي باس شديد﴾، (الفتح / ١٦) دەڵێت: {ئەو گەلەی ئێستا پێیان دەڵێن (كورد) زۆربەیان نەتەوەی عەرەب نینە و گەلێكی تایەت و سەربەخۆنە، هەر لەوانە بەشێكیان سەیدی (بەرزنجە)نە، نەتەوەی ئیمامی حوسێنن، هیچ گومان لە سەیدایەتیان نیە، هەروەها (جابانی كوردی) باوكی (مەیمون) یەكە لە یارەكانی پێغەمبەر (د.خ) ئەویش هەر لەو گەلەیە، (كورد) ناسراوە بە هێز و دەسەڵات، زۆر پیاوانی خاوەن ڕێزیان هەیە، بەشێكیان یارانی پێغەمبەرن (د.خ)، زانای فەرموودەناس ئیبن حەجەر لە (الإصابه في تمييز الصحابة) باسی یەك لەوانە دەكات، كە ناوی (جابانە) باوكی (مەیمونە)، هەر لەو باوك و كوڕە دەگێڕیتەوە كە گوێیان لە پێغەمبەر بووە (د.خ) فەرموویێ ﴿ أيما رجلٍ تزوج امرأة على ما قلّ من المهر أو كثر ليس في نفسه أن يؤدي إليها حقها خدعها، فمات ولم يؤد إليها حقها، لقي الله يوم القيامة وهو زان، وأيما رجل استدان دينا لا يريد أن يؤدي إلى صاحبه لقي الله وهو سارق﴾، لە كۆتاییدا دەڵێ: {ئەو مەیموونە ناسراوە بە (ئەبو بەصیر) یا (ئەبونەصیر) لە گێڕانەوەی فەرموودە زاتەكی بڕوا پێكراوە.

عبدالكريم محەمەد سەمعانی، لە كتێبی (الأنساب) دەڵێ: {مەیمون نازناوی (ئەبو بەصیرە) فەرموودەی لە ئەبو عوسمانی نەهدی وەرگرتووە، حەمادی كوڕی زەید و دیلمی كوڕی غەزوان، فەرموودەیان لەو زاتە وەرگرتووە و گێڕایەتەوە}.

---

[٤] كاروان (٥٤)، ١٩٨٧، ١٣٩.

دکتۆر شێخ عبداللهی نەقشبەندی، لە (أمجاد الأکراد) دەڵێ: {پاش کۆچی پیرۆزی خۆشەویست بۆ مەدینە و دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی ئیسلام، ڕۆژەك پیاوەکی کوردی ڕێزدار ناوی جابان بوو، هاتە خزمەت خاوەنی ڕێز و شکۆ، لە سەر دەستی پێغەمبەر (د.خ) ئیسلام بوو لە ناخی دڵەوە خۆشیویست، (جابان) حەزی نەدەکرد خۆ بە دەربێخیت، بەس دەیویست دەرفەت وەربگریت بە تەنیا لە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) دابنیشیت، بۆیە بەختەوەر بوو بە گێڕانەوەی فەرموودەك، یا دوو، گەڕاوە بۆ کوردستان بێ ئەوەی کەس هەست بکا چی بوو لە نێوان ئەو لەگەڵ خۆشەویستی خودا؟

(جابان) کوڕێکی لە ئیسلامەتی بوو، ناوینا (مەیمون) واتە موبارەك، تا پیرۆز بیت بە بەرەکەتی ئیسلامەتی و بەرەکەتی پێغەمبەری خودا (د.خ)، هەربۆیە لە ناو یارەکانی خۆشەویست دەناسرا بە (باوکی مەیمون)، لەبەر ئەو ڕێزدارییە، (جابان) تەنیا تەن و دیمەنەکەی لە مەدینەی پیرۆز دوورکەوت، دەنا جان و دڵەکەی هەر لەوێ بوو، کۆبوونەوەی تەنیایی خۆشەویستی خودا (د.خ) لەگەڵ (جابانی) کوردی خەڵکی کوردستان، شتێکی گرینگی نهێنی لە ژێردا بووە، فەرماندانەکی دەستنیشانکراو بووە و نەخشەکێشان بووە، بۆ سەرکەوتن، کە ڕۆژی خۆی دادێت ئەوەمان بۆ ڕۆن دەکاتەوە، لە بەر خۆپیشان نەدانی (جابان) بە خەڵکان، وە مانەوەی چەند حەفتە لە شاری مەدینەی پیرۆز لە جیاتی چەند مانگ، نەزانرا کە چ ڕۆژ باری کرد و گەڕاوە کوردستان، هەروەکو نەزانرا چ ڕۆژێك تەشریفی هات بۆ مەدینە؟}.

سەرچاوەکان:


١. الإصابة في تمييز الصحابة ١/٢١٠.

٢. روح المعاني ١٦ / ١٠٢ – ١٠٤.

٣. أسد الغابه في معرفة الصحابة ١/٣٥٤.

٤. الأنساب ٤/٦٠٩.

٥. أمجاد الأكراد ٣٥ – ٣٧.

٦. الكفايه في المواريث ١٨٤.
٧. مشاهير الكورد ١٥٥ – ٤١٩.
٨. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٢٥٥ – ٢٥٦.
٩. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلامية ٥٠.
١٠. کاروان، ژمارە ٥٤ / ١٩٨٧ز، ١٣٩.
١١. تاريخ مشاهير كورد ١/١ – ٢.
١٢. معجم أعلام الكورد ١٧٢ – ٧٣٢.
١٣. وللكورد في الإسلام حضارة ٤٧ / ٢٨ / ٢٠٠٧/٢ز.

## جامی حوسێن تەکیەیی (٣١٣)

ناوی جامی یە، کوڕی حوسێنی، کوڕی ئەحمەدی کوڕی وەیسی، کوڕی سەیفەددینی، کوڕی عیوەزە، باپیرەگەورەی سەیدەکانی (خەرپانی) قەزای هەڵەبجەیە، لە دەوروبەری ساڵی ١١٢٠ك – ١٧٠٨ز هاتووتەدنیا، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز و وردە کتێبە سەرەتاییەکان، دەستی کرد بە سوڕ و گەڕ بۆ مەبەستی دەست کەوتنی زانیاری، چووە (کۆیە) و (هەولێر) و (موصل) و چەند شوێنانی تر، تا کۆتایی بە خوێندن هێنا، گەڕاوە (تەکیە) لەوێ مزگەوتی گەورەی دروست کرد.

مامۆستا زانایەکی بەرز و بە توانا بوو، لە هەموو جۆرە زانستەکان چازان و شارەزا بوو، ڕۆشنبیر بوو، شیعری فارسی هەیە ناسراوە بە (مەلا جامی گەورە)، محەممەد عەلی قەرەداغی نووسەر و مێژوونووس لە نەتەوەی ئەو زاتەیە، (مەلا جامی) حاشیەی لەسەر (اظهار) و (جامی) هەیە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣١ – ١٣٢.

## جامی عبدالکریم چۆڕی (٣١٤)

ناوی جامی یە، کوڕی مەلا عبدالکریمی، کوڕی مامۆستا ئەبوبەکری (مصنف)ە، زانایەکی بەرز و شارەزای زانستەکان بووە، لە شەریعەت هۆشیار بووە، ساڵی ١٠٨٩ك

– ١٦٧٨ز سولتان بوداق لە مزگەوتی سۆری (سابلاغ) قوتابخانەی بۆ دروست کرد و مامۆستای دانا بە (مدرس)، مامۆستا لە سەرەتای سەدەی دوازدەی کۆچی، ماڵئاوایی لە دنیا کرد، چەند حاشیەی لەسەر کتێبانی خوێندن هەیە.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٥٠١.

٢. تاریخ السلیمانیة ٢٤٤.

٣. معجم أعلام الکورد ١٧٢.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٣٣.

٥. مشاهیر الکورد ١/١٥٦.

## جوبرائیل ئەحمەد کوردی (٣١٥)

ناوی جوبرائیلە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلە، ناسراوە بە: (أمین الدولة) زانایەکی بە ناوبانگی شاری (حەلەب) بووە، بە درێژایی ژیانی خەریکی فەتوا و دەرسدانەوە بووە، ساڵی ٩٣٠ك – ١٥٢٣ز لە شاری (حەلەب) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/١٧٢.

٢. مشاهیر الکورد ١٥٦.

٣. معجم أعلام الکورد ١٧٣.

## جەرجیس محەممەد هەولێری (٣١٦)

ناوی جەرجیسە کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا خەلیلی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی حاجی عومەر ئەفەندی (قازی)یە، ساڵی ١٧٢٣ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لەلای مەلا عبدالله ی (ئەصەم) دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (ماوەران) لای مەلا فەتح الله ئیبراهیم حەیدەری، دوایی چووە لای مەلا صبغة الله ی

حەیدەری بەشێك لە تەفسیری بەیزاوی خوێند، ساڵی ١٩٦٤ز هەر لەوێ ئیجازەی وەرگرت، تەریقەتی (قادری) لە سەید ئیسماعیلی بەرزنجی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا چووە سەفەری (حەج)، گەڕاوە (هەولێر)، ساڵی ١٧٦٦ز کرا (مدرس) لە (موصل)، پاشان گەڕاوە (هەولێر)، ئەمجارە چووە (بەغدا) تەریقەتی نەقشبەندی لە سەید ئەحمەدی بەغدایی وەرگرت، گەڕاوە (هەولێر) پاشان کرا (مدرس) لە (ئاکرە).

ساڵی ١٧٧٢ز سولەیمان پاشای والی (موصل) لە دووی نارد کردیە (مدرس) لە قوتابخانەی (ئەمینیە) لە مزگەوتی پاشا جێگەی شێخ موسا، وە لە ساڵی ١٧٨٨ز کرا (مدرس) لە قوتابخانەی محەممەد پاشا جێگەی محەممەدئەمین عومەری، هەر لەو شوێنە ئیجازەی بە مەلا یەحیای مزوری دا، مامۆستا هەرچەندە دوا عەمری چاوەکانی کز بوون، بەڵام خوای گەورە بەهرەکی وای پێدابوو، وەکو جاران لەبەر دەرسی دەداوە.

(ڕووداوێك): لە خزمەت کاکم مەلا طیب چوومە (موصل) لەوێ لاماندا لای مەلا عەلی شیمالی پێش نوێژ و ووتارخوێنی مزگەوتی حەزرەتی خدر، کتێبخانەکی گەورەی هەبوو، ماوەك لە لای دانیشتین، بۆمانی گێڕاوە: {ساڵەك نەخۆشی تاعوون موصلی داگرت، لە ئەنجامدا مەلایە چاکەکان هەموویان کۆچیان کرد، والی موصل ناردیە (هەولێر) مەلا جەرجیس ئەفەندیان هێنا، کردیە (مدرس)، لەو سەردەمی تاکو ئێستا مەلایەکانی (موصل) زانیاریان لەمەڕ ئەو زاتەیە، زنجیرەی ئیجازەنامەیان دەچێتەوە سەر ئەو}.

هەروەها شێخ ئیبراهیم النعمة سەرۆکی زانایانی (موصل) هاتە (هەولێر) بە بۆنەی ئیجازەی وەرگرتنی چەند مەلایان لە لایەن مامۆستا محەممەد صادق لە مزگەوتی حاجی ئیبر اهیم گەردی، شێخ ئیبراهیم وتارێکی خوێندووە، لەو وتارەدا پێی لەو ڕاستیە نا، کە جەرجیس ئەفەندی مامۆستای مەلایەکانی موصلە، بۆیە موصل هەر قەرداری هەولێرە.

(مامۆستا جەرجیس) جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بووە، نموونەی شیعری عەرەبی:

ورب حمامة في الدوح باتت بأشجان وحزن مستكين
على أيام وصل حيث فاتت تعيد النوح فنا بعد فن
أقاسمها الهموم إذا اجتمعنا وتروي قصة الأشواق عني
على حكم الهوى فينا اقتسمنا فمنها النوح والعبرات مني

لە مەتحی مامۆستا بە عەربی نووسراوە:

أحيا معالم علم النحو فهو إذا ألقاه قلت: (أبوحيان) أحيانا
بمنطق هو فيه الخطب أوضح لي على مطابقة التصديق برهانا

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٠٦ك – ١٧٩١ز لە خانووی سولەیمان پاشای جەلیلی کتوپڕ کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی جەرجیس پێغەمبەر (د.خ) بە خاك سپێردرا، ئەو بنەماڵە ئێستاش لە هەولێر ماون، لەوانە: حاجی حەیدەر عوسمان و حاجی جەمال مزگەوتیان هەیە لە (ئازادی)، هەروەها نورەدین و عێزەدین و حاجی ئەنوەر کوڕانی فەیزی ئەفەندی، منداڵەکانیان لە هە ولێر و دەوروبەری هەولێرن ئەوانیش لەو بنەماڵەن.

سەرچاوەکان:


١. أربيل في مختلف العصور ١٣٥.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٧٩.
٣. البيتوشي ٢٨٨.
٤. الشيخ معروف النودهي ٣٧.
٥. مشاهير الكورد ١٥٦.
٦. معجم المؤلفين ٣/ ١٢٧.
٧. غاية المرام ٧٩ – ٨٠ – ٣٥٠ – ٣٥٣ – ٣٧٣ – ٣٧٤.
٨. منهل الأولياء ١/٢٨٦ – ٢٨٨.
٩. سلك الدرر ٢/٩.
١٠. معجم أعلام الكورد ١٧٤.

١١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٤ – ١٣٥.
١٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٤٣.
١٣. دیدار لەگەڵ شێخ عەلی شیمالی لە (موصل).
١٤. دیدار لەگەڵ حاجی ئەنوەر فەیزی لە (بەحرکە).

## جەعفەر ئیسماعیل بەرزنجی (٣١٧)

ناوی جەعفەرە، کوڕی ئیسماعیلە، کوڕی زەینەلعابیدینی، کوڕی محەممەد حوسێنی بەرزنجی یە، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز هاتووتە دنیا، لە شاری (سلێمانی).

لە خزمەت باوکی چووە (مەدینە)ی پیرۆز، پاشان لەگەڵ باوکی چووە(میصر)، لە ١٢٧٠ك گەڕاوە (مەدینە)، خوێندنی تەواو کرد، لە ١٢٧٧ك باوکی کۆچی دوایی کرد، مامۆستا جەعفەر کرا موفتی و (مدرس)، پاشان چووە (ئەستەمبۆل) لەوێ کرا قازی (صەنعا) ماوەی شەش ساڵان لەوێ ماوە، گەڕاوە (مەدینە)، لە ١٣٠٧ك کرا قازی (سیواس) لە تورکیا، دوو ساڵ لەوێ ماوە، گەڕاوە (مەدینە)، کرا موفتی شافیعیەکان، لە ١٣١٧ك – ١٨٩٩ز کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی داناون:

١. تاج الإبتهاج على النور الوهاج في الإسراء والمعراج.
٢. الشجرة الأترجيه في سلالة السادة البرزنجية.
٣. الكوكب الأنور على عقد الجوهر في مولد النبى الأزهر.
٤. شواهد الغفران في فضائل رمضان.
٥. نزهة الناظرين في مسجد سيد الأولين والآخرين.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/١٣٤ – ١٣٥.
٢. هدية العارفين ٥/٢٥٦ – ٢٥٧.
٣. إيضاح المكنون ٢/ ٣٩٣.
٤. الأعلام ٢/١١٧.

٥. نثر الجواهر والدرر ١/٣٠٨.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٦.

## جەعفەر حەسەن بەرزنجی (٣١٨)

ناوی جەعفەرە، کوڕی حەسەنی، کوڕی عبدالکریمی، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبدالرسولی، حوسێنی بەرزنجییە، پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژی مزگەوتی خۆشەویست (د.خ) بووە، موفتی شافیعیەکان بووە لە شاری (مەدینە)ی پیرۆز هەر لەوێ ساڵی ١١٧٧ك – ١٧٦٣ز کۆچی دوایی کرد، چەند کتێبی لە بابەت مێژوو و ئامۆژگاری داناوە، ناوەکانیان لە هدیة العارفين تۆمارکراوە.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٢/٩.

٢. معجم المؤلفين ٣/١٣٧.

٣. معجم أعلام الكورد ١٧٥ – ١٧٦.

٤. إيضاح المكنون ٣/ ١٧٦.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٦.

٦. هدية العارفين ٥/٢٥٥.

٧. الأعلام ٢ / ١٧.

٨. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/ ٢٥٨ – ٢٦١.

## جەعفەر عبدالنبی ئامێدی (٣١٩)

ناوی جەعفەرە، کوڕی عبدالنبی، کوڕی مصطەفای (ئامێدی)یە، ئامۆزای مامۆستا ئەبوسعودی خاوەنی تەفسیری قورئانی پیرۆزە، ناوبراو لە ئەستەمبۆل پەروەدرە بووە، ساڵی ٩٥٠ك – ١٥٤٣ز کرا موفتی، لە ٩٥٥ك کرا مامۆستای سوڵتان سەلیمی دووەم، لە ٩٥٨ك کرا قازی (شام)، پاشان کرا قازی سوپا، لە ٩٦٤ك خانە نشین کرا، دوایی چووە (حەج) لە ٩٨٥ك – ١٥٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ١٧٦.

٢. مشاهير الكورد ١/ ١٦٠ – ١٦١.

## جەعفەر محەممەد کفرعەزی (٣٢٠)

ناوی جەعفەرە، کوڕی محەممەدی، کوڕی هبـةاللهی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی یوسفە، خەڵکی گوندی (حەزە – عەزە)یە، لە پێشدا بە (کفرعەزا) ناو دەبردرا، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی (هەولێر)، لە زانستەکانی شەریعەت و فەرائیز و نەحو و ئاداب و ژمێریاری شارەزابوو، جگە لە قورئانی پیرۆز کە زانیاری تایبەتی لێ هەبوو، مامۆستا ساڵی ٥٨٩ك – ١١٩٣ز کرا قازی (هەولێر)، زاتەکی زیرەك و شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، لە ٦٠٤ك – ١٢٠٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ٢/ ٧٢ – ٧٣.

٢. أربيل في العهد الأتابكي ٢٤٦ – ٦٢٥ – ٣٢٦.

٣. الأعلام ٢/ ١٢٤ / ٦ / ٨٦.

٤. معجم أعلام الكورد ١٨٠.

٥. البداية والنهاية ١٣ / ٥٢.

## جەلال حوسێن ترپەسپیانی (٣٢١)

ناوی جەلالەدینە، ناسراوە بە شێخ جەلال، کوڕی حوسێنی کوڕی سەید مصطفەفای، کوڕی سەید حوسێنە، ساڵی ١٨٧٩ز لە (کانی کوردە)ی ناوچەی (کۆیە) هاتووتەدنیا، لەوێ باریان کرد هاتنە (مەلاکاغە)ی نزیك (مەخمور).

خوێندنی: ساڵی ١٨٨٦ز دەستی بە قورئانی پیرۆز کرد، بەشێکی لە کتێبە سەرەتاییەکان خوێند، تەمەنی یازدە ساڵان بوو بە داخەوە باوکی کۆچی دوایی کرد،

ماوەی سێ ساڵ وازی لە خوێندن هێنا، دوایی چووە (کەپەنك ڕەش) لـە لای مـەلا شـێخ طەیبی مامی دەستی بە خوێندن کـردەوە، مـاوەك لـەوێ مـاوە، پاشـان چـووە لای مـەلا عبدالرحمان نیعمەت زادە، ماوەك لە لای مەلا سەید خدری خوێند، ماوەکیش لە لای مەلا ئەحمەدی بەرزنجی، ئەمجا چووە (مـەحمور) لای مـەلا عـبدالفتاحی (شـوان)، دوایـی چـووە (ئۆمەرگومبەت)، فەرائیزی لە لای مەلا ئەحمەدی کۆر خوێند، پاشان چـووە (کـەرکوك)، لای مەلا ڕەزای واعیز تەفسیر و کەلام و ئوصولی خوێند، لەوێش ڕۆیشت چووە لای مەلا صالح لە (شەقلاوە)، لەوی کۆتایی بە خوێندن هێنا.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (گلۆزی) نزیك پردێ چوار سـاڵ لـەوێ دەرسـی داوە، پاشان باری کرد، هاتە (ترپەسپیان) بەردەوام بوو لەسـەر خزمـەتی ئـاینی پـیرۆز تـا سـاڵی ١٩٤٥ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: سێ کوڕی هەبوون: مەلا سەید عبدالقهار و مەلا صـەدرەدین و مـەلا جەواد.

قوتابخانەی ترپەسپیان: مامۆستا شێخ جـەلال لەبـەر ئـەوەی زاتێکـی ناسـراو بـوو ناوبانگی لە ناوچەکە ڕۆیشت بوو، زاتێکی خولق وخوخۆش بوو، چاوبلند و سەخی بوو، هەمیشە خێرخواز بوو، ئامۆژگاری خـەڵکانی دەکـرد، خـەریکی مەسـلەحەت کـردن بـوو، هاوولاتیان خۆشیان دەویست، دەسـتە بـە دەسـتە فـەقێیان ڕوویـان تـێ دەکـرد، چـینەك ئیجازەی وەردەگرت، تاقمەکی تر دادەمەزرا.

زۆر زانای بەرز لەو حوجرانە پێگەیشتوونە، لەوانە: مـەلا شـەریفی دووشـیوانی، مەلا عومەری ئۆمەرگومبەتی، مەلا محەممەدی چورسـتانی، مـەلا عوبێـدی سـەربیری، مـەلا عبدالقادری سوریژەیی، مەلا مەعصومی هەورامی، مەلا خضری شەمامەری، مەلا خـەلیلی دوو سەرەی شاعیر ناسراوە بە (مخلص).

(مخلص) هۆنراوەکی بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا داناوە، ئەوە دەقەکەیتی:

ئەی بادی سەبا هەستە وەکیل بە لە سەلامان
یاران بە خەبەربینە کە عاجیربووە شامان
بابێن هەموو بۆ خزمەتی ئیمشۆکە بە کۆمەڵ
عەزمی سەفەری کردووە گیر نابی لە لامان
قوربان ئەتو ئەو نەوعەیە نی نەگری رەجای کەس
ئێمە هەموو هاتووینە، دەبی بگری رەجامان
فەرمووی: ئەمە رێگایەکی تەنیا نیە بۆ من
من ئیمرۆ ئەچم، ئێوە سبەی دێن بە دووامان
بەو فیرقەتی دوو رۆژی مەبن عاجز و غەمگین
وەصڵی ئەبەدیمان هەیە، لای زاتی خودامان
پێی خۆشبوو لە پشتی (نەبی) چیتێ لەبەریکا
ئەم خاکە کە وەك داکە بە ڕاست، بۆ هەموو لامان
ئەی دایکی حەقیقی دەبێ زۆر حورمەتی بگری
زاتێکی بە حورمەت بووە لای خاس و عەوامان
ئەولادی (عەلی) و (فاطیمە)یە تاقی زەمانە
نابێتەوە تەرزانە وەکو ئەو لە چ دامان
گەر بێتو تەعەسوب نەبی یا جەهلی بە قوەت
ئیقرار ئەکرێ، تاج بوو لەبۆ شێخ و مەلامان
کێ غەیری ئەوی جامیعی ئەوسافی کەمالە؟
نابیندرێ، با وانەبی قەت ئێمە تەمامان
زۆر عالم و زۆر عامیل و زۆر فاضیل و داهی
بۆ زولمەتی هەر مەجلیسەکی ئەو بوو چرامان

بەحری کەرەم و حیلم و کۆهی نەجابەت

ئەمری وی موتاع بوو، لە هەموو شوێن و مەقامان

دەستی کە دەکرد وا بە وەعزدان و نەسیحەت

بەحرێ بوو، پڕی دوڕ بوو، لەبۆ کوللی کەلامان

ناحەق نیە تا ماوە جیهان تاری ببێتن

ئاوابوو، بە یەکجاری، ئەوا شەمسی (ضیا)مان

(داخل بە بەهەشت وابو) لە تاریخی وەدەرکەوت

١٣٦٤ك واهاتووە بۆ (موخلیس)ی بێ هۆش و هومامان

سەرچاوە: کەشکوڵی دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## جەلال شێخ عبداللطیف دەرەقولی (٣٢٢)

ناوی جەلالە، کوڕی شێخ عبداللطیفی، کوڕی عبدالله یە، کوڕی عوسمانی، کوڕی عبداللطیفی،کوڕی شێخ مەعروف (دەرەقولی)یە، دەورووبەری ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتووتەدنیا، لە قوتابخانەی باوکی لە (قەرەداغ) خوێندنی تەواوکرد، کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ لە مزگەوتی حاجی عەزیز خەیات لە (سلێمانی)، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك، خۆی لە ئیشی دنیا نەدەگەیاند بەس بە قەد پێویستی، بە قەد توانای ڕێگای خێری نیشانی خەڵکان دەدا، دووری دەخستنەوە لە بەدکار و لە بەدڕەفتاری، لەسەر ڕێبازی مەلا و پیاوە چاکەکانی پێشوو دەڕۆیشت، لایەنگری حەق و ڕاستی بوو، حەق گۆ و بێ تەماع بوو لە ١٣٥٠ك – ١٩٣١ز کۆچی دوایی کرد، محەممەد محیەدینی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٩ – ١٤٠.

## جەلال سەید عەلی خورماڵی (٣٢٣)

ناوی جەلالە، کوڕی سەید عەلی، کوڕی سەید مەحموودە، لە گوندی (قاینەیجە)ی شارەزور هاتووتەدنیا، لە (گوڵعەنبەر) دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند قوتابخانەکانی

حوجرەی فەقێیان سورِ و گەریدا تا خوێندنەکەی بردەسەر، ئەمجا لە مزگەوتی گەورەی (خورماڵ) کرا (مدرس)، پاشایەکانی بابان زۆر رِێزیان لێنا، چەند باخچە و رەز و باغیان پێ بەخشی لە دەوروبەری (زەڵم) و دۆڵی (بیارە) بۆ خەرجی خۆی و منداڵ و مێوان و فەقێیەکان، تا پێویستی بە کەس نەبێت.

دەستی کرد بە جێبەجێکردنی ئیش و کاری ئاینی و دەرسدانەوەی فەقێیان، ئامۆژگاری خەڵکان و خواپەرستی، تەریقەتی (قادری) لە شێخ حەسەنی گڵەزەردە وەرگرت، لە لایەن شێخ کرا (خەلیفە)، بەم شێوەیە چاکتر توانی خزمەتی ئاین و گەلەکەی بکا.

کۆچی دوایی: مامۆستا جار جار لەگەڵ فەقێیەکان سەفەری (بیارە)ی دەکرد، لەو جارانە کاتی وەرزی (هاوین) لە ناو دۆڵی بیارە دەڕۆیشت، کتوپڕ ساڵی ١٢٣١ك-١٨١٥ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا عبدالکریم (مدرس) لە شێخ عەلائەدینی (بیارە)ی بیستوە دەڵێ: {کاتێ گۆڕەکەیان هەڵدەکەنی بێ ئاگابون لە نوێژ، کاتەك دەنگەکی نهێنی بێ خاوەنیان هاتەگوێ بانگی (الله أكبر، الله اكبر)ی لێ دەدا، زانیان ئەوە کەرامەتی مامۆستایە نوێژیان بەبیر دێنیتەوە، شێخ مصطەفای (گوڵعەنبەر) کوڕی ئەو زاتەبوو، کوڕی ویش محەممەد بوو، کوڕی ویش عبدالرحمان بوو، کوڕی ویش مەحمود بوو، ئەویش کوڕێکی مەلای هەبوو، ناو (بەختیار).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٦ – ١٣٩.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٣٥٨ – ٣٨٠.

## جەمالەدین عبدالمؤمن جەمالەدین (٣٢٤)

ناوی جەمالەدین، کوڕی عبدالمؤمن، کوڕی جەمالەدینە، ساڵی ١١٧٠ك – ١٧٥٦ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و بە دین و لە خواترس بووە، لە زانستەکانی

عەرەبی شارەزا بوو، ئەو زاتە جەمالەدينی دووەمە، ساڵی ١٢٥٦ك – ١٨٤٠ز کۆچی دوایی کردووە.

چوار کوڕی لە پاش بە جێماوە:

١. عبدالمؤمن: لە ١٢٤١ك – ١٨٢٥ز هاتووتەدنیا، ماوەی پەنجاو دوو ساڵ لە مزگەوتی دارالإحسان لە شاری (سنە) مەلا بووە.

٢. عبدالوهاب: ساڵی ١٢٤٤ك – ١٨٢٨ز هاتووتەدنیا، لە ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز کۆچی دوایی کردووە.

٣. عبدالمجيد: لە تەفسير و فەرموودە ئاگاداربووە، لە ١٢٤٥ ك – ١٨٢٩ز کۆچی دوایی کردووە.

٤. عبدالرحمان: زانا و شاعير بووە، لە ١٢٧٤ك – ١٨٣١ز هاتووتەدنیا، لە ١٣١٢ك – ١٨٩٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانياران ١٢٧ – ١٢٨

٢. تاريخ مشاهير کورد ١/٣٦٥.

## جەمالەدين عبد المؤمن شەمسەدين (٣٢٥)

ناوی جەمالەدينە، کوڕی عبدالمؤمنی، کوڕی شەمسەدينە، ساڵی ١١٠٨ك – ١٦٩٦ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان بووە، لە فەرموودە و نەحو سەرف شارەزا بووە، لە شاری (حەسەن ئاوا) ووتارخوێنی ڕۆژانی هەينی بووە، ساڵی ١١٦٩ك – ١٧٥٥ز کۆچی دوایی کرد، چوار کوڕی لە پاش بەجيمان: عبدالمؤمن و شەمسەدين و عبدالله و محەمەد صاڵح.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ مشاهير کورد ١/ ٢٤٢.

٢. بنەماڵەی زانياران ١٢٤ – ١٢٥.

## جەمیل صیدقی زەهاوی ( ٣٢٦ )

ناوی جەمیلە، نازناوی صیدقی یە، کوڕی محەمەد فەیزی زەهاوییە، لە (٢٩) مانگی ذی الحجەی ساڵی ١٢٧٩ك - ١٨٦٣ز لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، زانایەکی بیروڕای فەلسەفە و ئەستێرەناس و زیرەك و شاعیر بووە، خوێندنی لە (بەغدا) بردەسەر، زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی بە چاکی دەزانی، چەند پلە و پایەی فەرمانبەری پێدرا: ١. ئەندامی کۆڕی زانیاری. ٢. بەڕێوەبەری چاپخانەی (ویلایەت). ٣. سەرنووسەری ڕۆژنامەی (زەوراء). ٤. ئەندامی دادگا. ٥. نائب. ٦. ئەندامی کۆڕی پیاو ماقولانی بەغدا.

سەفەری (قوسطەنطینیە) و (میصر) و(یەمەنی) کرد، گەڕاوە (قوسطەنطینییە) هاتەوە (بەغدا) کرا (نائب) پاشان کرا ئەندامی کۆڕی پیاو ماقولانی بەغدا، دوایی لە ماڵەوە دانیشت خەریکی نووسین و خوێندنەوە بوو، تا لە ٢٤/٢/١٩٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: دیوانی شیعر، الخیل وسباقها، الدفع العام والظواهر الطبیعیة والفلکیة، الفجر الصادق في الرد علی منکري التوسل والکرامات والخوارق، لەگەڵ زۆرانی تر لە (مشاهیر الکورد) ناوەکانیان تۆمارکراون.

سەرچاوەکان:


١. معجم المؤلفین ٣/ ١٥٩ - ١٦٠، /١٣/ ٧٩.

٢. الأعلام ٢/ ٣٣٣، /٣/ ٨٤، /١٠/ ٦٣.

٣. تأریخ السلیمانیة ٢٥٣ - ٢٥٦.

٤. معجم أعلام الکورد ١٩٢.

٥. مشاهیر الکورد و کوردستان ١٦١ - ١٦٣.

## جەمیل عەلی ئەفەندی هەولێری ( ٣٢٧ )

نـاوی جەمیلـە، کـوڕی عـەلی، کـوڕی شـێخ عبـدالرحمانی (خالیصـە)، سـاڵی ١٣١٠ك – ١٨٩٢ز هاتووتـەدنیا، کـە فـامی کـرد لـە خانـەقای بـاوك و بـاپیرانی لـە (کەرکوك) دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خـەتم کـرد، کتێبـە سـەرەتاییەکانی تەواوکرد، ماوەك خەریك بوو بە شەریعەت و نەحو و صەرف.

پاشان دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی یاسای (تەکیە) لـە خواپەرسـتی و زیکـر و ئادابی تەریقەت، ساڵی ١٣٥٢ك باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ جەمیل لە جێگـای ئـەو کرا شێخ، دەستی کرد بە ئەنجامدانی کاروباری ئـاینی، خزمـەتکردنی مێوانـان و مریـدان، تەکیەکەی نوێکردەوە بە (منارە) و (گومبەت) و چەند هۆدە.

کۆچی دوایـی: سـاڵی ١٣٨١ك – ١٩٦١ز نـەخۆش کـەوت، لـە (کـەرکوك) چارەی نەخۆشی نەکرا، بردیانە (بەغدا) لەوێ لـە نەخۆشـخانەی کۆمـاری مـاوە، بـەیانی ڕۆژی سێ شـەمە (١٩)ی مـانگی سـەفەر ماڵئـاوایی لـە دنیـا کـرد، لـە مزگـەوتی شـێخ عبدالقادری گەیلانی شوورا، مامۆستا عبدالکریمی (مـدرس) و چـەند دۆسـتانی بەغـدا و کەرکوك نوێژیان لەسەر کرد، هێنایانەوە کەرکوك لە هـۆدەی پـێش گـۆڕی شـێخ عـەلی باوکی بە خاك سپێردرا.

(شێخ جەمیل) پێنج کوڕی هەبوو: شێخ عەلی و شێخ عبدالرحمان و شێخ عیرفـان و شێخ نوری و محەممەد.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٥٩٢ – ٥٩٤.

## جەمیل عەلی سعداللە کاوانی ( ٣٢٨ )

ناوی جەمیلە، کوڕی قازی عەلی، کوڕی سەعداللەی کوڕی مەلا ئادەمـە، دەوری ساڵی ١٩١٥ز لە گوندی (کاوانیـان)ی زرارەتـی هاتووتـەدنیا، قورئـانی پـیرۆز و کتێبـە سەرەتاییەکانی خوێند، ماوەك چووە گونـدی (خەتـە) لای مـەلا ئیـبراهیم، مـاوەکیش لـە (شەقڵاوە) لای مەلا عوسمانی گاینجی خوێند، چـووە (کەورگۆسـك) لای مـەلا عوسمـان،

هاتە (پیرزین) لای مەلا ئیسماعیل سوسەیی، پاشان چووە (مام خاران) لای مامۆستا مەلا عبداللەی (باوکم)، هەر لە خزمەت ئەودا هاتە (شەوزار)، دوایی هاتە (بەحرکە) لە لای باوکم کۆتایی بە خوێندن هێنا.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی خۆیان (کاوانیان) و دوایی زۆر پێ نەچوو چووە (باوە خەلان) چەند ساڵان لەوێ مەلا بوو، پاشان باری کرد گەڕاوە (کاوانیان)، ساڵی ١٩٦٣ز چووە سەفەری (حەج)، لە ١٩٦٥ کرا (واعیز)، لە ١٩٩٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی خۆیان لە کاوانیان بە خاك سپێردرا، مامۆستا سێ کوڕی خوێندەواری هەنە: عەلی و خالید و زوبەیر.

## جەواد تەقی بەیاتی (٣٢٩)

ناوی جەوادە، کوڕی تەقی بەیاتی حەلەوانی کوردییە، لە صەدەی سێزدەی کۆچی ژیاوە، زانایەکی شەرع زان و ئوصوڵ زان بووە، لە شاری (نەجەف) دانیشتووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: الفقه الإستدلالي، الشافي، شرح اللمعة: دە بەرگە، تتميم مشارق الشموس في شرح الدروس.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/ ١٦٤.

٢. معجم أعلام الكورد ١٩٣.

## جوەیرییە ئەحمەد هەکاری (٣٣٠)

جوەیرییە خان، کچی ئەحمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنی هەکارییە، دەرسی فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) لە لای چەند زانایان خوێندووە، تا گەیشتوتە پلەی مامۆستایەتی لە فەرموودە، دەرسی داوە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٧٧٣ك – ١٣٧١ز کۆچی دوایی کردووە، خوشکێکی زانای هەبووە ناو (ئەسمائە).

سەرچاوەکان:
١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٩٣ – ٩٤ – ١٤٠.
٢. معجم أعلام الكورد ١٩٥.
٣. الدرر الكامنة ١/٢١٠
٤. شذرات الذهب ٦/ ٢٨٠.

## جويريية عبدالرحيم عيراقی (٣٣١)

جووەيرييە خان، کچی مامۆستای فەرموودەناس عبدالرحيم حوسێن حافيزی عێراقييە، خوشکی فەرموودەناس ئەحمەد وەليەدين ئەبو زەرعەيە، نازناوی (أم الكرام)ە، مەزهەبی شافيعی بووە، لە (قاهيرە) دانيشتووە، لە دەوری ساڵی ٧٨٨ك – ١٣٨٦ز هاتووتەدنيا، دەرسی لە خزمەت باوکی و چەندان زانايانی تر خوێندووە، ئيجازەی وەرگرتووە، لەگەڵ باوکی چوويتە سەفەری حەج، ماوەك لە (مەدينە)ی پيرۆز مايتەوە، ئافرەتێکی بە دين و خێرخواز بووە، حەزی لە خوێندنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بووە، لەو بابەتە دەرسی داوە، لە شەوی شەمەی (٤) چواری مانگی (محرم) ساڵی ٨٦٣ك – ١٤٥٨ز کۆچی دوايی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ١٢/ ١٨.

– ح –

## حاجی قادر کۆيی (٣٣٢)

ناوی حاجی قادرە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا صاڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەيە، لە مانگی حاجييان (ذي الحجة) لە دايك بووە، بۆيە ناونراوە (حاجی) کەواتە حاجی ناوە، نازناو نيە، ساڵی ١٢٣٢ك – ١٨١٦ز لە گوندی (گۆڕ قەرەج) هاتووتەدنيا، عەشيرەتی (زەنگەنە)يە.

شاعيری بەناوبانگ و خاوەن هەست و بير، دڵسۆز و دڵ داغ بۆ گەلەکەی دەستگير، (حاجی) لە کۆيە دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند جێ گەڕا، لەگەڵ مەلا

عەبدوڵڵای مەلا ئەسعەدی جەلیزادە چوونە دۆڵی (بالەکان)، ماوەك لە لای مەلا ئەحمەدی کوڕی ئادەمیان خوێندووە، ماوەکیش چوونە گوندی (شێخ وەتمان) لای مەلا محەممەدی کاك عبدالله، لەوێ لەگەڵ فەقییەکان دەچوونە کوێستانی (سینگوڕە)، لەبەر ئەو یادکردنەوە بوو دوای چەند ساڵ (حاجی) کە چوو بۆ (ئەستەمبۆڵ) نامەکی بۆ مەلا عبد اللەی جەلی هەنارد، لەو نامەیەدا دەڵێ:

بەبیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەك
بە بێ خاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەك
کە چووینە (سینگوڕە) سینەم گڕی بەست
وەکو قەندیلی سەرگەردان وەکو مەست

وەکو لە پێشدا باسمان کرد (حاجی) چووە (ئەستەمبۆڵ)، لەوێ کرا مامۆستای منداڵەکانی بەدرخان پاشای گەورە، دەنگوباسی زانایی و شاعیراتی بەلاوبۆوە،چەند کۆمەڵە شیعری کۆکردنەوە، دایەوە عبدالرزاقی بەدرخان بۆ ئەوەی لە چاپی بدات، پاشان عبدالرزاق گیرا و کوژرا، دیوانەکەش بێ سەروشوێن چوو، بزر بوو، دوایی عبدالرحمان سەعید چەند تاکە تاکە شیعری لەولا و لەولا هێنا و کۆی کردنەوە، ساڵی ١٩٢٥ز لە (بەغدا) چاپی کرد.

شیعرەکانی (حاجی) بەشی هەرەزۆریان لە بابەت دڵتەنگی و ئازارکێشانە بۆ گەلی کورد، زۆر حەزی کردووە کە نووسین بە زمانی خۆمان بێت، وە ئاخان هەردەکێشی لە بەر ئەوەی لە زووەوە مێژوی خۆمان تۆمار نەکردیە، وەك دەڵێ:

| | |
|---|---|
| کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز | بە کوردی گەر بنووسرایە زەمانی |
| مەلا و و پیر و شێخ و پادشامان | هەتا مەحشەر دەما ناوونیشانی |

حاجی لە ١٣١٤ك – ١٨٩٦ز کۆچی دوایی کردیە.

سەرچاوەکان:

١. گوڵزاری کوردستان ١٦٩.

٢. محەممەد بن عبدالله الجلي ١٤٢.
٣. مشاهير الكورد ٣٣٩ – ٣٤٠.
٤. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/ ١١٩ – ١٧٩.
٥. ئەدەبی کوردی ٢٩٥ – ٢٩٩.
٦. تاريخ مشاهير كورد ٢/ ٥١ – ٥٤.
٧. الأكراد في بهدينان ١٩٩.
٨. معجم أعلام الكورد ٥٤٦ – ٥٤٧.

## حامد عبدالله (قارصی) (٣٣٣)

ناوی حامیدە،کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (قارصە) مەزهەبی حەنەفییە، زانای تەفسیر و نەحو بووە، هەروەها شاعیر بووە، لە ١٢٩١ك ـ ١٨٧٤ز لە شاری (قارص) کۆچی دوایی کردووە. دانراوەکانی: تفسیر سورة (عبس)، (شرح الإظهار)، دیوان شیعر بە تورکی

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/١٧٩.
٢. هدية العارفين ١/٢٦١.

## حامد عەلی ئامێدی (٣٣٤)

ناوی حامیدە، کوڕی عەلی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی عبدالرحیمی، کوڕی عیمادەدینی کوڕی محیەدینی (ئامێدی)یە، ساڵی ١١٠٣ك ـ ١٦٩١ز هاتووتە دنیا، لە مزگەوتی (ئەمەوی) دەرسی داوە، ساڵی ١١٣٧ك ـ ١٧٢٤ز کرا موفتی (دیمشق) مەزهەبی حەنەفی بووە، وتار خوێنەکی زمان پاراو و رەوان بووە، ساڵی ١١٧١ك ـ ١٧٥٧ز کۆچی دوایی کردووە، دانراوی خۆی زۆرن، ژمارەیان لە سی تێدەپەڕێت.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ١٦١/٥.

٢. إيضاح المكنون ٣/١٣ - ٣١١.
٣. مشاهير الكورد ١٦٦.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤٧.
٥. كشف الظنون ١/٦٦٤.
٦. سلك الدرر ١١ - ١٩.
٧. الأعلام ٢/١٦٦ (٥)١٩٠ (١٠)٦٦.
٨. معجم المؤلفين ٣/١٨٠ (١٣)٣٨٠.
٩. معجم أعلام الكورد ١٩٩.

## حامد عەلی بێسارانی (کاتب) (٣٣٥)

ناوی حامیدە، کوڕی مەلا عەلی بێسارانی یە، لە دەوری ساڵی ١٢٣٥ك – ١٨١٩ز هاتووتەدنیا، دوای ئەوەی لە (ئێران) خوێندنی تەواوکرد، هاتە خزمەت سیراجەدین شێخ عوسمان لە (تەوێڵە) تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەرگرت، لە (خانەقا) ماوە، جەنابی شێخ زۆر ڕێزی لێنا، کردیە کاتب و نووسەری تایبەتی خۆی، دوایی کردیە (خەلیفە)، شێخ چووبا سەفەر، ئەو دەبووە جێگری، کە شێخ کۆچی دوایی کرد، مەلا حامید چووە لای شێخ محەممەد بەهائەدینی کوڕی، کە شێخ بەهائەدین کۆچی دوایی کرد چووە لای شێخ عومەری برای، مەلاحامید هەرچەندە خەریکی نووسین بوو بۆ شێخەکان، هەروەها وێرد و زیکری تەریقەتی نەدەبوارد، درێغی لە دەرسدانەوە نەدەکرد، بەردەوام بوو لە سەر نووسین.

بەشێك لە دانراوەکانی:

١. عەقیدەی ئیمان و ئیسلام بە هەورامی: مامۆستا عبدالکرمی(مدرس) وەریگێڕاوە سەر زمانی (سۆرانی) چاپی کردووە.
٢. شەرحی مەسنەوی جەلالەدینی ڕۆمی بە فارسی سێ بەرگە.
٣. حاشیە لەسەر (گلشن راز)ی مەحمودی تەبریزی بە فارسی.

٤. شەرحی (زوبەد): لە فیقهی شافیعی بە فارسی.

٥. شەرحی هۆنراوەی (ذات الشفا)ی جەزەری بە فارسی.

٦. ریاض المشتاقین: باسی مەولانا خالید و شێخ عوسمانە.

مەلا حامید جگە لە مەلایەتی و نووسەری شاعیر و رۆشنبیر و قەڵەم لە کار بووە، چەندان قەسیدەی بۆ شێخ و کورەکانی و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمی داناوە.

کۆچی دوایی: لە دەوروبەری ساڵی ١٣١٠ك - ١٨٩٢ز لە بیارە کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی (ملەگای چنار) بە خاك سپێردرا، کوڕێکی هەبوو ناو عبدالمجید: لە خانەقای (بیارە) پێش نوێژ بوو، زاتێکی بە دین و لە خواترس بوو، ساڵی ١٣٣٠ك - ١٩١٢ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی دی هەبوو ناو شەمسەدین: ساڵی ١٢٩٥ك لە (تەوێڵە) لە دایك بوو، پێش نوێژ بوو لە (سرواباد) و(نی)، لە (دورود) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/ ١٨٨ - ١٩٧.

٢. تاریخ مشاهیر کورد ١/ ٤٦٤ - ٤٦٧.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٤٧ - ١٤٩ - ٢٣٥ - ٢٣٦.

٤. یادی مەردان ٣٤٣ - ٣٥١.

## حامد مەحمود حەڕانی ( ٣٣٦ )

ناوی حامیدە،کوڕی مەحمودی، کوڕی حامیدی حەڕانی یە، نازناوی (أبو الفضل)ە، ساڵی ٥١٣ك - ١١١٩ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، چووە (بەغدا) بۆ خوێندن، ماوە لەوێ تا لە شەریعەت شارەزا بوو، گەڕاوە (حەڕان) کرا (موفتی) هەروەها دەرسی دەداوە، زانایەکی زۆر بە دین بوو بەردەوام بوو لەسەر قورئان خوێندن، بەڵام لە دەست نوێژ و پاك و خاوێنی دوودڵ بوو، (نوردەدین مەحمودی) کاربەدەست قوتابخانەکی گەورەی بۆ دروست کرد، لە (٧) مانگی شەوالی ساڵی ٥٧٠ك - ١١٧٥ز لە (حەڕان)

کۆچی دوایی کرد، دیوانی وتارەکانی هەینی هەیە، مەلا ئیلیاسی کوڕی زانایەکی شەرع زان بوو لە شوێنی باوکی دانیشت.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/ ٣٣٢ – ٣٣٤.

٢. المنتظم ١٠ / ٥٢٤.

## حامد یوسف (تەفلیسی) (٣٣٧)

ناوی حامیدە، کوڕی یوسفی، کوڕی حوسێنە نازناوی (ئەبو ئەحمەدە)، خەڵکی (تەفلیس)ە، هاتووتە (بەغدا) بۆ خوێندن، یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی دەوری خۆی، چووە (قودس) لای محەممەد عەلی بەیهەقی خوێند چووە (مەککە)ی پیرۆز لای عەلی ئیبراهیم عەلی عاقولی خوێند، پاشان کرا (مدرس) دەرسی دەداوە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/ ٢١٨ – ٢١٩.

٢. الأنساب ١/ ٤٩٤.

## حەبیب اللە ئیسماعیل ڕوحانی (٣٣٨)

ناوی حەبیب اللە یە، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبدالغفوری (کاشتری)یە، ساڵی ١٢٨٧ك – ١٨٧٠ز لە گوندی (کاشتر) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە ژێر چاودێری باوکی قۆناغی سوختەیی بڕی، ئەمجا چووە گوندی (لۆن سادات)، لای مەلا مەحمود کاکۆ زەکەریایی، دوایی چووە گوندی (ماسان)، ساڵی ١٣٠٨ك چووە مەدرەسەی (دارۆغا) لای مەلا عبدالمجید، پاشان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

ئەمجارە هاتە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت، گەڕاوە (کاشتر) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، لە ١٣٢٠ك باوکی کۆچی دوایی کرد، ساڵی

١٣٤٤ك لە (سنە) باری کرد چووە قوتابخانەی (عبدالله بەگ) لەوێ خەریکی دەرسدانەوە بوو.

(مامۆستا ڕوحانی) بیست دانراوی خۆی هەیە، بەشێکیان فارسین، بەشێکیان عەرەبین، زۆربەیان هۆنراوەن.

کۆچی دوایی: شەوی یەك شەممەی ڕۆژی عەرەفاتی جێژنەی قوربان ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (شێخان) بە خاك سپێردرا، کوڕێکی زیرەك و نووسەر و مێژووزانی هەبوو ناسرابوو بە (بابامەوردۆخی ڕوحانی شێوا): لە ١٣٤٠ك – ١٩٢١ز هاتە دنیا، لە ١٣٦٢ك ئیجازەی وەرگرت، دەوری سێ دانراوی هەیە، لەوانە: تاریخ مشاهیر کورد سێ بەرگە لە ٢٠٠٣ز چاپخانەی (سروش) لە (ئێران) چاپ کرا.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ٢/ ٢٥٠ – ٢٥٨ – ٥٣٤ – ٥٤٤.

## حەریز ئەحمەد سەلماسی (٣٣٩)

ناوی حەریزە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەریزە، خەڵکی (سەلماسە) یەکە لە زانایە بژاردەکانی سەردەمی خۆی، بیروڕای باش بووە، زمان ڕەوان بووە، لە (سەلماس) لە لای (موطەهیری کوڕی محەممەد)ی خوێندووە، دەرسی بە (هبة الله)ی سەقطی داوە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ٢/ ١٢٦ – ١٢٧.

٢. الأنساب ٣/ ٢٩٨.

## حەسەن ئیبراهیم (فارقی) (٣٤٠)

ناوی حەسەنە، نازناوی ئەبو عەلی یە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی عەلی، کوڕی بورهونە مەزهەبی شافیعی بووە، لە (١٠)ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٤٣٣ك – ١٠٤١ز لە شاری (میافارقین) هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە لای مەلا محەممەدی کازروانی خوێند، پاشان مامۆستای کۆچی دوایی کرد، ئەویش چووە (بەغدا) لای شێخ ئەبو ئیسحاقی شیرازی

خاوەنی کتێبی (المهذب) ماوەکی خوێند، هەروەها کێبی (شامل)ی لای (ابن الصباغ) خوێند و لەبەری کرد، پاشان کرا (قازی) واسیط، زاتەکی بە دین و دوور لە دنیا و ڕەوشت چاك بوو، زۆر ئاقڵ مەند بوو، ڕۆژی چوار شەممەی (٢٢)ی مانگی (محرم) ساڵی ٥٢٨ – ١١٣٣ز لە (واسیط) کۆچی دوایی کرد، کتێبی (الفوائد)ی لەسەر (مهذب) نووسیوە، دوو بەرگە.

سەرچاوەکان:
١. وفیات الأعیان ١/٣٥٩.
٢. البدایة والنهایة ١٢ / ٢٢٣.
٣. کشف الظنون ٢ / ١٣٠٢.
٤. شذرات الذهب ٤/ ٨٥.
٥. معجم المؤلفین ٣/ ١٩٥.
٦. اللباب ٣ / ٢٧٨.
٧. طبقات الشافعیة ٧٥.
٨. مشاهیر الکورد ١/ ١٧٤.
٩. معجم أعلام الکورد ٢٠٥.

## حەسەن ئیبراهیم مەولان ئابادی (٣٤١)

ناوی حەسەنە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی میکائیلە، خەڵکی (خورخورە)ی سەر بە (سنە)یە، لە دەوروبەری ساڵی ١٠٤٠ك – ١٦٣٠ز هاتووتەدنیا، لە لای باوکی خوێندنی بردەسەر، پاشان بۆ خوێندن چووە (میصر)، گەڕاوە کوردستان تەریقەتی لە شێخ محەممەدی نۆدەیی بەرزنجی وەرگرت، گەڕاوە (مەولان ئاباد) کاروباری مەلایەتی و شێخایەتی ئەنجام دەدا، بە خەتە خۆشەکەی نوسخەکی لە قورئانی پیرۆز نووسیوەوە، لە ١١٣٥ك – ١٧٢٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٦٣ – ١٦٤.

## حەسەن ئەبوبەکر (دیاربەکری) (٣٤٢)

ناوی حەسەنە، ناسراوە بە ئەبوبەکر، خەڵکی شاری (دیاربەکر)ە، لە زانایەکانی سەدەی دوازدەی کۆچی یە، کتێبی (المجاز والإستعارة)ی داناوە، لە (١٥)ی مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١١٩٢ك – ١٧٧٨ز تەواوی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفین ٣/٢٠٨.

## حەسەن ئەبوبەکر ماردینی (٣٤٣)

ناوی حەسەنە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی محەممەدی، کوڕی عوسمانی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عومەری، کوڕی سەلامەی (ماردینی)یە، ساڵی ٧٧٠ك – ١٣٦٨ز لە (ماردین) هاتووتەدنیا، باوکی لە ماردین دەرسی دەدا، بەڵام خۆی بۆ خوێندن چووە (حەلەب) لەوێ چووە (مەککە)ی پیرۆز، لە خزمەت چەند زانایانی خوێند، چەند کتێبی لەبەر کرد، گەڕاوە (حەلەب) لەوێ کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ، ساڵی ٨٥٠ك – ١٤٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٣/ ٨٨.

## حەسەن ئەحمەدی ڕوهاوی (٣٤٤)

ناوی حەسەنە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی سەعیدی، کوڕی محەممەدی، کوڕی یەحیایە، خەڵکی شاری (ڕوهایە) نزیك (ئورفە)، چووە (بەغدا) چەند بابەتە فەرموودەی لە باپیری بیستبوو لەوێ بەلاوی کردەوە، وە فەرموودەی لە عبداللهی کوڕی زوبەیر و ئیبراهیمی کوڕی عبدالسلام و عبدالرحمان عبداللهی جزیری وەرگرت، خۆشی دەرسی فەرموودەی بە ئەبولحەسەنی دارەقوطني و چەند کەسانی دی داوە، مامۆستا حەسەن ڕوهاوی لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٣٢٩ك – ٩٤١ز لە شاری (ڕوها) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ٣/ ١٢٠ – ١٢١.

## حەسەن ئەحمەد هەولێری (٣٤٥)

ناوی حەسەنە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی زوفەری (هەولێری)یە، ناسراوە بە (صوفی عێزەدین)، لە ٦٦٣ك – ١٢٦٤ز هاتووتەدنیا، خەریکی فێربوونی زانست و زانیارییەکانی ئاینی بوو، تا چاك شارەزابوو ماوەك خەریکی دختۆری بوو، تا شارەزایی تایبەتی لێ پەیداکرد، یەك بوو لە زانایە مەزنەکانی (هەولێر)، زاتەکی قسەخۆش و خولق وخوو خۆش بوو، لە ولآتان زۆر گەڕاوە، چووە (تەوریز) چووە (ماردین) چووە (دیمشق) لەوێ نیشتەجێ بوو، لە ٧٢٦ك – ١٣٢٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. معجم المؤلفين ٣/١٩٩.
٢. الأعلام ١/٢٧٥ /٢/١٩٥.
٣. أربيل في مختلف العصور ٩٤.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٠.
٥. شذرات الذهب ٦/٧٢.
٦. البداية والنهاية ١٤/١٣٢.
٧. معجم أعلام الكورد ٢٠٦.
٨. الدرر الكامنة ٣/ ١٣، بەڵام ناوی لەوێ بە عەلی نووسراوە.


## حەسەن ئەسەد فارقی (٣٤٦)

ناوی حەسەنە، کوڕی ئەسەدی، کوڕی حەسەنی (میافارقین)ە، شاعیر و نووسەر و عەرەبی زان و شارەزا لە (نەحو) بووە، ماوەك سەرۆك دیوان بوو لە (دیاربەکر)، لەوێ گواستراوە بۆ (میافارقین)، لەوێ ناخۆشی لێ پەیدابوو، ئاوارەبوو بۆ (حەلەب)، دوایی گەڕاوە (حەڕان)، لەوێ لەلایەن سەرۆکی شارەکە فەرمانی کوشتنی دەرچوو، لە ٤٨٧ك – ١٠٩٤ز لە سێدارەدرا، ئەو کتێبانەی داناون: شرح الآيات المشكلة الإعراب، شرح اللمع لابن جني، كتاب الألغاز.

سەرچاوەکان:
١. فوات الوفيات ١/٣٢١ – ٣٢٤.
٢. معجم المؤلفين ٣/٢٠٦.
٣. هدية العارفين ١/٢٧٧.
٤. ايضاح المكنون ٢/٤٣.
٥. كشف الظنون ٢/١٥٦٣.
٦. شذرات الذهب ٣/٣٨٠.

**حەسەن ئەسکەندەر (نابینا) (٣٤٧)**

ناوی حەسەنە، کوڕی ئەسکەندەری، کوڕی حەسەنی، کوڕی یوسفی، کوڕی حەسەنە، خەڵکی (نوصەیبینە)، لە ٨٧٢ك – ١٤٦٧ز هاتووتەدنیا، لە زانیاریەکانی قورئانی پیرۆز شارەزابووە، لە شەریعەت و نەحو و تەجوید ئاگاداربووە، کتێبی زۆر لەبەربووینە، بە دین و دوور لە دنیا بووە، دیمەن و دەروون پاك بووە، گوێی لە قورئان و فەرموودە بیا دەگریا، ڕووخۆش و چاوبلند بووە، ساڵی ٩٥١ك – ١٥٤٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/ ٢٨٨ – ٢٨٩.

**حەسەن بایەزید بەرزنجی (٣٤٨)**

ناوی حەسەنە، کوڕی بایەزیدی، کوڕی ئیسماعیل بەرزنجییە، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، نووسراو و حاشیەی هەنە، ساڵی ١٢٢٩ك – ١٨١٤ز لە گوندی (خەیوەتە) سەر بە (بازیان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ١/٢٩٥.

## حەسەن بیشر دیاربەکری (٣٤٩)

ناوی حەسەنە، کوڕی بیشری، کوڕی یەحیای (دیاربەکر)یە، پاشان چوویتە (بەصرا) لەوێ نیشتەجێ بووە، هەر لەوێ ساڵی ٣٧١ك - ٩٨١ز کۆچی دوایی کردووە، دە دانراوی پتر هەنە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/٢٠٩ - ٢١٠.

٢. الفهرست ١٥٥.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٠٧.

٤. أنباء الرواة ١/٢٨٥ - ٢٩٠.

٥. كشف الظنون ١/ ٢٢٥.

٦. بغية الوعاة ٥٠٠ - ٥٠١.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٠.

٨. الأعلام ١/١٨ /١٩٩/٢.

٩. معجم الأدباء ٣/٥٤ - ٦١.

١٠. ايضاح المكنون ١/٢٢٥.

## حەسەن جەعفەر سەلماسی (٣٥٠)

ناوی حەسەنە، نازناوی ئەبومحەممەدە، کوڕی جەعفەری کوڕی داودە، خەڵکی (سەلماس)ە، مامی مامۆستا ئەبوعبداللەی سەلماسییە، لای چەند زانایانی خوێندووە، خۆشی دەرسی داوە، لە ٤١٩ك - ١٠٢٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ٣/٢٩٨.

## حەسەن حەسەن عەینتابی ( ٣٥١ )

ناوی حەسەنە، کوڕی حەسەنی، کوڕی عبداللەیە، خەڵکی (عەینتابە)، ناسراوە بە (عەینی) ساڵی ١١٨٠ك – ١٧٦٦ز هاتووتەدنیا، لە (ئەستانە) دەرسی فارسی داوە، لە ١٢٥٣ك – ١٣٣٦ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: دیوانی شیعر بە تورکی، ساقی نامە: ٢٠٣٠ بەیتە، نەصرەت نامە: هۆنراوەیەکی تورکی هەزار بەیتە، نظم الجواهر في اللغة.

سەرچاوە: هدية العارفين ١/٣٠١.

## حەسەن سەعدی سیسێری ( ٣٥٢ )

ناوی حەسەنە، کوڕی مەلا سەعدی، کوڕی مەلا حەسەنی، کوڕی مەلا سولەیمانی، کوڕی مەلا حوسێنی، کوڕی مەلا یوسفی، کوڕی مەلا ئیبراهیمی سیسێری یە. دەڵێن لە نەتەوەی حەزرەتی ئەبوبەکرن، ساڵی ١٩١١ز لە گوندی (سیسێری) سەر بە (سەردەشت) هاتوتەدنیا، لە لای مەلا سەید حوسێنی مەلای گوندی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (ڕەبەت) لای مەلا عبدالرحمانی سیسێری، دوایی چووە (قولتە) لای مەلا عبداللەی محەممەدی سوتوویی، هەروەها چووە، (پێشاسپ) لای مەلا عەلی، هاتە (گەناو)ی عێراق لای مەلا صالح، پاشان چووە (کۆیە) لای مەلا محەممەد نورەدین، لەوێ لە ساڵی ١٩٤٨ز ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) مەلایەتی لە گوندانی (ڕەبەت) و (لیلانە) و (گۆڵی) کردووە، ساڵی ١٩٨٩ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەبوو: عبدالرحمان و عبدالکریم.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٧٨ – ٢٧٩.

## حەسەن سەعید دیاربەکری ( ٣٥٣ )

ناوی حەسەنە، کوڕی سەعیدی، کوڕی عبداللەی، کوڕی بنداری، دیاربەکرییە، ساڵی ٥١٦ك – ١١٢٢ز لە (شاتان)ی قەڵاتی (دیاربەکر) هاتووتەدنیا، چووە (بەغدا) دەرسی شەریعەتی خوێند، دوایی ڕووی خۆی دایە خوێندنی فەرموودە، لە لایەن مەلایە

چاکەکانی ئەو سەردەمی، مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بوو، لە مانگی شەعبانی ٥٧٩ك – ١١٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: طبقات الشافعية الكبرى ٤/٣٩.

## حەسەن عبدالله بەندەنیجی (٣٥٤)

ناوی حەسەنە، کوری عبداللّهیە، هەندێك دەڵێن عوبیداللّه خەڵکی (بەندەینجە – مەندەلی)، نازناوی (ئەبوعەلی یە)، مەزهەبی شافیعییە، لە (بەغدا) دانیشتووە، لە ٤٢٥ك – ١٠٣٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبانی (الذخیره فی الفروع) و (الجامع فی الفروع)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. تاریخ أربیل ٢/٤٣٨.
٢. الأعلام ٢/٥٤ – ٢١٢.
٣. تاریخ مشاهیر کورد ١/٢٤.
٤. طبقات الفقهاء ٤٦.
٥. البداية والنهاية ١٢/٤٠.
٦. هدية العارفين ٥/٢٧٤.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤٩.
٨. معجم المؤلفين ٣/٢٣٨.
٩. كشف الظنون ١/٨٢٥.
١٠. طبقات الشافعيةی ئەسنەوی ١/ ١٩٣ – ١٩٤.
١١. المنتظم ٩/٢٦٧.

## حەسەن عبد الله جەوهەری (٣٥٥)

ناوی حەسەنە، کوڕی عبداللّهی، کوڕی حەسەنە، نازناوی (جەوهەری)یە، ساڵی ١٨٧٥ز لە گوندی (زەردەرو)ی سەر بە سەردەشت هاتووتەدنیا، ماڵیان باری کرد بۆ

(کوێرەگوێز) سەر بە (سەقز)، ماوەك لە (جامەرد)ی ناوچەی بۆکانی خوێند، دوایی چووە گوندی (عەمبار) ئەمجا چووە مزگەوتی سۆری سابلاغ، پاشان چووە (سلێمانی) و (کەرکوك) و (هەولێر)، دووبارە گەڕاوە (ئێران) لە مزگەوتی (دار الإحسان)ی سنە دەیخوێند، پاشان بووە مەلا لە (بۆکان) ماوەکیش مەلا بوو لە (سابلاغ)، دوایی مەلا عەلی کوڕی جوانەمەرگ بوو زۆری بۆ شپرزە بوو، دنیای بە یەکجاری لەبەر دڵی کەوت، چووە خزمەت شێخ عبیداللەی (نەهری) تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، ماوەك خەریکی کاروباری تەسەووف بوو، دوایی گەڕاوە (کوێرەگوێز) لای مەلا صاڵحی برای ماوە، تا ساڵی ١٩٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

ناوبراو شاعیر بوو نازناوی (جەوهەری)یە، نموونەی شیعری:

هەوای دیداری یارانی وەتەن کەوتۆتە سەرفیکرم
هەتا ئەمجار دەیانبینم، بە چاوانم خودا نەمرم

لە هیجرانی مەلا صالحی برام و دوو نەوەی دایم
بە چاوی پڕ لە فرمێسکی کوڵی گریان و شین دەمرم

بە ئیزنی حەزرەتی شێخ چەندە پێم خۆشە بە دڵ خۆشی
لە (ورمێ) سواری ماشێن بم جەوازی ڕێگە وەربگرم

لە سابلاغ و لە میانداو و لە بۆکان تێپەڕم یەکسەر
لە هیچ لایێ هەتا سەر مەرقەدانی باغچە خۆنەگرم

لە نێو ئەو سێ خەلیفانە، بە ئیخلاص و بە هۆشیاری
لە ئەرواحی ئەوان زاتانە فەیز و بەهرە وەربگرم

لە ژێر پێی دایك و باوك و ژوور سەری کاك عەلی چەند ڕۆژ
بە گریان سەر لەسەر ئەو مەرقەدانە ساتێ هەڵنەگرم

بە چاوی پڕ لە ئەسرین دەست هەڵێنم، ڕەببی ئەمجارە
بە ئیمانێکی زۆر کامیل، بە لوتف و ڕوحی تۆ بمرم

سەرچاوە: مێژووی ئەدەبی کوردی ٦/٦٣ – ٦٩.

## حەسەن عبد الله خۆشابی (٣٥٦)

ناوی حەسەنە، کوڕی عبداللهیە، خەڵکی (خۆشابە) سەر بە (وانە)، زانایەکی بەرزی شافیعی بووە، حاشیەی لەسەر (ئەنوار) هەیە، لە دەوروبەری ساڵی ١٢١١ك – ١٧٩٦ز کۆچی دوایی کردووە.

خۆشاب: کورت کراوەی (خۆش ئاب)ـە واتە: ئاوخۆش (خۆشاو).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٣/٢٣٩.

٢. هدية العارفين ٥/٣٠١.

## حەسەن عبد الله قەرەداغی (٣٥٧)

ناوی حەسەنە، کوڕی عبداللهی، کوڕی عوسمانی، کوڕی عبداللطیفی، کوڕی شێخ مەعروفی مەردۆخی یە، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر و لە زانست و زانیاری پەروەردە بووە، لە قوتابخانەی باوك و باپیرانی خوێند تا پێگەیشت، ئەمجا چووە (بەغدا)، لە قوتابخانەی (سولەیمانیە) لای مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی تەواوی کرد و ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (قەرەداغ) دووبارە چۆوە (بەغدا)، کردیانە (مدرس) لە (کفری)، گەڕاوە کوردستان دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو: شێخ محەممەد و شێخ عبدالله.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦٤ – ١٦٥.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٦١ – ١٦٢.

## حەسەن عبدالقادر چۆڕی ( ٣٥٨ )

ناوی حەسەنە، کوڕی سەید عبدالقادری کوڕی سەید ئیبراهیمی کوڕی سەید عبدالرحمانی کوڕی مەلا ئیبراهیم میرزای کوڕی سەید عبدالغفاری کوڕی سەید ئیبراهیمی کوڕی مەلا عبدالکریمی کوڕی مەلا ئەبوبەکری (مصنف)ە، دەوروبەری ساڵی ١٢٥٥ك – ١٨٣٩ز لە گوندی (چۆڕ) ناوچەی (مەریوان) چاوی خۆی بە دنیا هەڵهێناوە، ساڵی ١٢٦٠ك دەستی کرد بە خوێندن لە چەند شوێنان گەڕا، تا دەنگوباسی مەلا چاکی مەلا عەلی قزلجی بیست، چووە (تورجانی) سەر بە (بۆکان)، ماوەی چوار ساڵان لە خزمەتی خوێند، ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (چۆڕ)، (ئەو گوندە لە بەر بێ ئاوی، تنۆك تنۆك چۆڕ چۆڕ ئاویان دەهاتە ناو کانیەکە بۆیە ناونراوە: چۆڕ)، دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان، هەمیشە خەریکی نووسین و دانان و بەلاوکردنەوەی زانیاری بوو.

چەند دانراو و حاشیە و پەراوێزی هەنە، لەوانە: حاشیە لەسەر شەرحی موغنی، حاشیە لەسەر سعداللەی گچکە، حاشیە لەسەر تەصریفی مەلا عەلی، حاشیە لەسەر (تهذیب المنطق)، حاشیە لەسەر فەریدەی سیوطي، حاشیە لەسەر جەلالی مەنتیق، حاشیە لەسەر گەلەنبەوی بورهان، حاشیە لەسەر عبداللە یەزدی، حاشیە لەسەر عبدالحکیم لەسەر سەید شەریف لەسەر شەرحی شەمسیە: نووسینی ئەو کتێبە بیست ساڵی خایاند، حاشیە لەسەر تشریح الأفلاك، حاشیە لەسەر ئوسطرلاب، نامیلکەی ظەرف، حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی: دەستی کرد بە نووسینەوەی ئەو کتێبە تا گەیشتە سوڕەتی (القیامـة) لەو کاتەدا قیامەتی بەسەرداهات و ئەو ساڵە (١٣٢٣ك – ١٩٠٥ز) کۆچی دوایی کرد.

چوار کوڕی مەلای هەبوو: سەید عبدالقادر و سەید عبدالکریم و سەید حوسێن و سەید محەممەد کە لە هەموویان مەلاتر بوو، سەید عبدالقادر دوو کوڕی مەلای هەبوو، محەممەد و ئەحمەد، سەید محەممەد کوڕێکی مەلای هەبوو بەناوی: (عەطا)، سەید عبدالکریم کوڕێکی مەلای هەبوو بەناوی: (ئیبراهیم).

سەرچاوەکان:
١. یادی مەردان ٢/ ٥١٣ – ٥١٦.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ١٣٨ – ١٤٠.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦٥ – ١٦٨.
٤. بنەماڵەی زانیاران ٥٠٢ – ٥٠٦.

**حەسەن عبدالکریم قەرەچێواری (٣٥٩)**

ناوی حەسەنە، کوڕی عبدالکریمی، کوڕی عبدالقادری، کوڕی مەحموودی، کوڕی شێخ ئیسماعیل (ولیانی)یە، ساڵی ١٢٦٣ك – ١٨٤٧ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد،، ساڵی ١٢٧٥ك باوکی کۆچی دوایی کرد، بەڵام چونکە تامی خوێندنی چێشتبوو بە دەم و دەروونی، کۆڵی نەداو و وازی لە خوێندنەکەی نەهێنا، تا جۆرە زانستەکان و شەریعەتی تەواوکرد.

مەلایەتی و شێخایەتی: چووە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ تەریقەتی (قادری) لێ وەرگرت، لەسەر فەرموودەی شێخ چووە گوندی (قەڵا میکائیلە)، ماوەك لەوێ خەریکی ڕێ نیشاندانی خەڵکان بوو، دوای باری کرد بۆ (قەرەچێوار) ئامۆژگاری دەکردن بەو ئامۆژگاریانە: (بە قەد توانا خۆتان لە حەرام و ماڵی گومان لێکراو دووربخەنەوە، خەریکی قورئان خوێندن بن، سوننەت و واجبەکان مەچوێنن، شەونوێژ بکەن، دووشەمان و پێنج شەمان بە ڕۆژوو بن، خۆتان خەریك مەکەن و وتەی بێ سوود مەکەن)، بەم شێوەیە توانی ڕایان بکێشێت بۆسەر ڕێگای پیاوە چاکەکان و ڕەوشتی وەلییەکان، ناوبانگی دەرکرد، ناسرا، خەڵکان لە دوورەوە دەهاتنە خزمەتی، بۆ سوود وەرگرتن لە بابەتەکانی ئاینی و دەروونی و دەروێشی، دوا عەمری لە (قەرەچێوار) باری کرد چووە (قادر کەرەم) لەوێش بە هەمان شێوە خەریکی ئاینی پیرۆز بوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣١٤ك – ١٨٩٦ز کۆچی دوایی کرد، بە داخەوە کوڕی نەبوو جێگری بێت، بەڵام چەند خەلیفە و برا و برازای هەبوون، درێغیان نەکرد، دوای ئەو بۆ جێبەجێکردنی داب و ڕەوشتی تەریقەت و خزمەت کردن بە ئیسلام.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦٨ – ١٦٩.

٢. تاريخ مشاهير كورد ٢/ ٩٩.

## حەسەن شێخ عەدی موسافیر (٣٦٠)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەدی، کوڕی صەخری، کوڕی موسافیری، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موسایە، ناسراوە بە: (تاج العارفين)، عەرەب پێی دەڵێن: (شيخ الاكراد) ساڵی ٥٩٢ك – ١١٩٦ز لە گوندی (لالش) هاتووتەدنیا.

ساڵی ٦٢٧ك – ١٢٣٠ز لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز هاتە (هەولێر)، لەبەر ئەوەی قوتابی و هاوەڵەکانی ناکۆکیان لێ پەیدابوو، لەگەڵ قوتابی و هاوەڵەکانی شێخ عبداللهی کوڕی حەسەنی (حەداد) ئەوەبوو: کە بە سەر شێخ عبدالله یان دادا و لە ئەنجامدا بە چەند جێ بریندارایان کرد، هەروەها لە پاش مردنی گۆڕەکەیان هەڵکەند و لاشەکەیان ئاگربەردایێ و سوتاندیان و گۆڕستانەکەشیان تێکدا، شێخ حەسەن لە ٦٤٤ك – ١٢٤٦ز لە قەڵاتی (موصل) خنکاندرا.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ١/١٦٦ /٢/ ١٧١.

٢. هدية العارفين ٥/٢٨١.

٣. معجم المؤلفين ٣/٢٤٥.

٤. شذرات الذهب ٥/ ٢٢٩ – ٢٣٠.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٥.

٦. معجم أعلام الكورد ٢٠٩.

٧. أربيل في العهد الاتابكي ٣٤٠.
٨. إيضاح المكنون ٢/٧١٨.
٩. فوات الوفيات ١/٣٣٤.
١٠. مشاهير الكورد ١/١٧٣ – ١٧٤.

## حەسەن عەلی حەڕانی (٣٦١)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی حوسێنی (حەڕانی)یە، لە صەدەی چواری کۆچی ژیاوە، زانای فەرموودە و شەریعەت بووە، کتێبی (تحف العقول في المواعظ والحكم والآداب المأثورة عن النبي والأئمة)ی داناوە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٣/٢٥٢.

## حەسەن عەلی سیوفی (٣٦٢)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی یوسفی، کوڕی موختاری هەولێری یە، ساڵی ٨٥٠ک – ١٤٤٦ز لە (حصن كيفا) هاتووتەدنیا، هەر لەوێش پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی تەواوکرد، هەمووی لەبەرکرد، هەروەها کتیبانی مینهاجی نەوەوی و ئیرشاد و ئەلفییەی حەدیس و مینهاجی بەیزاوی و ئەلفییەی ئیبن مالیك و تەصریف و شەمسییەی هەموو لەبەر کرد، عەروزی لە (حەلەب) خوێند، چەند زانیاری قورئانی پیرۆزی لە (قاهیرە) خوێند، شەریعەتی لە (قودس) خوێند، ماوەك خەریکی حەدیس و ئوصوڵ و مەنتیق و بەلاغە بوو، تەفسیری لای مەلا زادە خوێند، نەحوی لای مەلا عبدالرحمانی جامی خوێند.

ساڵی ٨٦٦ك چووە سەفەری (حەج)، لەوێش هەندەکی خوێند، گەڕاوە (دیمشق) ماوەکی دی خوێند، ئیجازەی فەتوا و دەرسدانەوەی پێدرا، بووە مەلایەکی چاکی ئەو سەردەمی، حاشیەی لەسەر شەرحی مینهاجی مەحەللی هەیە، هەروەها شەرحی کافییەی کردووە، شیعری پڕ مانای هەیە، بۆ نموونە بە عەرەبی دەڵێ:

إذا مانالتِ السفهاءُ عِرضِي ولم يَخْشَوا من العقلاءِ لَوْمَا

كَسَوْتُ مِنَ السكوتِ فَمي لِثامَه وقلتُ: (نَذرْتُ للرَّحمنِ صَوْما)

لە مانگی مەولودی ساڵی ٩٢٥ك – ١٥١٩ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٣/١٠٧.

٢. شذرات الذهب ٨/ ١٣٣ – ١٣٤.

٣. معجم أعلام الكورد ٢١٠.

٤. إيضاح المكنون ٢/٢٥٨.

٥. معجم المؤلفين ٣/٢٦٥.

## حەسەن عەلی شاتانی (٣٦٣)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی سەعیدی، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (شاتانە): قەڵاتەکە لە دیاربەکر، ساڵی ٥١٣ك – ١١١٩ز هاتووتەدنیا، زانایەکی زمان زان و زیرەك بووە، چوویتە لای سوڵتان صەلاحەدینی ئەییوبی زۆر ڕێزی لێناوە، سەفەری (بەغدا)ی کرد، لەوێ شەریعەتی خوێند تا شارەزا بوو لە مەزهەبی شافیعی، هەروەها دەرسی فەرموودەی لەلایەن چەند زانایان خوێند، ساڵی ٥٣١ك چووە (دیمشق) لەوێ کۆڕی وەعزیان بۆ دانا، مامۆستا ساڵی ٥٧٩ك – ١١٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ٣/ ٣٠٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٢١١.

## حەسەن عەلی عەبدالانی (٣٦٤)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕێ یوسفی، کوڕی عوسمانی (عەبدالانی)یە، مامۆستایەکی زیرەك و بە توانا بووە. دانراوی زۆرن، لەوانە:

١. إنتخاب ما ورد من كلام الإمام علي (رضي الله عنه) ساڵی ١٢٠٧ك – ١٧٩٢ز تەواوی کردووە.

٢. الكوكب العالي: المنتخب من كلام الامام الغزالي: تەرجومەی عەرەبی ئامۆژگارییەکانی ئیمامی غەزالی یە، کە بەفارسی پێشکەشی بە: (عین القضاة)ی هەمەدانی کردووە، سالّی ١٢٠٦ك تەواوی کردووە.

٣. الدرة البيضاء والياقوتة الحمراء من أثار علي المرتضى لە ١٢٠٦ك تەواوی کردووە.

٤. قطر الغيث في شرح مقدمة أبي الليث: باوەڕییە.

٥. عين الإنسان في علم مايكون وماكان.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایان ٢/١٣٠ ، ١٣٣ ، ٣١١ ، ٣١٥.

## حەسەن عەلی (سعێرتی) (٣٦٥)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی عومەرە، خەڵکی (سعێرتە)، مامۆستا بن حەجەرِ دەڵێ: {پیاوەکی زەنگین بوو، لەگەڵ من حەزی لە وەرگرتنی فەرموودە بوو، لە دیمشق دەرسی دەدا}، هەر لەوێ سالّی ٨٠٩ك – ١٤٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/٨٣.

٢. معجم الاعم الكورد ٢١٠.

## حەسەن عەلی شارەزوری (٣٦٦)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی شارەزورە، لە دەوری سالّی ٦١٦ك – ١٢١٩ز هاتووتەدنیا، چوویتە (بەغدا) بۆ خوێندن، تەواوی کردووە، چەند ساڵ موفتی بووە، کتێبی (مهذب)ی ئەبو ئیسحاقی شیرازی هەموو لەبەر بووە، بەلاّم لەبەر ئەوەی خەت و قەڵەمی نەبووە، نەیتوانیوە شت بنووسێت، لە ٦٨٢ك – ١٢٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٣١٥.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٢١١.

## حەسەن عەلی قاسم شارەزوری (٣٦٧)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی قاسمی شارەزورییە، نازناوی (ئەبو عەلییە) لە ساڵی ٤٩٧ك – ١١٠٣ز هاتووتەدنیا، شەریعەتی لە بەغدا خوێندووە، لە (موصڵ) دەرسی داوە، لە ٥٦٤ك – ١١٦٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤٩.

٢. طبقات الشافيعية الكبرى ٤/٤٢.

٣. الإكليل في محاسن أربيل

## حەسەنی عەلی قزلجی (٣٦٨)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی محەممەدە، نازناوی (وەجدی)یە، ناسراوە بە (ابن القزلجي) ساڵی ١٢٧٥ك – ١٨٥٨ز لە (تورجان) هاتووتەدنیا، کوڕی مامۆستا عەلی قزلجییە، زانایەکی بەناوبانگ بووە، لە تورجان دەرسی داوە، کتێبی (کافیە الصبیان)ی داناوە، هەروەها شەرحی فەرائیزی باوکی کردووە، ساڵی ١٣٠٠ك مەلا حوسێنی خەواهیر زادە لە لای خوێندووە، ساڵی ١٣٠٢ك مەلا محەممەد صاڵحی باشماقی لە لای خوێندووە، پاشان باری کردووە چوویتە (بۆکان)، ساڵی ١٩٠٩ز کۆچی دوایی کردووە، کوڕێکی ناو محەممەد سەعیدی هەبووە، نازناوی (حافید) بووە، ساڵی ١٣٨٣ك – ١٩٦٣ز لە (کەرمانشا) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢١٣ – ٢١٤ – ٢٣٨ – ٢٤٣.

٢. تاريخ فرهنگ وأدب مكريان ٢٤٥ – ٢٥٥.

٣. تاريخ مشاهير كورد ٢/ ١٤٢ – ٣٩٤ – ٣٩٥.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٨.

٥. معجم أعلام الكورد ٥٠٤.

٦. بوژاندنەوە ٣/ ٢٦٦ – ٢٦٨ . ٤/ ١٢٦ – ١٢٨. ٥/ ٧٣ ، ٢٩٨.

## حەسەن عەلی نەصیبی (٣٦٩)

ناوی حەسەنە، کوڕی عەلی، کوڕی وەثاقی، کوڕی صەلّبی، کوڕی ئەبانی، کوڕی زورەیقی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی عبداللە یە، خەڵکی (نوصەیبینە) زانایەکی فەرموودەناسە، ساڵی ٣٤٤ك – ٩٥٥ز چووە (دیمشق) لەوی دەرسی دەدا، چەند مامۆستا لەسەر دەستی ئەو دەرچوون و بوونە فەرموودەناس.

سەرچاوە: معجم البلدان ٥/ ٢٨٩.

## حەسەن عومەر کوردی (٣٧٠)

ناوی حەسەنە، کوڕی عومەری، کوڕی عیسای، کوڕی خەلیلی، کوڕی ئیبراهیمە، دەوری ساڵی ٦٣٠ك – ١٢٣٢ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا. لە (جیزە)ی میصر نیشتەجێ بووە، تەفسیر و فەرموودەی تەواوکردووە، لە ٧١٢ك لە (جیزە) دەرسی داوە، لە ١٣ مانگی مەولودێ، ساڵی ٧٢٠ك – ١٣٢٠ز لە جیزە کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/١٨ /٣/ ١٨٨ – ١٨٩.

٢. معجم أعلام الكورد ٢١١ – ٢١٢.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٢.

## حەسەن قاسم سابلاغی (٣٧١)

ناوی حەسەنە، کوڕی میزا قاسمی قازی سابلاغە، ساڵی ١٨٧٧ز لە سابلاغ (مەهاباد) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواو کرد، چووە لای مەلا شەفیعی عەنبار، دوایی چووە لای مەلا حەسەنی قزلجی، لە (بۆکان) ماوەك لە لای مەلا صالحی سەرداباتی ماوە، کۆتایی بە خوێندن هێنا، چووە گوندی (گوێگجەلی)، لەوێ داروباری چاند باغ و باغچەی دانا، گوزەرانی زۆر

باش بوو، هۆدەی تایبەتی بۆ میوانان دروست کرد، برادەران سەردانیان دەکرد، شەوان قسەی خۆش و شیعر شیعرانە بوو، هەروەها مەڕ و مارات و کشتوکاڵی هەبوو، خوی و منداڵەکانی پێویستییان بە کەس نەبوو.

(مەلا حەسەن) زمان زان و قسە ڕەوان و شاعیر بوو، بۆ نموونە دەڵێ:

بۆ تۆیە، هەر بۆ تۆیە، دەتوانم بکەم سەنا
ڕۆژ و شەو تۆ دێنی، دەبەی مەغریب و عیشا
گەورە و گران و بێ کەس، بێ جێی و بێ مەکان
بۆ بێ کەسان کەسی، بۆ بێ جێیەکان پەنا
تەنیاو و بەرقەراری، هەر بووی و هەر دەبی
بێ ئارەزوو و نیازی، بێ باب و بێ برا

لە مەدحی پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ:

هەردەم سەلاتی زۆر و سەلاوێکی بێ ژمار
دیاری بێ بۆ ڕووحی پاکی تۆ ئەی فەخری ئەنبیا
مەقسوود لە خەلقی عالەم هەر زاتی پاکی تۆ
خەلقی هەموو توفەیلی، هەر تۆی کە بانگ کرا

دەربارەی حاڵی کورد دەڵێ:

یانی نە موڵك و ماڵە، لە بۆ مەنە حاڵ و بال
بێ جاڵ و بێ جەلال و بێ حاڵ و بێ سەلا
لێمەنە شا و ئەمیرە، نە سەردار و نەوەزیر
نە حاکم و نە نائیب و سەرتیپ و نە سوپا
هەر یەك غولام و نۆکەری بێگانە میللەتێك
زیز و کز و کەنەفت و کەسیفن و بێ نەوا

ساڵی ١٩٤٤ز کۆچی دوایی کرد، لە خانەقای شێخ بورهان بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ مشاهير كورد ٢/٢٩٣.

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/٣٤٣ – ٣٤٧.

## حەسەن کوردی ئامێدی (٣٧٢)

مامۆستا شێخ حەسەنی کوردی خەڵکی (ئامێدی)یە، سەرەتای ساڵی ١٠٣١ك – ١٦٢١ز چوویتە (دیمشق)، لە قوتابخانەی (دار الحديث) دەرسی داوە، شارەزا بووە لە زانستەکانی ئاینی و ئەقڵی، لە ١٠٤٨ك – ١٦٣٨ز کۆچی دوایی کرد، کتیبەکانی هەموو کردنە وەصیەت لەسەر قوتابیانی (دیمشق).

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١/ ١٧٥.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٥٥٥.

٣. تاريخ مشاهير كورد ١/ ١٨٥.

٤. خلاصة الأثر ٢/ ٧٨.

٥. معجم أعلام الكورد ٢٢٠.

## حەسەن محەممەد ئیبراهیم هەولێری (٣٧٣)

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیبراهیمی هەولێرییە، لە (دیمشق) دابەزیوە زانایەکی نەحو زان و شاعیر بووە، لە ڕێزمانی عەرەبی شارەزابووە، ساڵی ٦٦٩ك – ١٢٧٠ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٢١٤.

## حەسەن محەممەد بەرزنجی (٣٧٤)

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عەلی، کوڕی بابا ڕەسوڵی گڵەزەردەیە، لە گوندی (نۆدێ)ی شاربازێر هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای مەلا محەممەد وەسیم و مەلا جامی چۆڕی خوێندووە، تەریقەتی لە شێخ ئەحمەدی ئەحسائی لە (بەغدا) وەرگرتووە، لە

ڕێگای (شام) چوویتە سەفەری حەج، ساڵی ١١٧٢ك - ١٧٥٨ز کۆچی دوایی کردووە. ئەو کتێبانەی داناون: رسائل القلوب، إزالة الوهم والإلتباس وإزاحة الوسواس عن بعض الناس.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ١١٦.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٩ - ١٦٣.
٣. هدية العارفين ٥/ ٢٩٩.
٤. معجم المؤلفين ٣/ ٢٨٦ - ٢٩١.
٥. إيضاح المكنون ٣/٦٥.
٦. معجم أعلام الكورد ٢١٣.

## حەسەن محەممەد زێباری (٣٧٥)

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدە، عەشیرەتی (زێباری)یە، زانایەکی وردبین و زەین تیژ بووە، لە چەرخی دەی کۆچی ژیاوە، مامۆستا ئەبوبەکری (مصنف) (وضوح)ی شەرحی (محرر)ی لەسەر داوای ئەو زاتە داناوە. (زێباری) حاشیەی لەسەر شەرحی (رسالة الإستعارات)ی عیصامەدینی ئەسفەرائینی هەیە، نووسخەکی دەستنووسی (ئەحمەد مراد محەممەد شێرە الله)مان لە لایە، ساڵی ١١١٦ك - ١٧٠٤ز لە گوندی (سورداش)ی نووسیتەوە.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ١/ ١٩٠.

## حەسەن محەممەد عبدالرحمان هەولێری (٣٧٦)

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی عەلی، کوڕی بەرەکاتی، کوڕی ئەبوفەواریسی هەولێرییە، لە مانگی مەلوودی ساڵی ٥٠٨ك - ١١١٤ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، دەرسی فەرموودەی لە (میصر) داوە، زانایانی ئەو سەردەمی زۆر لە خزمەتیان خوێندووە، لەوانە: ئیسماعیل ئیبراهیم حاکم.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/٣٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٣.

## حەسەن محەممەد عوبەیدی ( ٣٧٧ )

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ڕەحیمە، لە دەوروبەری ساڵی ١٣٣٠ك - ١٩١٢ز لە گوندی (ئەبوعوبەیدە) هاتووتە دنیا، لەلایەن چەند مامۆستایان خوێندنەکەی بردەسەر، ئەمجا چووە لای مەلا بابا ڕەسولی مامۆستای خۆی یارمەتی دەدا لە دەرسدانەوە، دوای کۆچی دوایی بابارەسول مەلاحەسەن بووە جێگری،کاروباری قوتابخانەکە بەو سپێردرا، لەدەوروبەری ساڵی ١٣٧٠ك - ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا فی خدمة العلم والدين ١٦٩ - ١٧٠.

## حەسەن محەممەد گۆرانی ( ٣٧٨ )

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی ئیبراهیمە، نازناوی (ئەبو عەلی)یە، گۆرانی بووە، لە لای شێخ ئەبو حامیدی ئەسفەرائینی خوێندووە، لە (ئەهواز) کرایتە قازی، چەند ساڵ لەوێ دەرسی داوە، لە دەوری ساڵی ١٧٠٥ك چوویتە (دیمشق)، مامۆستا ئەبوبەکر مەلا جامی لە جێگای خۆی لە قوتابخانەی (سەلیمیە) داینا وە بە (مدرس)، ساڵی ١٠٧٨ك لە مزگەوتی (ئەمەوی) دەرسی داوە، مامۆستا زانایەکی شەرع زان و فەرموودەناس و بە دین و ڕوو لە خوا بووە، نوسخەکی قورئانی پیرۆزی بە دەستی خۆی نووسیتەوە، چەند کەرامەتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ١٠٧٨ك – ١٦٦٧ز لە (ئەدرنە) کۆچی دوایی کرد.

ئەو کتێبانەی داناون: شەرحی (بەهائییە) لە دیمشق داینا وە، تەفسیری سوڕەتی (مطففين)، شەرحی قەطر.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٣ – ١٥٥.

٢. تاریخ مشاهیر الکورد ٢٠٧/١ – ٢٠٨.

٣. خلاصة الأثر ٢/ ٦٣ – ٦٤.

٤. طبقات الفقهاء ١٠٩.

٥. معجم المؤلفین ٣/٢٧٤.

٦. معجم أعلام الكورد ٢١٤ – ٢١٥.

## حەسەن محەممەد كوردی (٣٧٩)

ناوی حەسەنە، كوڕی محەممەدی، كوڕی خلەی هەولێری یە، نازناوی (ئەبو عەلی)یە، ساڵی ٥٥٣ك خەریكی خوێندنی فەرمووده بوو، چوویتە (بەغدا) لەوێ نیشتەجێ بووه، مەزهەبی شافیعی بووه، زانایەكی شەرع زان بووه، قازی بەغدا حوسێن عەلی شارەزوری بە جێگری خۆی داناوه لە قازیاتی بەغدا، لە ٥٥٨ك – ١١٦٣ز لە بەغدا كۆچی دوایی كرد، لە گۆڕستانی (باب ئەبرەز) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەكان:

١. تاریخ أربیل ١/١٧٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٢٠٧.

## حەسەن محەممەد نابینا (٣٨٠)

ناوی حەسەنە، كوڕی محەممەدی، كوڕی ئەحمەدی، كوڕی نەجای هەولێری یە نازناوی عێزەدین بووه، ساڵی ٥٨٦ك – ١١٩٠ز لە شاری (نوصەیبین) هاتووتەدنیا، هەرچەندە لە چاوان نابینا بووه، بەڵام لە زانیاری عەربی و شیعر دەست درێژ بووه، لە شاری (دیمشق) دادەنیشت هاتوچۆی كەسی نەدەكرد، تەنیا خەریكی دەرس دانەوه بوو، ئیسلام و جولەكە و دیان و ئایینەكانی تر بێ جیاوازی لە لایان دەخوێند.

مامۆستا بیروڕای شیعەكانی لە مێشكی چەسپابوو، بۆیە بە ئاشكرایی دەنگی بەرز دەكردەوه بە گەورەیی ئیمامی عەلی لەسەر ئیمامی ئەبوبەكر (خوا لێیان رازی بێ)، هەروەها –وەكو ئەبو عەلای مەعیری– لە دینداری بە چاكە باسی ناكەن، هەندە شیعری

ناشرینی داناون، نووسینەوەیان بە باش نازانم، لە بەرواری ٦٦٠ك – ١٢٦١ز کۆچی دوایی کرد، لەو ڕۆژە داوای برنج بە شیری کرد، کە خواردی، ئایەتی ﴿ألا يعلم من خلق وهو اللطيف الخبير﴾ (الملك / ١٤) ی خوێندەوە یەکسەر گیانی دەرچوو.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٢/ ٢٣٢ – ٢٣٣.

٢. البداية والنهاية ١٣/ ٢٣٨ – ٢٣٩.

٣. شذرات الذهب ٥/ ٣٠١. بەڵام لەوێ بە حوسێن ناسراوە.

٤. فوات الوفيات ١/ ٣٦٢ – ٣٦٥.

٥. أربيل في مختلف العصور ٩٢.

٦. مشاهير الكورد ١٧٠.

٧. سير أعلام النبلاء ١٣/ ٣٩٨.

٨. بغية الوعاة ١/ ٥١٨.

٩. معجم أعلام الكورد ٢١٥.

## حەسەن محەممەد نەقشبەندی (٣٨١)

ناوی حەسەنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حەسەنی، کوڕی محەممەدی حیسامەدینی نەقشبەندی یە، لە (ئەستەمبۆڵ) دابەزیوە، شەرحی شەمائیلی تورمزی کردووە بە زمانی تورکی دەربارەی ڕەوشت و خوی پێغەمبەر (د.خ)، سەرەتایەکەی بە (الحمد لله حق حمده...) دەست پێ دەکات، ساڵی ١٢٨٢ك – ١٨٦٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٦.

٢. هدية العارفين ٥/ ٣٠٢.

٣. إيضاح المكنون ٢/ ٥٤.

٤. معجم أعلام الكورد ٢١٢.

٥. معجم المؤلفين ٣/ ٢٨١.

## حەسەن محەممەد نۆدەیی (٣٨٢)

ناوی حەسەنە، کوڕی شێخ محەممەدی نۆدەییە، ساڵی ١٠٨٦ك ـ١٦٧٥ز لە گوندی (نۆدێ) هاتووتە دنیا، زاتەکی هوشیار و پیرۆز بووە، لە تەفسیر و ئوصول و عەقائید و مەنتیق و شەریعەت و نەحو و صەرف شارەزا بووە، خەلیفەی شێخ عبداللهی (سوێرێ) بووە، دەرسی لە خزمەت شێخ محەممەد وەسیم و مەلا جامی و مەلا عبدالکریمی ئەبوبەکری (مصنف) خوێندووە، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بووە، بۆیە ناونراوە بە: (حافظ)، وە بە خەتی خۆی نووسیتییەوە، (شێخ حەسەن) سەفەری حەجی کرد، چووە زیارەتی مەدینەی پیرۆز، سەردانی (شام)ی کرد، لەگەڵ زانایەکانی ئەوێ کۆبۆوە، لە ١١٨٥ك – ١٧٧١ز کۆچی دوایی کرد، لەسەر چیای گڵەزەردە بورجی ئەستێرەناسی دروست کردبوو.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/١١٣.

٢. بنەماڵەی زانیاریان ٣٢٨ – ٣٣٠.

٣. تاريخ السليمانية ٢٤٥.

## حەسەن موسا بانەیی (٣٨٣)

ناوی حەسەنە، کوڕی موسایە، خەڵکی گوندی (زەربەنە) سەر بە (بانە)ی ئێرانە، مامۆستایەکی مەزنی کوردە، سۆفییەکی مەزهەب شافیعی بووە، چوویتە (شام) لە دیمشق دابەزیوە، لە قوتابخانەی (سولەیمانیە) دەرسی داوە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. الكتاب الأوضح في شرح التصريف العزي.

٢. شرح رسالة الشيخ رسلان.

٣. شرح مواقع النجوم للشيخ محي الدين.

٤. شرح الحكم للشيخ محي الدين.
٥. قواعد الإعلال: حاشيەيە لەسەر تەسريفي زەنجاني.
٦. حاشيە: لەسەر عەقائيدی قيرەواني.
٧. الرسالة الظرفية: محي الدين سولەيمان سوولی شەرحی کردووە، هەروەها مەحمود ئيبراهيم لە ١٢١٥ك شەرحی لەسەر نووسيوە.
٨. شەرحی عەواميلی جورجاني: سەرەتايەکەی بە (أما بعد، فيقول العبد الحقير المحتاج إلى ربه الغني: حسن بن موسى الزردبيني، لما لم يكن في النحو...) دەست پێ دەکات.

ساڵی ١١٤٨ك – ١٧٣٥ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناو عبدالرحمان لە مەودوا بە يارمەتی خوا باسی دەکەين.

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ٣/ ٢٩٧.
٢. سلك الدرر ٢/ ٣٥ – ٣٦.
٣. معجم أعلام الكورد ٢١٦.
٤. الأعلام ٢/ ٢٣٩ /٦/ ٧٥.

### حەسەن هيداية الله چۆڕی (ئەبوبەکری مصنف) (٣٨٤)

ناوی حەسەنە، ناسراوە بە محەممەد حەسەن، نازناوی (ئەبوبەکر)ە، ناودەبردێ بە (مصنف) کوڕی هداية الله، کوڕی سەيد بيدايەتی، کوڕی يوسف جانی، کوڕی يەعقوب جانە، لە نەتەوەی بايەزيد محەممەد زاهيدە کە ناوبراوە بە (پيرخدری شاهۆ) ساڵی ٩٠٩ك – ١٥٠٣ز هاتووتەدنيا.

زانايەکی پايەبەرز و بە توانا بووە، لە شەريعەت دەستی باڵا بووە، لە زانستی دەروونی و تەسەووف شارەزا بووە، زۆر بە دين بووە، لە دنيا خۆی تۆراندووە، ڕوو لە خوا بووە، دەڵێن: چەندجار بە خزمەت حەزرەتی خدری زيندە گەيشتيە، سەفەری کرديە

بۆ (میصر) و (حیجاز) ماوەك لە (مەدینە)ی پیرۆز مایەوە، پاشان گەڕایەوە (کوردستان)، ساڵی ٩٤٧ك لە قوتابخانەی (کابل) لە ئێران دەرسی داوە، هەروەها لە مزگەوتی (سۆر)ی (مەریوان) ماوەی هەژدە ساڵ دەرسی داوە، هەر لەوێ کتێبی (وضوح)ی دانا، ساڵی ٩٦٥ك – ١٥٥٧ز چووە گوندی (وشکین) ماوەك لەوێ بوو، باری کرد چووە (چۆڕ)، لەوێ ماوە تا ساڵی ١٠١٤ك – ١٦٠٥ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. وضوح: شەرحی (محرر)ی ئیمامی ڕافیعی یە، لە مەزهەبی شافیعی، چوار بەرگە، لە مزگەوتی (سۆر)ی مەریوانی نووسیوە، بە ڕاستی کتێبەکی نایاب و بە نرخە، لە شێوەی توحفة و نیهایة و موغنی موحتاجە، بەشێکی کۆپیمان لە لایە، لەسەر خەتی ئەحمەدی کوڕی حوسێن وەرگیراوە، ساڵی ١٠٦٤ك نووسیتییەوە.

٢. طبقات الشافعیة: مێژووە، ساڵی ١٣٥٦ك – ١٩٣٧ز لە بەغدا چاپ کرا.

٣. سراج الطریق: تەسەووفە، بە زمانی فارسی.

٤. ریاض الخلود: فارسی یە دەربارەی تەسەووف.

٥. ئافتاب: هۆنراوەیە، فارسی یە دەربارەی پاڕانەوە.

٦. رسالة الوضع.

٧. چەند شیعری کوردی: محەممەد عەلی قەرەداغی لە کەشکۆڵی ئەدەبی کوردی ٤/٥٩ – ٦٩ بەشێکی بەلاوکردیتەوە.

عبدالرحمان ناسری لە مەتحی مامۆستا دەڵێ:

بەهۆی موصەننیف لە خاکی چۆڕا    جەهل و نەزانی چاوەی هەلچۆڕا
گەلێك غافڵ بێ لە زانای وەك تۆ    لەبەر بێ ڕوشتی سەرمایەی دۆڕا

* * * *

زانای بەناوبانگ ئەبوبەکری چۆڕی    هەزار ڕەحمەتی هەق بێ لە گۆڕی
بە دەرس و تالیف نەشری عیلم و دین    ڕەنگ و ڕواڵەتی وڵاتی گۆڕی

کوڕەکانی:

١. محەمەد: باپیری سەیدەکانی چنارەی دەربەندیخان و سەیدەکانی کەسنەزانی لای (سەقز)ە.

٢. عبدالغفار: ساڵی ١٠٢٥ك – ١٦١٦ز لە (مەدینە)ی پیرۆز حاشیەی بەیزاوی و سەعدی چەلەبی و شەرحی گوڵستان و حافزی شیرازی نووسیەوە.

٣. عبدالکریم: لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٤. یوسف جان: إعلال التصریفي داناوە، سەرەتایەکەی بە (أما بعد: فما زال اشتغال المشتغلین علی) دەست پێ دەکات، هەروەها (مختصر تکملة التصریف)ی شێخ ئیبراهیمی شارانی هەیە.

٥. مەحمود جان، ئەویش کوڕێکی هەبووە ناو (جامی) ساڵی ١٠٥٨ك – ١٦٤٨ز لە شاری حەریر (چەغمینی) نووسیەوە، کوڕی ویش عبدالغفورە.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٢/٤٦ /٦/٩٧.
٢. کشف الظنون ٢/١٦١٣.
٣. طبقات الشافعیة / پێشەکی.
٤. الشیخ معروف النودهي ١٢ – ١٤.
٥. هدیة العارفین ٢/٢٦٠.
٦. مشاهیر الکورد ٨٢ – ٨٣.
٧. خلاصة الأثر ١/١١٠.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٠/١٥٦ – ١٥٩ – ٢١٥.
٩. معجم المؤلفین ٣/٧٧.
١٠. بنەماڵەی زانیاران ٤٩٦ – ٥٠١ – ٦٠٥ – ٦٠٧.
١١. معجم أعلام الکورد ٢٨.

١٢. ژیناوەری زانایانی کورد ٧٥ – ٨٤.

١٣. کۆنگرەی زانیارانی کورد ١٥٧ – ١٩٥.

١٤. کەشکوڵی کەلەپوری ئەدەبی کوردی ٤/ ٥٩ – ٦٩.

١٥. بوژاندنــەوە ١/٢٠٩ ، ٢١٥ ، ٣٤١، ٣٤٢ ، ٢/ ٢١١، ٢١٥ ، ٣/ ٢٠٤– ٢٠٩، ٤/ ٢٥٨ – ٢٥٩، ٥/ ٦٥، ٦/ ٣٤ – ٣٩.

## حوسێن ئیبراهیم هوزبانی (٢٨٥)

ناوی حوسێنە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی حوسێنە، عەشیرەتی (هوزبانی)یە، نازناوی ئەبو عبداللّٰهیە، ساڵی ٥٦٨ك – ١١٧٢ز لە (هەولێر) هاتووتە دنیا، زانایـەکی دیـاربووە، لە ڕێزمانی عەرەبی شارەزابووە، لەسەر مەزهەبی شـافیعی بـووە، لــە ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی سۆفییەکان لە (دیمشق) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. سیر أعلام النبلاء ١٣/ ٣٩٩.

٢. طبقات الشافعیة ١/ ١٤٣.

٣. بغیة الوعاة ١/٥٢٨.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٧١.

٥. الإكليل في محاسن أربیل ٨١ – ٨٢ – ١٣٦.

٦. مشاهیر الكورد ١٨١.

٧. شذرات الذهب ٥/ ٢٧٤ – ٢٧٥.

٨. معجم أعلام الكورد ٢٢٥.

## حوسێن ئەحمەد حوسێن جزیری (٢٨٦)

ناوی حوسـێنە، کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی حوسـێنی جزیـری یـە، لـە ٩٩٧ك – ١٥٨٨ز لە (حەلەب) هاتووتەدنیا، شاعیر و نووسەر بووە، دیوانی شـیعری هەیـە، باســی

باوك و باپیرانی دەکات، کە شێرانی ناو لانەی جزیرە بووینە، لە ١٠٣٣ك – ١٦٢٣ز لە (حەما) کۆچی دوایی کردییە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٢٢٥.

٢. مشاهير الكورد ١٨٠.

٣. إيضاح المكنون ١/٤٨٤.

٤. خلاصة الأثر ٢/ ٨١ – ٨٤.

٥. الأعلام ٢/١١٢.

## حوسێن ئەحمەد عبدالله جزیری (٣٨٧)

ناوی حوسێنە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عبداللّەی جزیرەی بۆتانە، مەزهەبی شافیعی بووە، ئەدیب و شاعیر بووە، لە ٤٤٤ك – ١٠٥٢ز کۆچی دوایی کردووە دیوانی شیعری هەیە (مصباح الزمان)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. ایضاح المكنون ٤/٤٩٢.

٢. هدية العارفين ٥/٣٠٩.

٣. معجم المؤلفين ٣/٣١٢.

## حوسێن ئەسپیندارەیی (٣٨٨)

مامۆستا حوسێنی ئەپسینداره، مەلایەکی چاك و زیرەك و بە دین بووە، ماوەك لە کوردستانی عێراقی خوێند، دوایی چووە (ئێران) ماوەکی لە (مەهاباد) خوێند، پاشان گەڕاوە (عێراق) چووە (ئەتروش) لای مەلا ئەحمەد ئەفەندی خوێند، تا کۆتایی پێ هێنا و ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا، لە (ئەسپیندارە)، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جیبەجیّ کردنی کاروباری ئاینی، چەندان مەلای پیّ گەیاندن، پیاوانی ئاینی تەریقەتی خۆش دەویستن، ساڵی ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد، لە گوندی (زاویتە)ی نزیك (دهۆك) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٢٥.

## حوسێن ئیسماعیل گۆڕەزی (٣٨٩)

ناوی حوسێنە، ناسراوە بە مەلا شێخ حوسێنی سورچی، خەڵکی گوندی (گۆڕەز)ە، لەو شوێنانە مەلا بووە و دەرسی فەقێیانی داوە: (بجیل) و (دۆبە) و (گەویلان) و (شەرەفۆنا) و (بەردین) و (سورسورە) و (باشوور) و (قەراسنج) و (بەرازان)، وە هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئیسماعیلی سوسەیی، مەلا مصطفای ئاشوکانی (مامم)، مەلا عبدالله ی بەحرکەیی (بابم)، مەلا محەممەدی باشوری، مەلا طاهای کۆڕیّ، مەلا یاسینی کوڕی، مەلا عبدالله ی بێراوەی.

کوڕەکانی: مامۆستا شێخ حوسێن دوو کوڕی هەبوون:

١. عبدالرحمان: ساڵی ١٩١٠ز هاتەدنیا.

٢. مەلا محەممەد نەزیر: ساڵی ١٩١٤ز هاتەدنیا، ئەویش چەند کوڕی هەنە، لەوانە یەکیان مەلایە، شێخ حوسێن بەناو باپیری کرایە.

سەرچاوە: نامەی مەلا حەیدەر ئافریانی سورچی.

## حوسێن بایەزید بەرزنجی (٣٩٠)

ناوی حوسێنە، کوڕی بایەزیدی، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی شێخ بابا رەسولە، لە دەوری ساڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز هاتووتەدنیا، زانایەکی مەزن بووە، لەبەر زیرەکی بە (ئەلمەعی) ناوبانگی دەرکردبوو، مامۆستا باپیرە گەورەی سەیدەکانی گوندی (خیوەتە)یە، نزیك (بازیان) چەند دانراوی هەیە، مەلایان بۆ شتی ئالۆز و عاسیّ هانایان دەبردە بەر ئەو، لە دەوروبەری ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٣ – ١٧٤.

## حوسێن پیرۆت پسکەندی (٣٩١)

ناوی حوسێنە، کوڕی پیرۆتی خەلیفەی کاك ئەحمەدی شێخە، ساڵی ١٢٨٢ك – ١٨٦٥ز لە گوندی (پسکەند) هاتووتەدنیا.

لە شاری (سلیمانی) دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە لای کاك ئەحمەدی شێخ بوو، پاشان لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی لە مزگەوتی نەقیب، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (سلێمانی) لە مزگەوتی (سەرشەقام) کرا (مدرس)، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، لەوانە شێخ عومەری قەرەداغی بوو (جمع الجوامع)ی لەلا دەخوێند، مامۆستا چەند حاشیەی هەنە لەسەر ئاداب و مەنتیق، دوا تەمەنی کرا (مدرس) لە مزگەوتی گەورەی (سلێمانی)، بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوە و کاروباری مەلایەتی، تا لە ٢٨ی مانگی ذي القعدەی ساڵی ١٣٦٧ك – ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالسلامی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٦٧ – ١٦٨.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٥٦ – ٤٥٨.

٣. أعلام كورد العراق ٢٥١ – ٢٥٢.

## حوسێن جەعفەر (سەلماسی) (٣٩٢)

ناوی حوسێنە، نازناوی ئەبوعبداللە یە، کوڕی جەعفەری کوڕی محەممەدی، کوڕی جەعفەری، کوڕی داودی کوڕی حەسەنە، خەڵکی (سەڵماسە)، دەرسی لە خزمەت دارەقوطني فەرموودەناس و چەند زانایانی تر خوێندووە، زاتەکی بڕواپێکراو و ڕوو لە چاکە بووە، دنیاداری نەکردووە، لە مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٤٤٦ك – ١٠٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٢/٧٠.

٢. الأنساب ٣/٢٩٨ – ٢٩٩.

## حوسێن حوزنی موکریانی (٣٩٣)

ناوی حوسێنە، کوڕی عبداللطیفە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی لەتیفە، نازناوی (حوزنی)یە، (بێژەن)و (داماو)یشی دەنوسی، ساڵی ١٣٠٤ك ـ ١٨٨٦ز لە (سابلاغ) هاتووتە دنیا، زمان زان و مێژووناس بووە، عەرەبی و تورکی و فارسی و ئەفغانی و هیندی و رووسی دەزانی، دەوری بیست کتێبی کوردی داناوە، جگە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان، لە ٢٠/٩/١٩٤٧ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٢٣٤.

٢. أعلام كورد العراق ٢٥٣ – ٢٥٨.

## حوسێن خضر (باغلوجە) (٣٩٤)

ناوی حوسێنە، کوڕی سەید خضرە، ساڵی ١٨٩٤ز هاتووتەدنیا، زانایەکی ناسراوبوو، زیرەك بوو، لە زانستەکان ئاگاداربوو، لەلای مەلا عبداللّٰهی وەلزی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای شێخ عومەری قەرەداغی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی وەرگرت، لە ناوچەی (بۆکان) و گوندەکانی (باغلوجە) و (کانیەڕەش) مەلا و (مدرس) بوو، دەرسی فەقێیانی دەدا، زمان ڕەوان بوو، لە کۆبوونەوان ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، ساڵی ١٩٤٦ز لە (باغلوجە) کۆچی دوایی کرد، نامیلکەکی دناوە لە بابەت (فەرائیز).

سەرچاوە: تاریخ فرهنگ وادب مکریان ٣٧٥ – ٣٧٦.

## حوسێن داود شارەزوری ( ٣٩٥ )

ناوی حوسێنە، کوڕی داودی، کوڕی حەسەنە، نازناوی (ئەبوعبداللە)یە، خەڵکی (شارەزور)ە، ساڵی ٦٨٤ك – ١٢٨٥ز ئیجازەی مەلایەتی بە ئیبن ڕەشید داوە لە شاری (دیمشق).

سەرچاوە: درة الحجال في أسماء الرجال ١/ ٢٤٣.

## حوسێن دەشتیوی ( ٣٩٦ )

مامۆستا حوسێنی دەشتیوی زانایەکی چاك و دڵپاك و ڕاستگۆ و ڕاست کردار و ڕەفتار بووە، دەوری ساڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز لە گوندی (دەشتیو)ی سەر بە قەزای (پشدەر) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن لە چەند قوتابخانان سوڕو گەڕی دا، دوایی چووە خزمەت مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) لە (بیارە) ماوەك مەنتیقی لە خزمەت خوێند، پاشان گەڕاوە ناوچەی خۆیان، کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، پێش نوێژ و ووتارخوێن بووە لە (پشدەر) و (ڕانیە) و (کۆیە)، دوایی هاتە شاری (سلێمانی)، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز و دەرسدانەوەی فەقێیان، ساڵی ١٤٠٠ك – ١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٨.

## حوسێن سەعد دیاربەکری ( ٣٩٧ )

ناوی حوسێنە، کوڕی سەعدی، کوڕی حوسێنی، کوڕی محەممەدی (ئامەدی)یە، لە (دیاربەکر) لە دایکبووە، ڕێزمان زان و شاعیر و نووسەر بووە، بۆ خوێندن چووە (بەغدا) پاشان چووە (شام) دوایی چووە (ئەصفەهان)، لەوێ ماوە، تا ساڵی ٤٤٤ك – ١٠٥٢ز کۆچی دوایی کرد، لەوێ بە خاك سپێردرا مامۆستا دانراوی زۆرن.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ١٠/ ٤.

٢. بغية الوعاة ١/ ٥٣٣.

٣. أنباء الرواة ١/٣٢٣.

٤. الأعلام ١/١٨ /٢/٢٥٧.

٥. معجم أعلام الكورد ٢٨٨.

## حوسێن سەعدی (مفسر) (٣٩٨)

ناوی حوسێنە، کوڕی شێخ سەعدی، کوڕی فەیزواللە یە، عەشیرەتی (بلّباسە) ساڵی ١٨٨٨ز هاتوتەدنیا.

خوێندنی: قۆناغەکانی خوێندنی لەم شوێنانە بردەسەر (کۆیە)، (خۆشناوەتی)، (سکتان)، پاشان هاتە مەدرەسەی قەڵات لە هەولێر، لە لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلا ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: ساڵی ١٩١٣ز بووە مەلا لە گوندی (قەپلان)، دوایی چووە (خورمەڵە)، ماوەك لە (سیاو) بوو، ماوەك لە (سوریژە)، ساڵی ١٩٣٠ چووە (دووگرتکان)، ساڵی ١٩٤٧ز دەشتی بەجێهێشت، هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی حاجی داود ئێستا ناسراوە بە: (مزگەوتی بازاڕ) بووە مەلا، دوایی چووە مزگەوتی حاجی مەولوود ناسراوە بە: (مزگەوتی ناونەجاڕان)، ساڵی ١٩٧١ز خانەنشین کرا، لە ١١/١٢/١٩٨٣ کۆچی دوایی کرد.

بەرهەمەکانی:

١. ژیانی ئینسان تەفسیری قورئان، ساڵی ١٩٣٠ز تەواوی کردووە.
٢. تەرجومەی قەسیدەی بوردییە بە کوردی، لە ١٩٤٤ز چاپ کرا.
٣. تەرجومەی بەشێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) لە ١٩٤٩ز تەواوی کرد.
٤. حقائق الخيام: شەرحی چوارینەکانی عومەر خیامە بە عەرەبی.
٥. هۆنراوەی کڕین و فرۆتن لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی.
٦. هۆنراوەی (تهذيب المنطق).
٧. شەرحی (ذات الشفا) بە کوردی.

٨. تەرجومەی (لوائح) لە فارسی بۆ کوردی.
٩. منهج الحقیقة.
١٠. البلاغة.

کوڕەکانی: (بەشیر) ئەفەندی: پارێزەرە چەند کتێبانی باوکی لە چاپداوە، (مەلا طاهیر): ماوەك مەلا بوو لە (پەریتان) ئێستا لە ماڵەوە نەخۆشە.

سەرچاوە: ژیانی ئینسان تەفسیری قورئان / پێشەکی.

## حوسێن شەروین جەلالی (٣٩٩)

ناوی حوسێنە، کوڕی شەروینی، کوڕی ئەبوبیشری جەلالی یە، زانایەکی شەرع زان بووە لە مەزهەبی شافیعی، لە (موصل) و (حەلەب) دەرسی داوە، زۆر زیرەك و زەین تیژ بووە، فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) لە چەند مامۆستایان وەرگرتووە، یاقووت حەمەوی دەڵێ: {ئەو زاتە برادەری خۆم بوو، خەڵکی گوندی (باکلبا)یە سەر بە هەولێر، جەلالی عەشیرەتەکن لە کوردان}، منیش ئەو گوندەم نەبیستووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ١/٣٢٨.
٢. معجم أعلام الکورد ٢٢٩.

## حوسێن عبالرحمان نوربەخش (٤٠٠)

ناو و نژادی: ناوی حوسێنە، کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی خەلیفە مەلا حەسەنی، کوڕی مەلا عبداللهی، کوڕی مەلا سەعدی، کوڕی مەلا موسا گچکە، کوڕی مەلا موسای گەورە، کوڕی مەلا ئیبراهیمی قازی، کوڕی مەلا جامی، کوڕی شێخ عبدالکریمی، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ مەلا مەحمودی، کوڕی نوربەخشی، کوڕی مەلا محەممەدە، ساڵی ١٣٣٣ك - ١٩١٤ز لە گوندی (شەمۆلە)ی سەر بە (سەردەشت) هاتووتە ژیان.

خوێندنی: لە تەمەنی دە ساڵیدا لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٣٤٧ك - ١٩٢٨ز چووە (سەرا)ی (بۆکان)، لەوێ چووە (مەولا ئاوا)ی (سەقز) لای

مەلا صالحی سەرتەکەلتوویی، لەوێ چووە (خوردەلووك)، دوایی چووە (سەقز) دووبارە گەڕاوە (سەرا)، دوایی گەڕاوە (شەمۆلە) لەوێ چووە (سووتوو)، لە ١٣٤٨ك – ١٩٢٩ز چووە (بانە)، ئەمجارە چووە (دەلوجە)ی (قەرەداغ)، ساڵەك لەوێ ماوە هاتە (قەرەداغ)، گەڕاوە (شەمۆلە)، لەوێ چووە (سیسێری) لای قازی عەلی، ساڵی ١٣٥٠ك – ١٩٣١ز چووە (قالۆ)ی سابلاغ دوو ساڵ لەوێ بوو، چووە (بیۆر)ی سەرەوە، لای کاکە مەلای موفتی، ساڵەك ماوە، چووە (هێرۆ)، پاش ساڵەك گەڕاوە (بیۆرێ)، لەوێ بە ڕێگای (بێژوە) چووە (سلێمانی)، لەوێ چووە (قزل رباط)، پاشان گەڕاوە (سلێمانی)، لەوێ ڕۆیشت بۆ (پێنجوین)، لەوێ بۆ گوندی (کیلو)، دوایی چووە (نزارە)، گەڕاوە (شەمۆلە)، گەڕاوە (نزار)، گەڕاوە (سەرا) لای مەلا عیصامەدینی شەفیعی (جمع الجوامع) و (تهذیب) و (مقولات العشرة) و (تشریح)ی خوێند، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: ساڵی ١٩٥١ز بووە مەلا، لە گوندی (قالوێ)، لەوێ باری کرد بۆ (سووتوو)، ساڵی ١٩٥٢ز چووە (هەنداو)، ماوەکی زۆر لەوێ خەریکی مەلایەتی و دەرسدانەوە بوو، ساڵی ١٩٩٢ز چووە مزگەوتی ڕۆستەم بەگ لە (سابلاغ).

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٨٠ – ٢٨٣

## حوسێن عبدالله حوسێن ئورمەوی (٤٠١)

ناوی حوسێنە، کوڕی عبداللەی، کوڕی حوسێنی، کوڕی محەممەدی، کوڕی حوسێنی، کوڕی محەممەدی، کوڕی شووەیخە، خەڵکی (ئورمیە – ورمێ) یە، دەرسی لە (بەغدا) و (بەصرە)ی خوێندووە، چوویتە (میصر) لەوێ نیشتەجێ بووە، هەر لەوێ دەرسی فەرموودەی داوە، ساڵی ٤٦٠ك – ١٠٦٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/٤٤ – ٤٥.
٢. الأنساب ١/١١٨.
٣. معجم البلدان ١/١٥٩.

## حوسێن عبداللە محەممەد پشدەری (٤٠٢)

ناوی حوسێنە، کوڕی مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا محەممەدی، کوڕی خضرە. عەشیرەتی (نورەدینی)یە، ساڵی ١٨١١ز لە گوندی (نورەدین) نزیك (قەڵادزێ) هاتووتەدنیا، ماوەك لە کوردستانی خوێند، پاشان بۆ پەرەپێدانی زانیاری ڕووی کردە شاری (بەغدا) لای محەممەد فەیزی زەهاوی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

ئەمجا مامۆستا زەهاوی کردیە (مدرس) لە قوتابخانەی ئیمامی ئەعزەم، لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ناوبانگی مەلا چاکی ڕۆیشت، فەقێیان لە دووررا دەهاتنە لای، بەردەوام بوو لەسەر ئەو وەزعە، تا پیربوو شنگ و هێزی نەما، کوڕەکەی خۆی لە جیاتی خۆی دانا.

ناوبراو ناسرابوو بە مەلایەکی چاك و زیرەك، مەلایە باشەکانی بەغدا لەو سەردەمی لە سەردەستی ئەو دەرچوون، ئیجازەی پێدەدان، دەستێکی باڵای هەبوو لە زانستەکانی سەرەوە بۆ خوێندنی باڵای مەلایان، بە تایبەتی لە ئەستێرەناسی و (فەلەکیات).

بەشێك لەوانەی ئیجازەی پێداون: عبدالحمید عیرفانی کانی مشکانی (سنە)یی، عبدالمجید شێخ طاها شێخ مەحمود (سنە)یی، نەعمان ئەحمەد ئەفەندی ساڵی ١٢٩٥ك ئیجازەی وەرگرت.

کۆچی دوایی: لە (٣)ی شەشەرانی ساڵی ١٣٢٢ك – ١٩٠٥ز کۆچی دوایی کرد، مەلا مەعروف کوڕی جێگری بوو: لە ١٨٥٨ز لە (بەغدا) لە دایك بووە، لە پاش باوکی لە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم دەرسی داوە، لە ١٩٢٦ز کۆچی دوایی کرد، دوای وی مەلا نامیقی کوڕی: ئەویش لە ١٩٣١ز کۆچی دوایی کرد، دوای ویش مەلا نەصرەتی کوڕی.

دانراوەکانی مامۆستا حوسێن:

١. شەرحی (تشریح الأفلاك) نوسخەکی دەستخەتی باوکم ساڵی ١٩٣٥ز لە لامانە، بە داخەوە ئەو کتێبە نایابە بێ وێنە، دانراوی ئەو زانایە مەزنە کوردە، تا ئێستا کەسێکی ئازا و خێرخوازی لێ هەڵنەکەوتووە چاپی بکا.

٢. المباحث الشريفة في مناقب الإمام أبي حنيفة، ساڵی ١٢٧٥ك لە هۆدەی مەرقەدی ئیمامی ئەعزەم تەواوی کردووە.

٣. التحفة البهية في تفسير بعض الآيات.

٤. رسالة في الحساب.

٥. رسالة في الوضع.

٦. رسالة في المنطق.

٧. رسالة في العروض.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/ ٣٣٦- ٣٤٠.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٥ - ١٧٦.

٣. عنوان المجد ١٥٠.

٤. أربيل في مختلف العصور ١٣٥.

٥. نثر الجواهر والدرر ١/٣٧٣.

٦. تاريخ مشاهير كورد ٢/٨٧.

٧. گۆڤاری ستاندەر، ژمارە ١٩ - ٢٠، ٢٠٠٧ز

## حوسێن عبدالعزیز بروجردی (٤٠٣)

ناوی حوسێنە، کوڕی عبدالعزیزی، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (بروجرد)ە، لە ڕۆژهەڵاتی کەرمانشا، زانایەکی شەرع زان بووە، دۆستی هەژاران بووە، خێرخواز بووە، خراپەی قەدەغە کردووە، یەك بووە لە قوتابیانی شێخ ئەبوئیسحاقی شیرازی، دەرسی فەرموودەی داوە، ساڵی ٤٩٦ یا ٤٩٧ك دیواری بە سەردا ڕووخا، لە ئەنجامدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٣.

## حوسێن عەلی ئۆمەربلی (٤٠٤)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی یە، عەشیرەتی (ئۆمەربلـە)، لـە حوکمڕانی سولّتان عبدالحمیدی عوسمانی مامۆستا لە قەزای (ئامێدی) دەرسی داوە، کتێبی (المصغر)ی داناوە: هۆنراوەی توحفەی ئیبن حەجەرە بە کورتی، بەرگی یەکەمی لە لای سەیدا حەمدی سەلەفی یە، لە (سەرسەنگ) سەرەتایەکەی دەڵێ:

قال مصغر السمي بالحسين — في رسن الغيبة من بين الوطن
وقد أسمي ما أزيد خاتمة — أو بمهمة، أو المقدمة
وما وجدت دون تحفة السري — أعني بذاك أحمد بن حجر

هۆنراوەی تری هەیە بەناوی (تبر النضر) لە پەراوێزی کتێبی سەرەوەی نووسیتەوە، لە سەرەتایەکەی دەڵێ:

قال محمداً حسين بن العلي — الملقب المشهور بالعمربل
وبعد حمد الله والصلاة — لما نظرت في مؤلفاتي
ماكان لي في الشرع نثر بل ولا — نظم، وان في النحو كل حصلا
من ثمة ذهني ساقني لأنظما — مختصراً معتبراً منتظماً
حتى يكون نافعا في الأجل — لي ولمن أراده في العاجل
نظمته سميت: (تبر النضر) — لكونه من خلص ابن حجر

سەرچاوە: بلاوکراوەکانی سەیدا حەمدی سەلەفی.

## حوسێن عەلی تەفلیسی (٤٠٥)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی یە، خەڵکی (تەفلیس)ە، زانایەکی فەرائیز زان بووە، مامۆستا عبدالکریم سەمعانی دەڵێ: {عەلی کوڕی عبداللهی ئەنطاکی، لە شاری (حەلەب) دەرسی لە لای ئەو زانایە خوێندووە، منیش لەو ڕێگایە زانیاریم وەرگرتووە}، پاش ساڵی ٤٨٤ك - ١٠٩١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ١/٤٩٤.

### حوسێن عەلی حصکەفی (٤٠٦)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی یە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە ٩٣٢ك – ١٥٢٥ز هاتووتەدنیا، زانایەکی زیرەك و بە توانا بووە، نووسەر و شاعیر بووە، لە تەمەنی چواردە ساڵیدا (تەصریفی عیززی) کردیتە هۆنراوە، زانایانی ئەو سەردەمی پەسەندیان کردووە، لە ١٠٧١ك – ١٦٦٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/٣٥٩.

٢. معجم المؤلفين ٤/٣١.

٣. کشف الظنون ١/٣٤.

### حوسێن عەلی دیاربەکری (٤٠٧)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی، کوڕی عبداللهی (دیاربەکری)یە، نازناوی (ئەبوعبدالله)یە، لە زانیاری نەحو شارەزا بووە، ساڵی ٤٦٦ك – ١٠٧٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: بغية الوعاة ١/٥٦٣.

### حوسێن عەلی شارەزوری (٤٠٨)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی، کوڕی قاسمی شارەزوری یە، نازناوی (ئەبوعبدالله)یە، لە (موصل) هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) کرایتە قازی، هەر لەوێ دەرسی فەرموودەی داوە، لە ٥٥٧ك – ١١٦٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٦.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٩٠.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٠.

## حوسێن عەلی قزلجی (٤٠٩)

ناوی حوسێنە، کوڕی عـەلی، کـوڕی محەممـەدی قزلجـی یـە، سـالّی ١٢٧٨ك – ١٨٦١ز هاتووتەدنیا، زانایەکی مەزن و زیرەك و بە توانا بووە، پاش باوکی دەرسـی داوە، سالّی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز کۆچی دوایی کردووە،

ئەو کتێبانەی داناون: مصطلحات علم الحديث، کتاب في علـم النحـو، کتـاب في الحكمة والهيئة.

سەرچاوە: تاريخ مشاهير كورد ٢/١٤٦ – ١٤٧.

## حوسێن عەلی یەزدانیار (٤١٠)

ناوی حوسێنە، کوڕی عەلی، کوڕی یەزدانیارە، خەلّکی (ورمێ)یـە، زانایـەکی بـە دەستەلاّت بووە، لە تەسەووف شارەزابووە، زانیاری لە بابەت کڕین و فرۆتن بەهێز بووە، نارِەزایی دەربڕیوە بەرانبەر هەندە قسەی شێخەکانی عێراق.

سەرچاوە: طبقات الصوفية ٤٠٦.

## حوسێن عومەر ناجی (٤١١)

ناوی حوسێنە، کوڕی عومەرە، نازناوی (ناجی)یە، زانایەکی مەزن بووە، سـەفەری کرد بۆ (بروسە)، لەوێ کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی سولّتان (ئۆرخان)، مامۆسـتا قورئـانی پیرۆزی هەموو لەبەر بوو، شاعیر و هۆشیار بوو، سالّی ١٠٦٧ك – ١٦٥٦ز لە (بروسە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: مشاهير الكورد ١٨٢.

## حوسێن عومەر نەصیبـی (٤١٢)

ناوی حوسێنە، نازناوی بەدرەدینە، کـوڕی عومـەری، کـوڕی محەممـەدە، خـەلّکی (نوصەیبینە)، مەزهەبی شافیعی بووە، نەحو و صەرِفی لە لایەن مەلا موسا عیوەضـی کوردی و چەند زانایانی تر خوێندووە، پاشان چووە شاری (حەما)، لـەوێ کچـی شـێخ عـەلوانی

مامۆستای هێنا، زانایەکی هۆشیار و شاعیر بووە، ساڵی ١٠٠٠ك – ١٥٩١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٤٤٢.

## حوسێن کونەمشکەیی (٤١٣)

مامۆستا حوسێن ساڵی ١٩١٦ز لە گوندی کونەمشکی (سەردەشت) هاتووتەدنیا، بە گەورەیی لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا دەستی کرد بە خوێندن، لە گوندانی (باساوە) و (لێو) و (شوێ) گەڕا بۆ خوێندن، هەروەها لە شارانی (سەردەشت) و (بانە) و (سابڵاغ) لە خزمەت ئەو بەڕێزانەی خوێند: مەلا عبدالرحمانی سیسێری، مەلا مصطەفای شوێ، مەلا ئەحمەدی باساوێ، مەلا محەممەدی باساوێ، قازی عەلی سەردەشت، ئەمجا هاتە (هەولێر) لە خزمەت مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) لە گوندانی (کونەمشك) و (کوربنا) و (بێور)ی خوارێ مەلا بوو دەرسی دەداوە، ساڵی ١٩٩٠ز لە (بێورێ) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (قەمتەرێ)ی کونەمشك بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٨٤ – ٢٨٥.

## حوسێن مەجدی مەهابادی (٤١٤)

زانای نوکتەزان و، مەجلیس ئاوەدان و، قسەخۆش و، شارەزا لە تەفسیر و کەلام و مەنتیق و فەلسەفە، مامۆستا مەجدی ساڵی ١٢٦٥ك – ١٨٤٨ز هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، پاشان بۆ پەرەدان بە خوێندنی، چووە لای مەلا چاکی ئەو سەردەمی مەلا عبدالرحمانی نەوەی مەلا محەممەدی (پایێ) لە (مەهاباد)، مامۆستا مەجدی زۆربەی قورئانی پیرۆزی بە تەفسیرەوە لەبەر بوو، بە درێژایی تەمەنی دەرسی ئاینی لە مەدرەسەی سۆری (مەهاباد) دەداوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالکریم کەندی، مەلا صاڵح ڕەحیمی نەغەدەیی، مەلا سەعید ئیبراهیم محەممەدی.

ساڵی ١٣٥٠ ك – ١٩٣١ز کۆچی دوایی کرد، هۆنراوەی (سبزواری) تەرجومە کردووە بە فارسی، هەروەها شەرحی لەسەر نووسیوە، دوو کوڕی هەبووە، دکتۆر محەممەد مەجدی و، حەسەن مەجدی.

سەرچاوە: ژیناوەری زانایانی کورد ٨٥٥ – ٨٥٧.

## حوسێن محەممەد ئاشۆکانی (٤١٥)

ناو و نژادی: ناوی حوسێنە، کوڕی فەقێ محەممەدە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عەزیزی، کوڕی رەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ئەحمەدی باپیری ناسراوە بە (ئەحمەد چاورەش) سەر لقەك بووە لە لەشکری محەممەد پاشای (ڕواندزی)، بۆیە بەشێك زەوی پێ بەخشیوە لە گوندی (ڕەشوان) پاشان باری کرد، هاتە (ئاشۆکان) بۆیە ئەو بنەماڵە ناودەبردرێن بە (ئاشۆکانی).

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی لە خزمەت باوکی خوێند، پاشان بە شێوەی فەقێیانی کوردستان لە چەند شوێنان گەڕا، تا کۆتایی بە خوێندن هێنا.

مەلایەتی: ئەمجا بووە مەلا لە گوندی (گردارەق)، ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی باری کرد بۆ (پەرپیتان) ماوەکیش لەوێ بوو، باری کرد بۆ (جدیدە)ی بەرانیان، لەوێش ڕۆیشت بۆ (جێژنیکان)ی ئەبابەکر، لەوێش چووە (دارەبەن)، هەروەها ماوەکیش لە (بیرێژ) مەلا بوو، ماوەکیش لە (شاوێس)، سوپاس بۆ خودا لە زۆربەی شوێنەکانی فەقێی هەبوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا مصطەفای برازای و مەلا عبداللەی برازای و مەلا محەممەد ئەمینی برازای و مەلا عبدالعزیزی برازای و مەلا ئیسماعیلی سوسەیی و مەلا عەلی پەرپیتانی و مەلا عەلی پیرباری نەنۆش و مەلا ئەحمەد سۆفی وسوو بەحرکەیی.

خوورەوشتی: زاتێکی چاکەخواز و خێرخواز بوو، دەروون و ئەندام پاك بوو دەنگی خۆش بوو، بەشێکی قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو، لە کۆبوونەوانی ئاینی بە ئاوازی بەرز

دەیخوێند، ساڵی ١٩١٢ز لە (غەزا)ی رواندز بەشداربوو، سەربازەك بوو لە سەربازەکانی صیدقی ئەفەندی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٣٨ز لە (دارەبەن) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی نێوان دارەبەن و ئاشۆکان بە خاك سپێردرا، مامۆستا مامی باوکی نووسەری ئەو مێژووەیە، پاش کۆچی دوایی تەنیا دوو کچی لە پاش بەجێما: یەکەم: نەفیسە، خێزانی مەلا مەسعود مەلا ئەحمەد ئاشۆکانی بوو، دووەم: کەلثوم، خێزانی مەلا خدری شەمامەری بوو.

سەرچاوەکان:

١. الأكليل في محاسن أربيل ٣٠٥ – ٣٠٦.

٢. گۆڤاری هەولێر ١٥٩.

## حوسێن محەممەد حەڕانی (٤١٦)

ناوی حوسێنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی مەودودی، کوڕی حەمادەیە، نازناوی (ئەبوعروبە)یە، خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٢٢٠ك – ٨٣٥ز هاتووتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس بووە، کتێبانی (الأمالي) و (تاريخ الجزيرتين)ی داناوە، ساڵی ٣١٦ك – ٩٢٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. سير أعلام النبلاء ٩/٢٩٦.

٢. كشف الظنون ١/١٦٣.

٣. إيضاح المكنون ١/١٢٤ – ٢١٤.

٤. هدية العارفين ١/٣٠٥.

٥. معجم المؤلفين ٤/٦٠.

٦. معجم أعلام الكورد ٢٣٠.

## حوسێن محەممەد دیاربەکری (٤١٧)

ناوی حوسێنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حوسێنە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، زانایەکی بەرز بووە، لە مەزهەبی مالیکی شارەزابووە، لە شاری (مەککە)ی پیرۆز کرایتە قازی.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: أهبة الناسك والحاج لانتفاعه بها لدى الإحتياج، تأريخ الخميس في أحوال أنفس نفيس: ژیاننامەی پێغەمبەرە (د.خ) تا سوڵتان مرادی سێیەم، لە ٨ی شەعبانی ساڵی ٩٤٠ك – ١٥٣٤ز داینــاوە، ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز لە میصر چاپ کرا، پاشان دووبارە لە (بێروت) چاپ کراوە، ساڵی ٩٦٦ك – ١٥٥٨ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ٢/٢٨٠ – ٢٨١.

٢. هدية العارفين ١/٣١٩.

٣. معجم المؤلفين ٤/٤٧.

٤. كشف الظنون ١/٢٠٣.

٥. معجم أعلام الكورد ٢٣٠.

## حوسێن محەممەد قولتەپەیی (٤١٨)

ناوی حوسێنە، کوڕی سەید محەممەد ئەمینە، خەڵکی (قولتەپە)ی سەر بە ناحیەی (قوشتەپە)یە، لە گوندی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دالداغان)، پاشان چووە (بەردەسپی) لای مەلا سەعیدی (ئاوماری).

هەروەها لای مامۆستا شەریف و مامۆستا طەیبی دووشیوانی خوێند، ماوەکیش لای مامۆستا محەممەدئەمینی سوێری بوو، ئەمجا چووە (کەرکوك) لای مەلا عومەری ئۆمەرگومبەتی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بووە مەلا لە (بیرەعارەبان)، دوایی باری کرد بۆ (قەرەدەرە)، لەوێ فەقێ هەبوون، پاشان هاتە (هەولێر)، دوایی

لەسەر داوای خەڵکەکە چووە (دوبز) پێش نوێژ و دەرس بێژ و ووتارخوێن بوو تا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٣٥٩ – ٣٦٠.

## حوسێن محەممەد گردعازەبانی (٤١٩)

ناوی حوسێنە، کوڕی محەممەدی، کوڕی داود ئاغایە، عەشیرەتی (شوان)ە، مەلا ئیسماعیلی برای لە (گردعازەبان) باری کرد بۆ گوندی (کۆڕێ)ی خۆشناوەتی، مامۆستا حوسێن لە جێگای ئەو لە (گردعازەبان) بووە مەلا، خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بوو، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی هەبوون، لەوانە مەلا ئەحمەد بووە جێگری باوکی: لە پێشدا بە تایبەت باسمان کرد.

سەرچاوە: الإکلیل في محاس أربیل ٣١٥.

## حوسێن مەحمود نەقیب (٤٢٠)

ناوی حوسێنە، کوڕی شێخ مەحمودی نەقیبە، ساڵی ١٢٢٥ك – ١٨١٠ز هاتووتەدنیا، یەکە لە پیاوماقوڵانی شاری (سلێمانی)، لە خزمەت شێخ مەعروفی نۆدەیی – کە دەکاتە باوکی دایکی – خوێندنی بردە سەر، زانایەکی زیرەك و لێهاتوو بوو، زمان ڕەوان و قەڵەم لە کار بوو، بە کوردی و عەرەبی و فارسی شیعری هەیە، لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخی خاڵی چووە (بەغدا)، مێوانی مامۆستا محەممەد فەیزی زەهاوی بوو، لەوێ عبدالباقی عومەری موسڵی پێشوازی لێ کردن، لە ساڵی ١٢٩٢ك – ١٨٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

ئەو کتێبانەی داناون: سراج السالکین: فارسی یە، مەولودنامە: بە کوردی، هۆنراوەی شێخی صەنعان و تەرسا: بە فارسی، هۆنراوەی مەجنون و لەیلا: بە عەرەبی.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٧٤ – ١٧٥.

٢. معجم المؤلفین ٤/٦١.

٣. تاريخ السليمانية ٢٤٦.

## حوسێن محیەدین مەریوانی (٤٢١)

ناوی حوسێنە، کوڕی سەید محیەدینە، ساڵی ١٨٨١ز لە (مەریوان) هاتووتەدنیا، لە تەمەنی حەوت ساڵی دا دەستی بە خوێندنی قورئانی پیرۆز کرد، چەند کتێبی سەرەتایی خوێند، ساڵی ١٩٠٤ز ئێرانی بە جێهێشت چووە (تەوێڵە)، ساڵی ١٩٠٦ز چووە (بیارە)، دوایی چووە (هەڵەبجە)، پاشان چووە (سلێمانی)، ماوەك لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی و ماوەك لە مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ ماوە، پاشان چووە (کەرکوك) لە خانەقای سەید ئەحمەد لای مامۆستا مەلا ئەحمەدی مەلا حەکیمی خوێند، ساڵی ١٩١٥ز هاتە لای مەلا ئەفەندی (هەولیر)، کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی لە مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا بووە مەلا لە مزگەوتی (یەگەن) لە گەڕەکی (سەرا) لە قەلآت ماوەك لەوێ دەرسی داوە، دوایی بووە مەلا لە مزگەوتی حاجی صالح دەباغ لە ٣/١/١٩٨٥ کۆچی دوایی کرد، گۆڕەکەی لە پشت مزگەوتە، سەید محیەدینی کوڕی: لە ١٩٢٠ز لە دایك بووە، لە هە ولێر و بەغدا و سلێمانی خوێندووە، لە ١٩٥١ز کرا مەلا لە مزگەوتی شێخ مەعروف لە (بەغدا)، پاشان ماوەی بیست ساڵان پێش نوێژی سوپا بوو، چەند پارچە شیعر و کتێبی چاپ کراوی هەیە.

سەرچاوە: هەولێرم وادیوە ١٠٤، ١٧٤، ١٧٧.

## حوسێن مصطفی زێباری (٤٢٢)

ناوی حوسێنە، کوڕی مصطەفای، کوڕی حەسەنە، عەشیرەتی (زێباری)یە، ساڵی ١٠٩٤ك - ١٦٨٣ز هاتووتەدنیا، زانایەکی مەزن بووە، ماوەی پەنجا ساڵ لە قوتابخانەی شەعبانیە لە (حەلەب) دەرسی داوە، شاعیرەکی چاك بووە، ساڵی ١١٧٣ك - ١٧٥٩ز لە (حەلەب) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٢/٦٠.

٢. معجم أعلام الكورد ٢٣١.

## حوسێن موسا دینەوەری (٤٢٣)

ناوی حوسێنە، ناسراوە بە (جەلیس) نازناوی ئەبوعبدالله یە، کوڕی موسای کوڕی هبة الله یە، خەڵکی (دینەوەر)ە، زانایەکی ڕێزمان زان و نەحو زان بووە، لە دەوروبەری ساڵی ٤٩٠ك کۆچی دوایی کرد، کتێبانی (ثمار الصناعة) و (الحروف السبعة)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ١/٥٢٣.

٢. هدية العارفين ١/٣١٠ – ٣١١.

٣. معجم المؤلفين ٤/٦٥. بەڵام بۆ کۆچی دوایی ساڵی ٣٤٠ك – ٩٥١ز داناوە.

## حوسێن یوسف ئەخلاطی (٤٢٤)

ناوی حوسێنە، کوڕی یوسفی، کوڕی عەلی یە، ساڵی ٧٩٥ك – ١٣٩٤ز هاتووتەدنیا، لە هەموو جۆرە زانستەکان سەرکەوتوو بووە، لە (جزیرە) کرایتە قازی و (مدرس) پاشان چوویتە (قاهیرە)، دوایی چوویتە (شام)، لەوێ چووە (حەج)، ماوە لەوێ تا ساڵی ٨٥٨ك – ١٤٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شەرەفنامە / پەراوێز ٥٨٩.

٢. مشاهير الكورد وكوردستان ١٧٥.

## حوسێن یوسف ئەرزرۆمي (٤٢٥)

ناوی حوسێنە، کوڕی یوسفە، خەڵکی (ئەرضرۆم)ە لە کوردستانی تورکیا، کتێبی (الرسالة المنجية من الخطأ الواقع بين الفرقة الناجية)ی داناوە، ساڵی ١١٥٩ك – ١٧٤٦ز تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:
١. هدية العارفين ١/٣٢٥.
٢. إيضاح المكنون ١/٥٧٠.
٣. معجم المؤلفين ٤/٦٨.

## حوسێن یوسف حصکەفی (٤٢٦)

ناوی حوسێنە، کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی حوسێنی کوڕی ئیسماعیلە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، لە مانگی شەوالی ساڵی ٧٣٤ك - ١٣٣٤ز لە (مەککە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای عیزی کوڕی جەماعە و چەندانی تر خوێندووە، لە بەیتی خوا بە دەنگی خۆش بانگی دەدا، سەرپەرشتی دەرسدانەوەی دەکرد، سەفەری (میصر) و (شام)ی کردووە، ساڵی ٨٠١ك - ١٣٩٨ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، (برادەرەکی) لە خەودا دیتی پرسیاری لێ کرد، ئەویش بەم شێوەیە وەلامی داوە:

- خوای گەورە چی لێ کردی؟
+ لێم خۆش بوو بە بەهەشتی شادمان کردم.
- خۆڵەکەی چی یە؟
+ میسکە.
- گیاکەی چی یە؟
+ زەعفەرانە.
- برادەرەکە دەڵێ: {منیش میسکەکەم بۆن کرد، لە زەعفیرانەکەش نەختێکم بەسەردا کەوت}.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٣/١٤٣.

## حەماد هبة الله حەڕانی (٤٢٧)

ناوی حەممادە، کوڕی هبةاللەی، کوڕی حەممادی، کوڕی فەضلە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە مانگی مەولودی ساڵی ٥١١ك - ١١١٧ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، زانایەکی مێژووناس و فەرموودەناس بووە، مێژووی حەڕانی نووسیوە، هەروەها بازرگانیشی کردووە، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا)، دوایی چوویتە (میصر) بە (ئەسکەندەرییە)دا چووە، سەفەری بۆ (هەرات) کردووە، دەرسی داوە، شیعری داناوە، لە ڕۆژی چوار شەممەی مانگی ذي الحجەی ساڵی ٥٩٨ك - ١٢٠٢ز لە (حەڕان) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/٤٣٤ - ٤٣٥

٢. الأعلام ٢/١٨٢.

٣. سير أعلام النبلاء ١٢/٥٢٧.

٤. شذرات الذهب ٤/٣٣٥.

٥. معجم المؤلفين ٤/٧٣.

٦. معجم أعلام الكورد ٢٤٠.

## حەمەد ئەحمەد حەڕانی (٤٢٨)

ناوی حەمەدە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی محەممەدی، کوڕی صەدیقە، ساڵی ٥٥٣ك - ١١٥٨ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زانی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بووە، ماوەك لە (بەغدا)ی خوێندووە، سەفەری بۆ (هەولێر) کردووە، ماوەك لە (دیمشق) دەرسی داوە، دوایی کرایتە قازی (شارەزور)، لەوێ گەڕایتەوە (حەڕان) لە فەرموودە شارەزا بووە، فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ): ﴿إني آتي يوم القيامة باب الجنة فاستفتح فيقول الخازن: من أنت؟ فأقول: محمد، فيقول: بك أُمرت، لا أفتح لأحد قبلك﴾ گێڕایتییەوە، بە ڕستە بێ پسانەوە، تا دەگاتە پێغەمبەر (د.خ)، مامۆستا لە ٦٣٤ك - ١٢٣٦ کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:
١. تاريخ أربيل ١/٢٩٢.
٢. معجم أعلام الكورد ٢٤٠.
٣. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٠١.

## حەمەدئەمین صالّح دوکەرەیی (٤٢٩)

ناوی حەمەدئەمینە، کوڕی مەلا صالّحی کوڕی مەلا عبدالقادرە، ساڵی ١٨٩٦ز لە گوندی (مەرگێبە) سەر بە ناوچەی (شەمامك) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆز و بەشێك لە کتێبە سەرەتاییەکانی لە خزمەت ئەو تەواوکرد، دوایی بۆ درێژەپێدان بە خوێندنەکەی سووڕی دا لە چەندان حوجرەی فەقێیان، ساڵی ١٩٢٥ز خێزانی پێکهێنا، پاشان چووە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی تەریقەتی لە لای وەرگرت، دوای تەواوکردنی خوێندنە شەرعییەکان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، ساڵی ١٩٣٠ز یەکەم مەلایەتی لە گوندی (گۆپتەپە) بوو سەر بە قەزای (کۆیە).

پاش چەند ساڵێك باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەویش گەڕاوە (قوشتەپە) لە شوێنی باوکی بووە مەلا، دوایی باری کرد بۆ گوندی (دووکەرە) دەوری پەنجا ساڵ لەو جێ یە کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، مامۆستا جگە لە زمانی کوردی عەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی نەمانزانیوە نووسراو و دانراوی خۆی هەبێت، لە ٤/٦/١٩٨٧ز لە (دووکەرە) کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: مەلا عەزیز: پێش نوێژی مزگەوتی قادر بلە بوو لە هەولێر، حاجی محەممەد: پشکێنەرە لە وەزارەتی ئەوقاف، عبدالرحمان: فەرمانبەر بوو لە (إعداد وتدریب) سەر بە وەزارەتی پەروەردە، عثمان: مامۆستایە لە زانکۆی (سەلاّحەدین).

مەلا عەزیز:

ساڵی ١٩٢٧ز لە گوندی (قوشتەپە) هاتە دنیا، لە خزمەت باوکی خوێندنی دەست پێ کرد، پاشان چووە حوجرەکانی فەقێیان لە خزمەت ئەو زانایە بەڕێزانە خوێندنی

بردەسەر: مەلا محەممەدئەمین سوێری و مەلا ئەبوبەکر کۆیی و مەلا حوسێن باقرتەیی و مەلا سەلیم دیبەگەیی و مەلا رەشید کۆزەپانکەیی و مەلا محەممەد مەحوری و مەلا ئیسماعیل شێخ شەروانی، لە کۆتایی دا چووە لای مەلا ئەحمەدی (رەش) بانەیی، لە خزمەت ئەو ئیجازەی وەرگرت.

هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی وەرگرت، سالّی ١٩٥٤ز بووە مەلا لە گوندی (قەپران) فەقێی هەبوون، سالّی ١٩٨٧ز بووە مەلا لە مزگەوتی (قادربلە) لە هەولێر، لە ٣/٤/٢٠٠٨ کۆچی دوایی کرد، لە گۆرستانی (مەعمەل قیر) بە خاك سپێردرا، کورەکانی: مەلا نوری و مەلا جەمال و کەمال و صالّح و سەردار کە هەر هەموویان دەرچووانی زانستە شەرعییەکانن، خوای گەورە یارمەتییان بدات بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆز.

سەرچاوە: نامەی مەلا جەمال مەلا عەزیز.

## حەمدون عەلی سعێرتی (٤٣٠)

ناوی حەمدونە، کوڕی عەلی یە، خەڵکی گوندی (حیزانە) سەر بە (سعێرت) ناوچەی (دیاربەکر)، فەرموودەی لە سەلیمی کوڕی ئەیوبی ڕازی شافیعی[1] گێڕاپتەوە، ئەبوبەکر مەحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی حوسێن شاشی[2] دەرسی لەلای ئەو زاتە خوێندووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٢/٣٤٧.

٢. اللباب ١/٤٠٦.

---

[1] لە ٤٤٧ك کۆچی دوایی کردووە.

[2] لە ٥٠٧ك کۆچی دوایی کردووە.

## حەمزە بەیرەم کوردی ( ٤٣١ )

مامۆستا حەمزە، بەیرەم کوردی، لە شێخە بەناوبانگەکانی (دیمشق)ە، ساڵی ١٠٣٨ك – ١٦٢٨ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دابەزیوە، لە قوتابخانەی (فارسییە) دەرسی فتوحاتی مەککییەی داوە، چەندان زانای لێ وردینە[١]، دەرسی فەرموودەیان لە خزمەت خوێندووە و ئیجازەی پێ داون، (شێخ حەمزە) سەفەری تورکیای کرد گەڕاوە (دیمشق)، لە سەرەتاوە کاتی سەفەرکردنی کە سواری ئەسپەکەی دەبوو خەڵکەکی زۆر دەورەیان دەدا، دەگەڵی دەچوون تا لە شار دەردەچوو، پاشان وازی لەو شێوەیە هینا، ڕازی نەبوو کەس لەگەری بچی، بە تەنیا دەڕۆیشت.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی پێنج شەممە (١٠)ی مانگی (محرم)ی ساڵی ١١٢٠ك – ١٧٠٨ز کۆچی دوایی کرد، لە نزیك گۆڕی پیرۆزی بیلالی حەبەشی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٢/٧٥

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٤٠.

## حەیات قەیس رەجال ( ٤٣٢ )

ناوی حەیاتە، کوڕی قەیسی، کوڕی رەجالی، کوڕی سوڵتانی ئەنصارییە، خەڵکی (ڕوهایە)، شێخەکی زانا و دڵپاك بووە، زۆر بە دین بووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، مەلیك و کاربەدەست و ڕیش سپی دەچوونە خزمەتی، ڕێز و حورمەتی هەبوو، قسەی دەڕۆیشت، سوڵتان نورەددین کە نیازی بوو بچێتە سەر ئەفرەنجەکان چووە خزمەتی داوای دوعای لێ کرد، دوعای بۆ کرد سەرکەوت، سوڵتان صەلاحەدین ئارەزووی بە سەردادانی موصڵی کرد، چووە خزمەتی داوای دوعای کرد، شێخ ئاماژەی بۆ کرد کە:

---

[١] لێ وردینە، واتا: لێی کۆبووینەوە و لێی داوەرینە.

نەچی واز بینی، سولتان عەلاحەدین گوێی پێ نەدا، چوو، هیچی پێ نەکرا، بە دەست بە تالی گەڕاوە.

شێخ حەیات قسە خۆش و ڕووخۆش بووە، دڵنەرم و بە ڕووحم بووە، چاو بلند و سەخی بووە، شەوان لە ترسی خوا نەخەوتووە، دوای ئەو لەو ناوچەیە کەس نەدیترا وەکو ئەو زاتە، کۆچی دوایی: ساڵی ٥٨١ك - ١١٨٥ز کۆچی دوایی کرد، کتێبی (السیرة)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤/٢٦٩.

٢. سير أعلام النبلاء ١٢/٤١٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٤١.

## حەیدەر ئەحمەد حەیدەری (٤٣٢)

ناوی حەیدەرە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەیدەرە، لە ڕۆژی دوو شەمەی (١١)ی مانگی شەوالی ساڵی ١٠٣٨ك - ١٦٢٩ز هاتووتەدنیا، لە مەدرەسەی خۆیان لە (ماوەران) دەستی کرد بە خوێندن، زانستەکانی لە خزمەت باوکی تەواو کرد، ساڵی ١١٢٦ك - ١٧١٤ز چووە (ئەستەمبۆڵ) بۆ سەردانی سوڵتانی عوسمانی (سولتان ئەحمەدی سێ یەم) و بەشداری کرد لە ئەنجومەنی زانایانی ئیسلامی.

لە کەراماتی ئەو زاتە دەگێڕنەوە: {کاتێ چووە تورکیا ڕۆژی هەینی چووە مزگەوتی سولتان، مەلایەکە وتاری دەدا، یەکسەر بە مەلا ئیبراهیمی کوڕی گوت: بڕۆ ئەو مەلایە دابەزێنە لە سەر مینبەر، ئەویش لەسەر فەرموودەی باوکی مەلای هێنا خوارەوە، سولتانیش لەوکاتە لەوێ ئامادەبوو، بەو ئیشە دڵی ناڕەحەت بوو بە مەلا حەیدەری گوت: ئەو کارە ناپەسندە چی بوو، بۆ واتان کرد؟

مەلا حەیدەر وەلامی داوە: سولتانم خۆشبی، مەلایەکەت کافرە، سوننەتیش نەکراوە، بۆ خۆت تاقی بکەوە، سولتان زۆر سەرسام بوو، دوای پشکنین دەرکەوت، کە

مەلا سوننەت نەکراوە و کافرە و جاسوسە، سولتان فەرمانی دا لە سەریان دا، شمشێرەکەی پێیان کوشت سولتان بە مەلا حەیدەری بەخشی، ئێستاش ئەو شمشێرە لە لای ئەو بنەماڵە ماوە خەڵکان بۆ مراز و نەخۆشی دەچن، بۆتفەڕك بە پشتی خۆیان دادێنن}.

ساڵی ١١٢٨ك سولتان فەرمانی دا بەروبومی چەند گوندێك لە دەوروبەری (هەریر) بە مەلا حەیدەر بدرێت بۆ خەرجی فەقێیان و مێوانان، ئەمجا گەڕاوە (هەولێر)، ساڵی ١١٢٩ك – ١٧١٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ عبدالله (شێخەڵلا) بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی:

١. نامیلکەك لە دژی شیعەکان: نووسخەکی خەتی محەممەد عومەرمان لە لایە، ساڵی ١٢٥٧ك – ١٨٤١ز نووسیتییەوە.
٢. حاشیە لە سەر حاشیەی میرزاجان لەسەر قەرەباغی، دەستنووسەکی ساڵی ١٢٠٧ك – ١٧٩٢ز مان لە لایە.
٣. حاشیە لەسەر حاشیەی میرزاجان، لە سەر (سەید).
٤. حاشیە لەسەر عیصامەدینی (وەضع) لە ١٤ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٠٩٥ – ١٦٨٤ز تەواوی کردووە، نوسخەکی لە لای ئێمە هەیە.
٥. حاشیە لەسەر (مختصر المنتهی).
٦. حاشیە لەسەر (شرح التجرید).
٧. حاشیە لەسەر (حکمة العین).
٨. حاشیە لەسەر (شرح العقائد الجلالیة).
٩. حاشیە لەسەر خەیالی شەرحی عەقائد.
١٠. حاشیە لەسەر (أشکال التأسیس)
١١. حاشیە لەسەر (إثبات الواجب)
١٢. حاشیە لەسەر حاشیەی (لاري).

١٣. حاشیە لەسەر نامیلکەی (عضدیة)ی عیصامەدین، سەرەتایەکەی بە (الحمدلله الـذي أقر بربوبيته جميع العباد....) دەست پێ دەکات

سەرچاوەکان:


١. عنوان المجد ١٢٤.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٤١.

٣. هدية العارفين ٥/٣٤٢.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٣٦ – ٢٤٥.

٥. مشاهير الكورد ١/١٨٩.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨٠.

٧. معجم المؤلفين ٤/٨٩.

٨. سلك الدرر ٢/٧٦ – ٧٧.

٩. گۆڤاری کاروان، ٨٧ / ١٩٩٠ز

١٠. بنەماڵەی زانیاران ٢٢٧ – ٢٢٩..

١١. هەولێرم وادیوە ١٩٤.


## حەیدەر صبغة الله حەیدەری (٤٣٤)

ناوی حەیدەرە، کوڕی صبغةاللەی، کوڕی ئیبراهیم حەیدەرییە، زانایەکی شەرع زان و ئەدیب و ڕۆشنبیر بووە، ماوەك لە (بەغدا) موفتی مەزهەبی حەنەفی بوو، ساڵی ١١٨٧ك – ١٧٧٣ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، حاشیەی لەسەر تەفسیری بەیزاوی هەیە.

سەرچاوەکان:


١. عنوان المجد ١٢٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨٠ – ١٨١.

## حەیدەر عاصم حەیدەری (٤٣٥)

ناوی حەیدەرە، کوڕی عاصمی، کـوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی صـبغةاللە یـە، سـاڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز هاتووتەدنیا، زانایەکی بەرز بووە، لـە چـەرخی خـۆی وێنـەی کـەم بووە، زاتەکی بە دین و ڕوو لە خوا بووە، حەزی لە پلە و پایـەی مـیری نـەکردووە، لـە ٢٠/٦/١٩٥٤ز کۆچـی دوایـی کـردووە، لـە نزیـك گـۆڕی حەیـدەری دوودەم، لـە گۆڕستانی شێخ عبداللە (شێخەڵڵا) بە خاك سپێردرا، پێنج کوڕی هەبوون: عاصم، صاڵح، جەمال، مهیب، ممتاز.

سەرچاوە: هەولێرم وادیوە.

## حەیدەر عبد اللە حەیدەری (٤٣٦)

نـاوی حەیـدەرە، کـوڕی عبـداللەی، کـوڕی حەیـدەری مـاوەرانی یـە، نازنـاوی (ضیائەدین)ە، باوکی ماوەك چوویتە داغستان، پاشان گەڕایتەوە کوردستان، بۆیە نـاوبراوە بە داغستانی، مامۆستا ماوەك لە (بەغدا) خەریکی خوێندن بوو، پاشـان بـاوکی ناردییـەوە کوردستان تاکو شارەزا بێت لە زانستەکانی عەقلی، هەروەکو دەردەکەوێت لـە نامەیـەك کە باوکی ساڵی ١٢٤٦ك – ١٨٣٠ز لە بەغدا بۆی ناردووە و دوعـای سـەرکەوتنی بـۆ دەکات، پاشان گەڕاوە (بەغدا)، ماوەك قازی بوو لە (هەولێر)، دوایی کرا موفتی، دوایـی سەفەری (میصر)ی کرد، چووە (قـاهیرة)، چووە (ئەسکەندەریە)، لـەوێ زیـارەتی گـۆڕی ئیمامی بوصیری کرد، هەر لەوێ دەستی کـرد بـە شـەرحی قەصـیدەی بوردییـە، ناوینـا: (عمدة الکلام في شرح براءة الإمـام)، لـە ١٣٠٤ك تـەواوی کـرد، پێشکەشـی کـرد بـە سوڵتان عبدالحمیدی عوسمانی، هەروەها شەرحی (رسالة البیان)ی مـەلا ئەحمـەدی گـڕاوی کردووە، پیشکەشی بە محەممەد فەیزی زەهاوی کردووە، ئەویش لێی ڕازی بووە و سوپاسی کردووە.

مامۆستا حەیدەر لە ١٣٠٤ك – ١٨٨٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:
١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٩٧ – ٢٥٠ – ٢٥٥.
٢. هدية العارفين ٥/٣٥٢.
٣. إيضاح المكنون ٢/١٤١.
٤. معجم المؤلفين ٤/٩١.

## حەیدەر عەلی تەوێڵەیی (٤٣٧)

ناوی حەیدەرە، کوڕی عەلی یە، لە گوندی (تەوێڵە) هاتووتەدنیا، مامۆستا عبدالکریمی مدرس (خوا لێی خۆش بێ) دەوری ساڵی ١١٦٥ك – ١٧٥١ز بۆ لەدایك بوونی داناوە، بەلام پێ دەچێت ئەوە هەڵەکی چاپی بێت، چونکە هەر خۆی دەڵێ: ناوبراو (فەضیلە)ی مەولەوی نووسیتەوە، وە مەولەوی (خوا لێی خۆش بێ) فەضیلەی ساڵی ١٢٨٥ك تەواوکردووە، لەوانەیە مێژووەکەی سەرەوە ١٢٦٥ك – ١٨٤٨ز بێ.

(مەلا حەیدەر) لە خانەوادەکی خواناس و ڕوو لە خوا پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، ئەمجا لە (تەوێڵە) دەستی کرد بە خوێندنی شەریعەت و زانستەکان، تا زەریف شارەزا بوو.

مامۆستا دنیاداری نەدەکرد، بۆ هیچ جێگا نەدەڕۆیشت، ژنی نەهێنا، بەدرەوام خەریکی قورئان خوێندن و دەرسدانەوە و وەڵامدانەوەی پرسیارانی خەڵك بوو، خەتێکی خۆشی هەبوو، (فەضیلە)ی مەولەوی و (نظم المحاسن)ی ئیبن (الحاج)ی نووسیتەوە، قەت حەرامی نەخواردووە، باسی کەسی بە خراپە نەدەهاتە سەر زار، قسەی بێ سوودی نەدەکرد، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەدا، ساڵی ١٣٥٣ك – ١٩٣٤ز لە (بیارە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨١ – ١٨٢.

## حەیدەر محەممەد پیرەدین (٤٣٨)

ناوی حەیدەرە، کوڕی محەممەد پیرەدینە، لە کوردستان لە دایك بووە، لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی خوێند، دوایی چووە ناوچەی (پشدەر) لای مەلا زەینەدینی بەلاتی خوێند، ماوە لەوێ تا قۆناغەکانی تەواوکردن، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (هەریر)، کە باوکی کۆچی دوایی کرد، بووە جێگری لە گوندی (ماوەران) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، فەقێیان بە جارەك ڕوویان تێ کرد، ناودەبردرا بە: ئیبن حەجەری دووەم، بە ڕاستی گەورەترین موفتی مەزهەبی شافیعی بوو، لە چەرخی خۆی، مەلا جەمیل ڕۆژبیانی (خوا لێی خۆش بی) دەڵێ: {بیستوومە کە حاشیەکی گرینگی لەسەر کتێبی (توحفە) هەیە}، ئەو زاتە ساڵی ٩٨٥ك – ١٥٧٧ز لە (ماوەران) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٥ – ١٢٦.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٣٩

٣. مشاهير الكورد ١/١٨٩.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٧٩ – ١٨٠.

٥. بنەماڵەی زانیاران ٢٢٥ – ٢٢٦.

٦. کاروان ٨٧ / ١٩٩٠ز.

– خ –

## خالید ئەحمەد شارەزوری (مەولانا خالید) (٤٣٩)

ناو و نژادی: ناوی خالیدە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حوسێنە، عەشیرەتی جافی میکائیلی یە، لە نەتەوەی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانە (خوا لێی رازی بی)، نازناوی (ضیائەدینە) ساڵی ١١٩٣ك – ١٧٧٩ز لە ناحیەی (قەرەداغ) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە قەرەداغ دەستی کرد بە خوێندن، هەروەك فەقێیانی کوردستان لە چەند شوێنان گەڕا و لە لای چەند زانایان بۆ بڕینی قۆناغەکانی خوێندن.

بەشێك لە مامۆستایەکانی: سەید عبدالکریم بەرزنجی، شێخ عبداللەی خەرپانی، سەید عبدالرحیم بەرزنجی: (تهذیب المنطق)ی لە خزمەت خوێند، مەلا صاڵحی تەرەماری، مەلا ئیبراهیمی بیارەیی، مەلا جەلالی خورمالی، مەلا صبغةاللەی زیارەتی، مەلا محەمەد ئیبن ئادەم بالەکی، شێخ قەسیمی سنەی مەردۆخی: لە خزمەت ئەو زاتە ماوە، تا کۆتایی بە خوێندن هێنا و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، وە بیستومە: (مەولانا) لە گوندی گڕاویشی خوێندووە، لەلای مەلا عبداللەی گەورە؟

مەلایەتی: ئەمجا هاتە شاری (سلێمانی) لە مزگەوتی عەزیز ئاغا دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، وە لە ساڵی ١٢١٣ك چووە مزگەوتی عبدالرحمان پاشا: ناسراوە بە مزگەوتی بابا عەلی، ماوەکی زۆر لەوێ دەرسی دا، ساڵی ١٢٢٠ك – ١٨٠٥ز لە ڕێگای (شام) چووە حەج، لەوێ لەگەڵ زاناکان، کۆبۆوە و یەکتریان دیت، هەر لەو سەفەرە، پیاوچاکەك مژدەی پێ دا کەوا: {لەو نزیکانە مرازت حاصڵ دەبی، دەگەی بە مرشیدی ڕاستی خۆت}، گەڕاوە کوردستان وەك جاران دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە.

سەفەری مەولانا بۆ هیندوستان: مامۆستا عبدالکریمی مدرس (خوا لێی خۆش بێ) لە یادی مەردان (١/ ٢٦-٢٧) دەڵێ: {ڕۆژەك یەك لە مریدەکانی شێخ عبداللەی دەهلی نەقشبەندی ناسرابوو بە، میرزا رەحیم الله هاتە لای مەولانا، داوای لێکرد بچێتە هیندوستان، بۆ خزمەت شێخ عبدالله}، مەولانا لە مێژبوو چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو، چونکە لە پێشدا لەسەفەری حەج ئاماژەی بۆ کرا بوو بە ڕێکەوت، چووە سنە، هەمەدان، تاران، بەستام، نیسابۆر، مەشهەد، قەندەهار، گەیشتە دەهلی، ماوەك لەوێ ماوە، شێخ کە دیتی لێ وەشایەوەیە بە خەلیفە قبوڵی کرد، فەرمانی گەڕانەوەی بۆ کوردستان دا.

گەڕاوە شاری (سلێمانی)، خەڵکان تا دەرەوەی شار بە پیریەوە هاتن و پێشوازیان کرد، زۆر ڕێزیان لێنا، ماوەك خەریکی دەرسدانەوە و ئامۆژگاری بوو، چووە (بەغدا) شەش مانگ لەوێ ماوە لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی، ساڵی ١٢٢٦ك – ١٨١١ز گەڕاوە (سلێمانی)، دوایی لەسەر فەرموودەی شێخ عبدالله گەڕاوە (بەغدا) لەو

مزگەوتەی ئێستا ناودەبردرێ بە تەکیەی خالیدیە نیشتەجێ بوو، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری، مەلایەکانی حەیدەری ماوەرانێ لەو سەردەمی سەرۆکی زانایانی بەغدا بوون زۆر حورمەتیان گرت، تەریقەتیان لەسەر دەستی وەرگرت، کە وایان زانی زانایانی بەغدا بە یەکجاری ڕوویان تێکرد، بۆی ملکەچ بوون، لە قسەی دەرنەدەچوون، داوای دوعای خێریان لێ دەکرد.

شێخ ئیبراهیم فەصیح حەیدەری لە (عنوان المجد / ١٣٣) دەڵێ: {لەو کاتە مەولانا خالید تەشریفی هاتە بەغدا، من زۆر نەخۆش بووم، عوبیدالله ئەفەندی حەیدەری مامم منی لە تەك شێخ دانا، تاکو دوعام بۆ بکا و بەرەکەتی لێ وەربگرم، دوعای بۆ کردم، سوپاس بۆ خودا، چابوومەوە بەرام لێ نەما}.

پاشان میر مەحمود پاشای بابان چووە (بەغدا)، داوای لە مەولانا کرد بگەڕێتەوە کوردستان، هاتەوە سلێمانی میر مزگەوت و تەکیەی بۆ دروست کرد، لەو شوێنە ئێستا ناودەبردرێت بە: (خانەقای مەولانا خالید)، هەروەها چەند گوندی کردە وەقف تا بەروبومەکەی خەرج بکرێت لە فەقێیان و مریدان و مێوانان.

ڕۆیشتنی لە کوردستان: مەولانا لە (سلێمانی) دڵی شکا، بێزاربوو، ناڕەحەت بوو باری کرد بۆ (بەغدا)، لە تەکیەی خالیدیە خەریکی دەرس و فەتوا بوو، ساڵی ١٢٣٨ك – ١٨٢٢ز چووە (دیمشق)، لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری، ڕیزیان لێنا و مرید و خەلیفەی زۆربوون، دوایی چووە زیارەتی (قودس)، دووبارە چۆوە حەج، گەڕاوە (شام) دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان.

ڕەوشتی: جەنابی مەولانا هەولێ دەدا خەڵکان ڕاستەڕێ بکا، لە ڕێگای دەرسدانەوە و لە ڕێگای تەریقەت، هەموو ڕۆژان دەرسی مەلا و فەقێیانی دەدا، سوپاس بۆ خودا لە هەموو بابەتێك شارەزا و پسپۆڕ بوو، مەلایان دەهاتنە لای بۆ چارەکردن و ڕۆنکردنەوەی بابەتە قورسەکان، دوا بڕیاریان ئەوەبوو: {فەرموودەی سەید خالید ڕاستە}، هەروەها لە ڕووی تەریقەت و تەسەووف، شەوان دەرسی بە مریدان دەدا، هەموو

کاتەکانی وەقف کردبوو بۆ ڕێ نیشاندان، بەو دوو مەدرەسە واتە: شەریعەت و تەریقەت، مەولانا لە ڕێگای زانستەکانی ئاشکرا و نهێنی، کردەوەی چاکەی ئەندام و دڵ، چەند کەسی پێ گەیاند، چەند مەلای ئیجازەدانێ، چەند کەس بە خزمەتی بەرماڵەکەی گەیشتنە پلەی خەلیفە و شێخایەتی، هەریەك بوونە چیایەکی بەرزی زانیاری، وەك هەڵگۆرد و زۆسك و هەندرێن، ناجولێن بە ڕەشەبای ستەمکاری ڕۆژگار، بوونە گڵۆپی تریسکەداری خوایی، کوردستان و دەرەوەی کوردستانیان ڕۆناك کرد، نموونەی ئەو زاتانە: سیراجەدین شێخ عوسمانی تەوێڵەیی، مەلا عبداللەی جەلی کۆیی، شێخ طاهیری بامەڕنێ، سەید طاهای نەهری، سەید عوبیداللەی نەهری، شێخ عەبباسی کەرکوکی، شێخ محەممەدی قرمشکی، شێخ ئیسماعیلی شێروانی، شێخ محەممەد سلێمانی، عبدالغفور مەشهەدی، شێخ مەحمودی گەیلانی، مەلا ڕەسولی سابلاغی، شێخ محەممەد صالح (مەککە)یی، شێخ محەممەد ناصح، مەلا مصطەفا جەلالەدین، شێخ فەتتاحی ئاکرێ، شێخ عبداللەی هەرەوی، شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی، شێخ ئەحمەدی قەستەمونی، سەید ئەحمەدی سەردار، عوبیداللە ئەفەندی حەیدەری، شێخ عبدالقادر بەرزنجی، شێخ محەممەد جدید، شێخ عبدالرحمان دیمشقی کوردی، شێخ عبدالرحمان خانێ، مەلا ئەحمەدی هەکاری، شێخ هیدایەاللەی هەولێری، شێخ عبداللەی قەدری قودسی، شێخ موسای جبوری، شێخ مەحمودی عیمارەیی، شێخ مەعروف تکریتی، شێخ عبداللەی ئەرزەنجانی مەکی، شێخ خالیدی کوردی مەدینەیی، لەگەڵ زۆرانی تر.

دانراوەکانی: مەولانا هەرچەندە خەریکی دەرسی مەلا و فەقێیان و ئامۆژگاری خەڵکان و ڕێ نیشاندانی مورید و سۆفییان بوو، بەڵام لە نووسین دریغی نەکردووە، قەڵەمە قامیشەکەی هەروەکو زمانە شیرینەکەی بە وێنەی دڵە پاکەکەی، بە هەمان شێوە لە نووسین لە کار بووە، چەند کتێب و پەراوێزی هەنە، ناوەکانیان بەپێی لیستەکەی شێخ محەممەدی خاڵ ئەوانەن:

١. حاشیە لەسەر خەیالی و سەیلەکوتی شەرحی عەقائید، ساڵی ١٣٠٧ك - ١٨٨٩ز لە ئەستانە چاپ کرا.
٢. العقد الجوهري، في الفرق بين كسبَـيْ الماتريدي والأشعري (الإرادة الجزئية): ئەوەش چاپ کراوە و شەرح کراوە، لەوانە شەرحی مەلا عبدالله مەلا محەممەد ئەمین بێتـواتی بە ناوی (المنحة الوهبية) ساڵی ١٩٤٧ز لە بەغدا چاپ کرا.
٣. شەرحی (أطباق الذهب)ی زەمەخشەری بە فارسی.
٤. شەرحی مەقاماتی حەریری.
٥. حاشیە لەسەر (جمع الفوائد) فەرموودەی خۆشەویستە (د.خ).
٦. حاشیە لەسەر (نهاية المحتاج) لە فیقهی شافیعی.
٧. حاشیە لەسەر شەرحی عەقائیدی (عضد)
٨. نامیلکە بۆ مریدە حەنەفییەکانی بووینە شافیعی.
٩. حاشیە لەسەر (تكملة)ی سەیلەکوتی لەسەر (جامي) بەشێکمان لە لایە.
١٠. دیوانی شیعر: بە کوردی و عەرەبی و فارسی، نازناوی: (نوری) بۆ خۆی دانـاوە، ساڵی ١٢٦٠ - ١٨٤٤ز لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا.
١١. جالية الأكدار في تقلبات الأمصار.
١٢. جلاء الأكدار والسيف البتار في الصلاة على النبـي المختار.
١٣. فرائد الفوائد في العقائد: فارسي يە
١٤. نامیلکەی زیکری تەریقەتی نەقشبەندی.
١٥. نامیلکەی رابیطە.
١٦. مەکتوباتی عەرەبی.
١٧. مەکتوباتی فارسی.
١٨. نامیلکەی (آداب المريد).

ئەو زاتە نووسین و هەستان و دانیشتنی، سەفەر و هاتوچۆی هەمووی هەر خێر و بەرەکەت بوو، ئیشەکانی بۆ خوا بوو، ناوی هەر بە چاکە دەبردرا، ئەوەی باس دەکرێ کە گۆیا: ئیبن ئادەمی بالەکی مامۆستای لە مەولانا ڕازی نەبووە، یا شێخ نورەدینی بریفکان، لە نامەیەك لە دژی نووسیوە، یا شێخ مەعروف نۆدەیی بەرزنجی ناکۆکی لەگەڵ هەبووە، بە لای من خەریك بوون بەم جۆرە شتانە پێویست ناکات، ئەوانە لەوە گەورەترن کە ئێمە لایەنەك تاوانبار بکەین و لایەنەك ماف پێ بدەین، چی کردوویانە بۆ خودا بووە، ئەگەر کارەکە ڕاست بێ، دوو خێر وەردەگرن، یەك: مافی ماندوبونیان، دوو: مافی ڕاستییەکە، وە ئەگەر ڕاست نەبووبێ تەنیا مافی ماندووبوونەکە وەردەگرن، پێغەمبەر (د.خ) فەرموویێ: ﴿إذا اجتهدَ الحاكمُ فأَصابَ فله أجران، وإذا اجتهدَ فاخطأ فلَهُ أجرٌ﴾ (بوخاری ریوایەتی کردیە).

کۆچی دوایی: شەوی هەینی ١٣ی مانگی ذي‌القعده سالّی ١٢٤٢ك – ١٨٢٧ز ماڵئاوایی لە دۆستان کرد، گیانی پاکی بەرەو بارەگای خوای گەورە هەوراز چوو، لە گۆڕستانی کێوی قاسیۆن لە دیمشق بە خاك سپێردرا، لەوێ ناسراوە بە: (زیارەتگای سەید خالیدی کوردی)، سالّی ١٢٥٨ك – ١٨٤٢ز لە سەر فەرمانی سولّتان عبدالحمید خانی عوسمانی گومبەتی لەسەر دروست کرا، بەبۆنەی کۆچی دوایی مەولانا محەممەد جەواد سیاهپۆش قەسیدەکی درێژی عەرەبی نووسیوە، لە کۆتایی دا دەڵێ:

بكاك بعين الرفق كل موحدٍ     لانك فرد في الكرامة واحد

ولما هويت الحق قلت مؤرخاً:     {هوى للقاء الحق في القدس خالد}

١٢٤٢هـ

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ٩٤، ١٣٣، ١٣٤، ١٣٥، ١٣٦.

٢. دیوانی مەولانا خالید / پێشەکی.

٣. یادی مەردان ١/٧– ٨٦.

٤. الأكراد في بهدينان ٧٧ – ٨١.
٥. أربيل في العهد الاتابكي ٢٢٦.
٦. الشيخ معروف النودهي ٣٨ – ٥٣.
٧. ژیناوەری زانیانی کورد ٢٩ – ٧٤.
٨. هدية العارفين ٥/ ٣٤٤.
٩. إيضاح المكنون ٣ / ٣٦٢.
١٠. مشاهير الكورد ١/ ١٩١ – ١٩٢.
١١. بوژاندنەوە ١/١٥٣، ٣٠٠، ٢/١٨٦، ١٩٩، ٥/ ١٩١، ٢٠٢.
١٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨٥ – ١٨٨.
١٣. معجم المؤلفين ٤/٩٥.
١٤. جامع كرامات الأولياء ٢/٥٧
١٥. محمد بن عبدالله الجلي ٥٤ – ٥٥.
١٦. بنەماڵەی زانیاران ٦٠٧.
١٧. گوڵزاری کوردستان ١٣٨.
١٨. الأعلام ٢/ ٣٣٤ /٩/١٩ /١٠/٨١.
١٩. تاريخ السليمانية ٢٢٥ – ٢٢٩
٢٠. معجم أعلام الكورد ٢٤٦ – ٢٤٧.
٢١. تاريخ مشاهير كورد ١/٣٢٩.

## خالید حەسەن شازەلی (٤٤٠)

ناوی خالیدە، کوڕی حەسەنی شازەلی یە، ساڵی ٦٤٤ ك – ١٢٤٦ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، بەشێکی لە کتێبە سەرەتاییەکان خوێند، لە خزمەت باوکی چووە (حەج)، ساڵی ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز باوکی لە ڕێگای حەج کۆچی دوایی کرد، مەلا خالید گەڕاوە کوردستان، لە ناوچەی (مەریوان) نیشتەجێ

بوو، پاشان چووە گوندی (کاکۆ زەکەریا)، لەوێ خاوەنی گوندەکە میرزا محەممەدی هەمەدانی تاقە کوڕێکی هەبوو، زۆری خۆش دەویست، تووشی نەخۆشیەکی گران هات، داوای دوعای چابوونەوەی لە مەلا خالید کرد، دوعای بۆ کرد، خوا چاکی کردەوە، میرزا لە کەیفان گوندەکەی هەموو پێشکەش بە مەلا کرد، ناوینا (خالیدیە)، ئەو شوێنە بووە جێگای کۆتایی مامۆستا، تا کۆچی دوایی هەر لەوێ ماوە، مامۆستا ناسرابوو بە: (شازەلی) چونکە سەرۆکی تەریقەتی شازەلی بوو لە کوردستانی (ئێران)، کوڕێکی ناو سولەیمانی هەبوو، بەدەست (بۆداق)ی تاوانبار شەهیدکرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٨٨ – ٢٢٣.

## خالید عبدالله موفتی (٤٤١)

ناوی خالیدە، کوڕی مەلا عبداللهی موفتی یە، ساڵی ١٣٢٣ك – ١٩٠٥ز لە گوندی (ڕشە)ی هەورامان هاتووتەدنیا، لە شاری (سنە) دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، دوا قۆناغی خوێندن هاتە (هەولێر)، لای مەلا ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت پاشان چووە (تەوێلە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلی حیسامەدین وەرگرت، لە سەر فەرموودەی شێخ چووە ناوچەی (زەلم)، ساڵی ١٣٦٠ك کرا (مدرس) لە پێنجوین، ساڵی ١٣٦٥ گەڕاوە (سنە)، لە قوتابخانەی نەصیردیوان دەرسی دەداوە.

کۆچی دوایی: لە ٢٦ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ساڵی ١٤٠٠ك – ١٩٨٠ز لە (تاران) کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەصیەتی خۆی لە گردی بێشکۆ لە کەرماشان تە نیشت وەیسی قەرەنی بە خاك سپێردرا، مامۆستا خالید شاعیریش بوو شیعری کوردی و فارسی هەیە.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ٢/ ٤٦٩ – ٤٧٠.

## خالید مصطفی موفتی (٤٤٢)

ناوی خالیدە، کوڕی مصطفا موفتی، کوڕی مەحمود قازی، نەوەی شێخ مەلا عبداللهی خەرپانی یە، لە نەتەوەی ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام موسای کازمە (خوا لێی رازی بی)، بنەماڵەکی ئایین پەروەر و ئەهلی تەریقەتن، ساڵی ١٩٢٤ز چاوی خۆی هەڵینا لەدنیا.

خوێندنی: لە سەرەتاوە لە قوتابخانەکەی خۆیان دەستی کرد بەخوێندن، پاشان بۆ مەبەستی وەرگرتنی زێدە زانیاری چووە چەند شوێنان، لەوانە: (بیارە)، (مزگەوتی جامیعە)، (پرێس)، (عاشقان)، (عەبابەیلێ)، (شێخ سەلام)، (خانەقای مەولانا لە سلێمانی)، لەخزمەت ئەو زانایانە خوێندنەکەی کۆتایی پێ هینا: (شێخ ڕەسولی تەکیەیی)، (مامۆستا عبدالکریمی مودەریس)، (مەلا صالح تریفەی)، (مەلا عەزیز پرێس)، (شێخ نوری)، (بابا ڕەسوڵی بێدەنی)، (عبدالوهاب نێرگسەجاڕی).

مەلایەتی: ساڵی ١٩٥٢ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت لە مزگەوتی جامیعەی (هەڵەبجە)، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٦٨ز کرا پێش نوێژ ووتارخوێنی مزگەوتەکە، ساڵی ١٩٧٤ز ئاوارەبوو، بۆ (خەرپان) سالی ١٩٨٨ز لە کیمیابارانی هەڵەبجە ئاوارەبوو بۆ (ئێران)، پاشان گەڕاوە (سلێمانی)، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٩١ز خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بوو، لە مزگەوتی عومەری کوڕی خەتاب.

پلەی زانیاری: مامۆستا تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عوسمان سیراجەدینی دووەم وەرگرت بوو، لە لایەن شێخەوە کرا (سەرحەڵقەی خەتم)، ژمارەکی زۆر ئیجازەی بە مەلایان داوە، شیعری تەسەووف و نیشتمانی هەیە، شەرع زان و وتار بێژ بوو، دەنگ نەرم و بەسۆز و قسەخۆش بوو، یاری زان و نیشانچی بوو، هاوبەشی خەباتی گەل بوو، چوارجار ماڵی وێران کرا، بە دەستی ڕژێمی ئاوئاوچووی، لە کۆنگرەی یەکێتی زانایان ساڵی ١٩٧١ز لە (گەلالە) و ساڵی ١٩٩١ز لە (هەولێر) بەشداری کرد، ساڵی

١٩٨٧ز دوای ڕاپەڕینی (هەڵەبجە) لە سەربازگای تانجەڕۆ لە شاری (سلێمانی) زیندان کرا، دوایی خوای گەورە دەربازی کرد.

کۆچی دوایی: لە ٢٨/٨/٢٠٠٤ز کۆچی دوایی کرد.

سوپاس بۆ خودا چوار کوڕی مەلای هەنە:

١. شێخ محسن: پێش نوێژ و ووتارخوێنی مزگەوتی مەولانا خالید نەقشبەندی لە (هەولێر).

٢. شێخ محمد: پێش نوێژ و ووتارخوێنی مزگەوتی جامیعە (هەڵەبجە).

٣. شێخ مادح: پێش نوێژ و ووتارخوێنی مزگەوتی عومەری کوڕی خەتاب، لە (سلێمانی).

٤. دکتۆر حەسەن: مامۆستای بەشی (أصول الدین) زانکۆی (صلاح الدین)، لە (هەولێر).

سەرچاوە: نامەی د. حەسەن شێخ خالید موفتی.

## خدر ئەحمەد دەشتی (٤٤٣)

ناوی خضرە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عەلی، کوڕی عبد الله یە، عەشیرەتی (نانەکەلی)یە ساڵی ١٩٠٩ز لە گوندی (مەلاکاغە)ی نزیك چیای (قەرەچوغ) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: ماڵیان باری کرد، هاتە گەڕەکی (سەرا) لە (هەولێر)، لە تەکیەی شێخ محیەدین دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە ناوچەی خۆشناوەتی، ماوەك لە شەقڵاوە و سپیگرە و کونەفلوسە ماوە، ماوەك چووە (بێتواتە) لای مەلا محەممەد، ساڵی ١٩٢٩ز سەردانی ماڵی خۆیانی کرد، بە داخەوە بەسەر تازییەی باوکی ڕاگەیشت، بەڵام خەمی خوێندنەکەی پتربوو لە خەمی باب مردن، وای زانی لەبەر ئەرکی ژیانی ناتوانی بخوێنی، بەڵام خزمەکانی مەردانە یارمەتیان دا بۆ بردنە سەری خوێندنی چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە هەولێر لای مەلا عبداللهی بێتواتەیی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت ساڵی ١٩٣٥ز.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (دارەبەن) هەژدە ساڵ لەوێ دەرسی دەدا و کاروباری ئاینی جێبەجێ دەکرد، لە ١٩٥٣ز چووە (گردەچار)ی ناوچەی بەڕانەتی، لە ١٩٥٤ز گەڕاوە (هەولێر)، لە ١٩٥٦ز چووە (خرابەدراو)، لەو شوێنانە فەقێی هەبوون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئیسماعیلی گەزنەیی، مەلا رەسولی شاوێسی، مەلا سەید عبداللەی جدیدەیی، مەلا ئەحمەدی هەرشەمی، مەلا عبدالقادری گۆمەسپانی، مەلا عەباسی سێبیرانی، شێخ عبدالسلامی بۆتانی، مەلا ئەحمەدی دارەبەنی، مەلا طاهیری مەلا شەهید، مەلا محەممەدئەمینی پەرپیتانی.

خووڕەوشتی: بەژن درێژ و ئەندام زەعیف بوو، رەنگ ئەسمەر بوو حەق گۆ بوو، بەرانبەر ناحەقی بێ ئارام بوو، تورەیی بەرز دەبۆوە بەڵام زوو سارد دەبۆوە، زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی دەزانی، شاعیرەکی چاك بوو، ساڵی ١٩٥٧ز لە (خرابەدراو) کۆچی دوایی کرد، هەر لەوێ بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەکانی:

١. مەلودنامە: سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

ئەی خودایی بێ شەریك و بێ مەکان  هەر ئەتوی قەتعا بەسەرتانێ زەمان

٢. عەقیدەی کوردی: لەسەر فەرموودەی شێخ مصطفای نەقشبەندی (خوا لێی خۆش بێ) دایناوە، سەرەتایەکەی ئەوەیە:

حەمد و مەدح و شوکری دائیم بێ ژمار  بۆ کەسێکی خۆی بە عالەم کرد دیار

٣. هۆنراوەی (بدیع).

٤. هۆنراوەی (إستعارة) بە عەرەبی.

٥. دیوانی شیعر: کوردی و عەرەبی و فارسی، ساڵی ٢٠٠١ز بە لێکۆڵینەوەی ئەحمەد دەشتی لە (بەرلین) چاپ کرا.

مامۆستا چەند کوڕی نووسەر و ڕۆشنبیری هەیە: کاك محەممەد و ئەحمەد و عبدالکریم.

سەرچاوەکان:

١. دیوانی دەشتی / پێشەکی ١٨ – ٣٤.

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٧/ ١٠١ – ١١١.

## خدر سارتكەیی (٤٤٤)

مامۆستا خدر ساڵی ١٩٣٥ز لە گوندی (سیسێر) هاتووتەدنیا، لە لای مەلا ئەحمەدی گەنمانی دەستی بە خوێندن کرد، دوایی هاتە (گەلالە)ی عێراق، ماوەك لەوێ بوو پاشان چووە (نستان) لای مەلا ئیبراهیمی سیسێری، دوایی چووە گوندی (نەلاس) لای مەلا عبداللهی واوی، ماوەکیش لە گوندی (نوورەدین)ی عێراق لای مەلا حوسێنی دەشتێوی خوێند، دوایی چووە (گەناو) لای مەلا صاڵحی بێژەوی، ساڵی ١٩٥٣ز گەڕاوە سیسێری لای مەلا ئیبراهیم، دوایی چووە گوندی (سوغانلو) لای مەلا عبدالرحمانی سیسێری، دوایی چووە گوندی (بێکۆس) لەوێ ڕۆیشت بۆ (دۆلەتوێ)، لەوێ بۆ گوندی (قەلەڕەشێ) لای مەلا عبدالرحمان، ئەمجا چووە گوندی (ڕەبەت) لای مەلا سەید سەلام، دووبارە گەڕاوە (گەلالە) لای مەلا محەممەدی بۆکانی (ڕەئیس)، لەوێ کتێبانی: تشریح الأفلاك، رسالة الحساب، تهذیب الكلام، لەگەڵ چەند بەرگی توحفەی تەواوکرد.

مەلایەتی: گەڕاوە (سارتکێ) سێ ساڵ خەریکی دەرسدانەوە بوو چەند ئیجازەی دا، ساڵی ١٩٦٠ز تا ١٩٧٠ز لە بەندیخانەی (تاران) گیرا، کاتێ بەردرا دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە، دووبارە ئارەزووی گرتنیان کردەوە، بەڵام ئەمجارە خۆی نەدا دەست، هاتە گوندی (بۆسکێن)ی عێراق، دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە، پاشان گەڕاوە (سارتکێ).

مامۆستا شاعیر و نووسەریش بوو.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: دەرسهای ئەز ئیسلام، خوداش ناسی بەر ئەساسی فەلسەفە، کۆمۆنیزم و ڕەوتی مێژوو، ڕاپەڕین، وەحدەت.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٩٨ز لە (نەرویج) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (گاملەبیەین) لە شاری ئۆسلۆ بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٨٨ – ٢٩١.

## خدر نیژاوی (٤٤٥)

مامۆستا مەلا خدر سالّی ١٩٣٠ز لە گوندی (نیژاوی) سەردەشت، هاتووتەدنیا، سالّی ١٩٤٢ز لە گوندی (نەلاس) دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە سابلاغ لای مەلا حوسێنی مەجدی، لەوێ هاتە (گەناو) لای مەلا صالّحی نەجیبی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) ماوەك لە (ئاغەلان) و ماوەك لە (نەلاس) و ماوەك لە (هەلوێ) دەرسی دەداوە، دوایی چووە (سەپیکان)، هەروەها لە (خولێسان) و لە (شاتمان) مەلا بوو، مامۆستا شاعیریش بوو، نازناوی نیژاوی بوو، وەك دەڵێ:

نیژاوی بێ بەلاّ بێ    شیعر دەبێ ئاوابێ

لە ئەنجامی نەخۆشیەکی درێژخایان کۆچی دوای کرد، لە گۆڕستانی گوندی (کاژی) سەرەوەی گۆڕی مەلا رەسولی زەکی یەکەم بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٨٦ – ٢٨٧.

## خصیف عبدالرحمان جزیری (٤٤٦)

ناوی خەصیفە، کوڕی عبدالرحمانی جزیرییە، خەڵکی شاری (حەڕان)ە، فەرموودەی لە موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕایتەوە، سالّی ١٣٧ك – ٧٥٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ١/٢٠٦.

## خضر ئیبراهیم شەمامەری (٤٤٧)

ناوی خضرە، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی عبداللّەی، کوڕی محەممەدی، کوڕی عەلی یە، سالّی ١٩١٣ز لە گوندی (مشار) هاتووتەدنیا

خوێندنی: مالّیان لە (مشار) باری کرد بۆ (شەمامەر) لەوێ لە لای باوکی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، پاشان تا قۆناغەکانی تەواوکرد، لە خزمەت چەند زانایان گەڕا، بەشێك لەوانە، ئەو زاتانەن: مەلا شێخ جەلالی ترپەسپیان،

مەلا محەممەدی چل هەوێزەیی، مەلا محەممەدئەمینی سوێری، مەلا عومەری کەوری، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، مەلا عبدالقادری ماجیدی، پاشان هاتە خزمەت شێخ مصطەفای (هەولێر) ماوە لەلای تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، لەگەڵ ئەو بەڕێزانە: مەلا سەید عبداللهی گردەسۆری و مەلا عبدالعزیز مەلا سولەیمان ئاشۆکانی و مەلا عەلی گۆمەگراوی.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (کەندارەقەل)، دوایی چووە (کەندار) لەوێ باری کرد بۆ (کەسنەزان)، ماوەکیش لە (مێرخوزار) بوو، ساڵی ١٩٥٨ز دەشتی بەجێهێشت، هاتە مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشیدی نوێ، لە گەڕەکی تەیراوە لە (هەولێر).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەنوەری سێبیرانی، مەلا عبداللهی گردعازەبانی، مەلا عبداللهی پەریێتانی، مەلا محیەدینی گۆران، مەلا جەلال عومەر، مەلا صەدیق کەونەباکی، مەلا عبدالرحمان ماستاوەیی، مەلا عبدالکریم بەرگێلی، مەلا محەمەد بیریژی.

کۆچی دوایی: مامۆستا بەردەوام بوو، لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، هەرچەندە پیربوو، نەخۆش بوو، دۆستی بە ڕاستی کتێب بوو، هەر خەریکی تەماشاکردنی توحفە و کتێبانی، شەریعەت و تەفسیری مەداریك بوو، تا لە ١٩٩٦/٣/٦ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە دوا بەجێما: عومەر و عوسمان.

سەرچاوە: النجم الزاهر ٦٨.

## خضر ئەبوبەکر مەهرانی (٤٤٨)

ناوی خضرە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی ئەحمەدی مەهرانی کوردییە، خەڵکی گوندی (محمدیە)ی جزیرەی بۆتانە، شێخەکی گەورەی ئەهلی تەسەووف بووە، لە (قاهیرە) دابەزیوە، پاشان چوویتە شاری (مەککە)ی پیرۆز، لەوێ ساڵی ٦٧٦ك – ١٢٧٧ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (الوظائف المعزية للمناقب المعزية)ی بۆ خەلیلی کوڕی قەلاوون داناوە، سەرەتایەکەی، بە (الحمدلله الذي جعل الملوك عماداً لحماية حوزة الدين...) دەست پێ دەکات.

مامۆستا زاتەکی دڵپاك و بە دین بووە، کەراماتی لیّ دەگێڕنەوە، لەوانە: مەلیك ظاهیر بیبەرس، پێش ئەوەی ببێتە مەلیك، لە مزگەوت دانیشتبوو چەفیەکی لەسەر بوو، خەریکی خواپەرستی بوو، شێخ پێی وت ئەتو دەبی بە مەلیك، کە بووە مەلیك زۆر ڕێزی لیّ دەنا و لە فەرمانی دەرنەدەچوو، نیازی هەر غەزایەکی کردبا پرسی پیّ دەکرد، ئەگەر ئاماژەی سەرکەوتنی بۆ کردبا سەردەکەوت، جار وابوو ڕۆژەکەی سەرکەوتنیشی بۆ دیار دەکرد، جارەك بۆ (کەرك) شێخ فەرمووی مەچوو، مەلیك بە گوێی نەکرد، لە ڕێگا لەسەر ئەسپەکە بەربۆوە ڕانی شکا.

پاشان دوو زمان و پیاو خراپان، چەند پۆغامیان بە شێخ هەڵبەستا، مەلیك دڵی لیّ شکا، ئاویتییە بەندیخانە، خەریك بوو لەسەری بدات، شێخ فەرمووی: بیّ منەت بە بمکوژە، خۆ مردنی من و مردنی تۆ لێك نزیکە، مەلیك سەرسام بوو لەبەر ئەوەی لە پێشدا زۆر کەراماتی لە شێخ دیتبوو، نەوێرا لەسەری بدات نەوەك ئەویش مردنی نزیك بێت، بەریشی نەدا لە بەندیخانە ماوە تا کۆچی دوایی کرد، مەلیکیش تەنیا بیست ڕۆژ دوای ئەو ژیا، ئەوەش بووە کەراماتێکی تر بۆ شێخ، لە لای هەندەك کەسانیش وایە، ئەو جۆرە شتانە جادوگەری و فێڵبازییە، بەڵام تەنیا ئەو دوو ووشەیە ناوەستێ بەرانبەر ئەو هەموو کەراماتی شێخان، مەبەستیش شێخی ڕاستی یە، نەك جادوگەر.

سەرچاوەکان:

١. جامع كرامات الأولياء ٢/ ٥٩

٢. الضوء اللامع ٣/١٦٢.

٣. معجم أعلام الكود ٢٥٧.

٤. مشاهير الكورد ١٩٤.

٥. شذرات الذهب ٥/٣٥١ – ٣٥٢.

٦. هدية العارفين ٥/٣٤٥.

٧. وفات الوفيات ١/٤٠٤.

٨. كشف الظنون ٢٠١٦/٢.
٩. البداية والنهاية ١٣ /٢١٢.
١٠.علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩٣ – ١٩٤.

## خضر ئەحمەد حەیدەری (٤٤٩)

ناوی خضرە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی حەیدەری ماوەرانی یە، لە خزمەت باوکی خوێندووە، هەر لەلای ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، کوڕە گەورەی باوکی بووە، لە زانست دەستی بالاّ بووە، لە هەموو جۆرە زانیارییەك شارەزا و مەلەوان بووە، حاشیەی لەسەر توحفەی ئیبن حەجەر هەیە، کوڕی ئەو زاتەش محەممەدە، ناسراوە بە: (أخرس – لاڵ)، حاشیەی لەسەر (خلاصة الحساب) هەیە، کوڕی وی خضرە ناسراوە بە محەممەد خضر حەیدەری، تەفسیری ئایەتی: ﴿الله نور السماوات والارض﴾ (نور / ٣٥) ی هەیە، یەك بەرگە، زۆر نایابە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٩ – ١٤٦.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠ – ٦١ – ١٩٣ – ٣٣٨.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٤٣.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢٩٦/٦.

## خضر ئەحمەد رودباری (٤٥٠)

مامۆستا خضر کوڕی ئەحمەدە، دەوروبەری ساڵی ١١٤٠ك – ١٧٢٧ز لە گوندی (رودباری) هەورامان هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتیبە سەرەتاییەکانی تەواو کرد، لە ١١٧٠ك لە قۆناغی کۆتایی چووە (قەلاّ چوالان) لای مەلا شێخ وەسیمی گەورە، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (هەورامان) لە ڕودبار نیشتەجێ بوو، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، چەندجار لەگەڵ (ئەمیر ئەحمەدسان) سەفەری (شیرازی) کرد لە کاتی

(کەریم خانی زەنـد) سـەرۆك بـوو، مامۆسـتا هـۆنراوەی دەوڵەتنامـەی گـۆرانی دانـاوە، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) تەرجومەی کردووە بۆ زمانی بابانی، ناوی ناوە (ئیقبال نامە)، هەروەها هۆنراوەی عەقیدەی داناوە، ساڵی ١١٩٧ك – ١٧٨٣ز تەواوی کردووە.

مامۆستا خەتێکی خۆشی هەبووە، لە هاوینەهـەواری (ژوونـی) ڕودبـار سـەحیحی ئیمامی موسلیمی بە مـاوەی پـەنجا ڕۆژ نووسـیتەوە، دەوری سـاڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١٩٤.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩١ – ١٩٢.

٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٣٤٦ – ٣٥٢.

## خضر ئەحمەد (نالی شاعیر) (٤٥١)

ناو ونژادی: نـاوی خضـرە، کـوڕی ئەحمـەدی شاوەیسـی یـە، تـیرەی میکـائیلی عەشیرەتی جافە، ساڵی ١٧٩٧ز لە گوندی (خاك و خۆڵ)ی شارەزور هاتووتەدنیا، خـۆی ناوی خۆی دەنێت لەم بەیتە شیعرە:

لەبی توو ئاوی بەقا، من (خضر)م      فەیضی توو ڕەحمەت و من سەوزەگیا

خوێندنی: بە شێوەی فەقێیانی کوردستان، بۆ خوێندن سوڕ و گەڕی داوە لە چەند حوجرەی فەقێیان، چوویتە شاری (سنە)، چوویتە (سابلاغ)، چوویتە (قەرەداغ) لای مـەلا شێخ محەممەدی (ابن الخياط)، وە لە تەکیەی قەرەداغ ریازیـاتی لـە لای شـێخ مـەلا عـەلی تەواوکردووە، ئەمجا چووە (هەڵەبجە) لای مەلا عبداللەی خەرپانی، دوایی چووە (سلێمانی) لە مزگەوتی سەید حەسەن، لای مـەلا عبـداللەی ڕەش، لـەوێوە چـووە خانـەقای مـەولانا خالـید، ماوەکی زۆر لەوێ مـاوە، نوسـراوێکی بنەماڵـەی شـێخ وەتمانیـان، حـاجی مـەلا محەممەدی حاجی عبدالرحمان بۆی هێنام، دەڵێ: {لە دەوروبەری ساڵی ١٨٢٠ (نالی) لـە گوندی شێخ وەتمانی خوێندووە، لەوکاتە لەگەڵ فەقێیەکان بە پیاسە دەچنە گوندی (باسە)

بە (خۆشکان)دا دەچی، ڕێگاکە دەکەویتە بن خانووی خاتوون (شەم) کە خۆشەویستی (نالی) دەبێت (شەم) فەقێیەکان نابینی، یەك سەبەت زبڵ فڕێدەدا، دەکەویتە سەر، سەروملێزەری نالی، هەموو ئەندامی لەشی پیس دەبێت، بەوبۆنەیە دەڵێ:

دوێنی چ بوو دەتدا بە زوبان لافی کەرامات
ئەمڕۆ نەدەمت بوو، نەدەمت بوو، نە دەمت بوو
(نالی) چی یە وامیسلی جوعەل غەرقی شیاکە
خۆتوو بە حیسابێ، وەکو پەروانە، شەمت بوو

(دەم)ی یەکەم بەمانا کاتە، (دەم)ی دووەم زاری یارە، (نەدەم) پەشێمانی یە، (جوعەل) قالۆچەیە، (شیاك) پیسایی یە، (پەروانە) پەپوولەیە، (شەم) مۆمە دەشێ مەبەستی شەمی خۆشەویستی بێت. واتە: کاتت بەفیڕۆچوو، زاری یارەکەت لە کیس چوو، پەشیمان بوویەوە، ئێستا وەکو قالۆچە خەریکی کۆکردنەوەی پیسایی، دەبووایە وەك پەپوولە، لە دەورەی چرا و ڕوخساری یارەکەت بسوڕابای تا دەسووتای، (نالی) دوای کۆتایی خوێندنی ئیجازەی وەرگرت.

پلەی زانیاری: (نالی) جگە لە مەلایەتی، شاعیرێکی پایەدار و چازان بووە، شیعرەکانی زۆر بەتام بووینە، هەرکەس بیان خوێنی، یان گوێی لێ ڕابگری، دیقەت لێ بکا هەست ڕاگری، دان بەوە دادەنێ کە (نالی) تەنیا تاقە سواری عەگیدی مەیدانە، تا ئێستا کەس تۆزی ڕێگای نەشکاندووە، من واتێ دەگەم نالی لە سۆران بێ وێنەیە، وەکو شێخ ئەحمەدی جزیری لە بۆتان و بادینان بێ وێنەیە، دانەکی دیوانی (نالی) دەستنووسمان لە لایە، مەلا عبدالحمید عەسکەری ساڵی ١٣٢٩ك – ١٩١١ز لە شاری (کۆیە)ی نووسیتەوە، ئەو دیوانە زۆرجاران چاپ کراوە، ساڵی ١٩٣١ز لە لایەن کوردی موکریانی، لە (بەغدا) چاپ کرا، دوای ئەو عەلی موقبیل لە (سنە) دووبارە چاپی کردەوە، ساڵی ١٩٦٢ز گیوی موکریانی لە (هەولێر) چاپی کردەوە، هەروەها ساڵی

١٩٧٦ز بە شەرحی مامۆستا عبدالکریمی مدرس (خوا لێی خۆش بی) وە لێکۆڵینەوەی فاتیح و محەممەدی کوڕی لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، لە (بەغدا) چاپ کرا.

(نالی) شانازی بە شیعرەکانی خۆی دەکات، دەڵێ:

کەس بە ئەلغازم نەڵێ خۆ کردییە، خۆ کوردییە
هەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی تالیبی مەعنا دەکا
شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی
کەی لە دیقەتدا پەتك، دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا

یا دەڵێ:

فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە
(نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە، دیوانی هەیە

لە دڵداریدا دەڵێ:

هەر جۆگە و جۆبارە کەوا سوور و سوێر بێ
جێ جۆششی گریانی منە، خوێن نەڕژاوە

لە پاڕانەوەدا دەڵێ:

ئەگەرچی کوردی دەوری شارەزووری قەسوەتم ئەمما
وەسیلەم (طەیبە)یە و حیلمی شەفیعی فەزڵی مەننانە

نالی و شاری مەککەی پیرۆز:

(نالی) چووە سەفەری حەج، مامۆستا مەسعود محەممەد دەڵێ: {لەو سەفەرە کە ساڵی ١٢٨٨ك - ١٨٧١ز لەگەڵ مەلا عبداللهی باپیرم یەکدییان دیتووە}، هەر لەو سەفەرە (نالی) هۆنراوەکی عەرەبی پێشکەش بە ئەمیری شاری (مەککە) شەریف (عبداللهی کوڕی عەون) کردووە، نموونەی هۆنراوەکە:

أزعجتني مزعاج سكني انزواء ودعتني إلى مخاض الفناء
أثقلتني بحمل ما فوق توقي من أشق الأعباء والأعياء

وأطالت في سحب ذيلي على ما قصرت عنه جبتي وردائي
زورت زورة الى الزوراء أو إلى الروم، أو إلى الشهباء
أو إلى (شهرزور) مسقط رأسي موطن العلو موطئ الآباء

گاڵتەی نالی لەگەڵ فەقێیان: (نالی) بە شێوەی گاڵتە، بۆ فەقێیەکانی باسی ئەوە دەکا، ئەگەر خەبەری موبتەدا جوملە بێت، پەیوەندی ضەمیری دەوێت بۆ موبتەداکە بگەڕێتەوە، ئەگەر هەبوو باشە، ئەگەر نەبوو، دەبێت بۆی دابنێی، لەو بابەتە، لە تاکە شیعرێك دەڵێ:

گۆشتی قەڵەو حوقەی بە چاردە پارە وەقتی گوتت حوقە (لەوی) دیارە

لێکدانەوەکەی بەم جۆرەیە:

(گۆشتی قەڵەو) موبتەدای یەکەمە، (حوقەی) موبتەدای دووەمە، (بەچاردە پارە) خەبەرە بۆ حوقەی، ئەو جوملەیە خەبەرە بۆ گۆشتی قەڵەو، واتە: حوقە لەوی (لەو گۆشتە)، ئەوە (ڕابیطە) پەیوەندییە خەبەر بە موبتەدا دەبەستی، بەڵام لادراوە و (حەزف) کراوە، چونکە دیارە وەك لە کتێبەکانی نەحو دەڵێن: {البر الكر بستين درهما}.

کۆچی دوایی: نالی لە گەڕانەوەی سەفەری حەج، هاتە (شام)، لەوێ باسی ڕووخانی میرنشینی بابان و هێرشە دڕندانەکەی عوسمانیانی بۆ سەر ناوچەکە بیست، زۆر پەرۆش و ناڕەحەت بوو، چاوی بەرایی نەدا بگەڕێتەوە کوردستان، بە خەم و پەژارەوە، ڕووی کردە (ئەستەمبۆڵ) لەوێ ماوە تا ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز کۆچی دوایی کرد، بارگەی بەرەو بارەگای خوای گەورە تێکنا.

سەرچاوەکان:

١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٣/٣٧ – ٤٣ – ١١٣ – ١٩٧.
٢. دەقەکانی ئەدەبی کوردی ٨١ – ٨٨.
٣. ئەدەبی کوردی ٢٦٨ – ٢٧٤.
٤. مشاهير الكورد ١/٢٠١.

٥. ژیناوەری زانایانی کورد ٣٢٠ – ٣٥٣.
٦. دیوانی نالی ٢٣ – ٧٤.
٧. تاريخ السليمانية ٢٤٧ – ٢٤٩.
٨. معجم أعلام الكورد ٢٥٨.
٩. دەستەوداماني نالی ٦.
١٠. دەنگی زانا ٥٤/ ٢٠٠١ – ٧٩ – ١٠١.
١١. الشيخ معروف النودهي ٣٧.
١٢. گولاّن ٢٧/ ١٩٩٨ز – ١٦٥ – ١٦٨.
١٣. ڕاپۆرتی مەلا محەمەد شێخ وەتمانی

## خضر ثەروان (نابینا) (٤٥٢)

ناوی خضرە، کوڕی ثەروانی، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی عبداللەی نابینایە، ساڵی ٥٠٥ك –١١١١ز لە گوندی (توماث)ی جزیرە هاتووتەدنیا، لە (میافارقین) پێگەیشتووە، ماوەك لە (بەغدا) دەرسی شەریعەتی خوێندووە، لە (فیقە) و (فەرموودە) شارەزا بووە، لە ئەدەبیات بە توانا بووە، ساڵی ٥٨٠ – ١١٨٤ز لە جزیرە کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/ ٢٢٩.
٢. الأنساب ١/ ٥١٧.
٣. معجم البلدان ٢/٥٩.
٤. معجم أعلام الكورد ٢٥٧ – ٢٥٨.
٥. تاريخ مشاهير كورد ١/٥٣.

## خضر حەسەن زەرزاری (٤٥٣)

ناوی خضرە، کوڕی حەسەنی، کوڕی عەلی یە، عەشیرەتی زەرزاری یە، ساڵی ٦١٦ك – ١٢١٩ز هاتووتەدنیا، زانایەکی بەڕێز و سەخی و چاو بلّند بووە، سەرۆکی

قازیان بووە، لە دەوری مەلیك زاهیر بیبەرس لە (میصر) کرا قازی، پاشان لەگەڵ مەلیك ناکۆکی لێ پەیدا بوو، دەستەڵاتی لێ ستاندرا، لە دەوری مەلیك سەعید کرا (وەزیر) دوایی لادرا، دووبارە کراوە وەزیر، دووبارە لادراوە، ئەمجارە کرا قازی وڵاتی (میصر) زۆر پێ نەچوو کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/ ٣١٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩٢.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٥٧.

## خضر داود شارەزوری (٤٥٤)

ناوی خضرە، کوڕی داودی قازی یە، خەڵکی (شارەزوور)ە، مامۆستا دارەقوطنی فەرموودەناس دەڵێ: {ئەو زانایە لە شاری (مەککە)ی پیرۆز نیشتەجێ بوو، کتێبی (النسب)ی گێڕایەوە لە زوبەیر کوڕی بەکار[1]، هەروەها کتێبی (علل)ی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی لە ئەثرەم[2] گێڕایەوە}، کەواتە لە گەڵ ئەثرەم و زوبەیری کوڕی بەکار هاوچەرخ بووە.

سەرچاوە: الأنساب ٣/ ٤٩٠.

## خضر رەسول شێخەلمارینی (٤٥٥)

ناوی خضرە، کوڕی رەسولی، خەڵکی گوندی (شێخەلمارینە) سەر بە قەزای چوارتایە، خزمەتێکی زۆری ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە، قوتابخانەی هەبووە و دەرسی داوە، لە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی دریغی نەکردووە، تا کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی لە پاش بەجێمان، لەوانە: مەلا مەحمود: زانایەکی بەرز بوو، ئەویش کۆچی دوایی کرد، مەلا عبداللهی کوڕی جێگری بوو، ئەویش کۆچی دوایی کرد، مەلا

---

[1] لە ٢٥٦ك کۆچی دوایی کردووە.

[2] لە ٢٦١ك کۆچی دوایی کردووە. وە فەقێی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بووە.

عبدالرحمانی کوڕی جێگری بوو، ئەویش لە گوندی (سالیاوا) کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕی جێگری بوو، ساڵی ١٩١٢ز لە دایك بووە دەرسی لە لای باوکی و شێخ عەزیزی (دۆلپەمۆی) خوێندووە، لە شێخەلمارین کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، ساڵی ١٩٧٨ز ڕژێمی بەعس بە زۆری گواستییەوە بۆ کۆمەڵگای (سەید صادق)، مێژووی کۆچی دوایی لە لام دیار نیە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩٤ – ١٩٥.

## خضر عەلی هەولێری (٤٥٦)

ناوی خضرە، کوڕی عەلی، کوڕی محەممەدی زیندرووە، خەڵکی (هەولێرە) چوویتە (بەغدا) لای مامۆستا موبارەك شارەزوری خوێندووە، هاتووچۆی شێخەکانی کردووە، پاشان چوویتە (مەککە)ی پیرۆز، کرایتە سەرۆکی شێخەکان، دەرسی فەرموودەی داوە ئیجازەی بە چەند زانایان داوە، ساڵی ٦٠٨ك – ١٢١١ز لە (مەککە) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٢٥٦.

٢. تاريخ أربيل ١/١٨٥ /٢/٣٠٧.

## خضر عومەر بەرزنجی (٤٥٧)

ناوی خضرە، کوڕی سەید عومەری، کوڕی سەید ئەحمەدە، لە سەیدەکانی (ڕەشوان)ە، ساڵ ١٨٧٨ز لە گوندی (گەڕە شێخان) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، قۆناغی سوختەیی بڕی، ماوەك چووە (کۆیە) لای مەلا عبداللّٰەی جەلی، ماوەك لە خزمەت شێخ ئەبوبەکری (هەرشەمی) خوێند، کۆتایی بە خوێندن هێنا، مەلایەتی لەو گوندانە کرد: مێرخوزار، سەرگەڕان، کەسنەزان، لهێبان، لەهەموو شوێنەکانیش مەدرەسەی فەقێیانی هەبوو، بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا شێخ جەلالی

تریەسپیان، مەلا سولەیمانی سنکاوی، مەلا سەعیدی دووشیوانی. مامۆستا دەستێکی بالاّی هەبوو لە شەریعەت و فەرائیز، کوڕێکی لە پاش بەجێما، ناو (ئیسماعیل).

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## خضر نەصر هەولێری (٤٥٨)

ناوی خضرە، کوڕی نەصرێ، کوڕی عەقیلی، کوڕی نەصری (هەولێری)یە، ساڵی ٤٧٨ك – ١٠٨٥ز هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) شەریعەتی تەواوکردووە، گەڕایتەوەن (هەولێر) ئەبومەنصور سەرفتەکین جێگری خاوەنی هەولێر ساڵی ٥٣٣ك – ١١٣٨ز لە (قەلات) قوتابخانەی بۆ دروست کرد، مامۆستای دانا بە (مدرس)، مامۆستا یەکەم مەلایە لە هەولێر دەرسی داوە لەو قوتابخانەیە، ماوەك چووە (دیمشق) پاشان گەڕاوە (هەولێر)، (٢٦) وتاری پێغەمبەری (د.خ) لە کتێبێك کۆکردیتەوە، لە شەوی هەینی ١٤ مانگی جیمادی دووەم ساڵی ٥٦٧ك – ١١٧٢ز کۆچی دوایی کرد، لە قوتابخانەی خوار قەلات بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٢/١٠.
٢. طبقات المفسرين ١/٣٦٣.
٣. البداية والنهاية ١٢/٣٠٤.
٤. تاريخ أربيل ١/٣٣٤ – ٣٧٠.
٥. أربيل في مختلف العصور ٦٩.
٦. أربيل في العهد الأتابكي ٥٩،١٩٩،٢٢٥،٢٢٨،٢٤٧،٢٤٨،٢٦٨،٢٨٦،٢٨٧.
٧. الأعلام ٢/٣٥٤ /١٠/ ٨٢.
٨. معجم أعلام الكورد ٢٥٦.
٩. هدية العارفين ٥/٣٤٥.
١٠. مشاهير الكورد ١/٢٠٠.

١١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٨٩ -١٩١.
١٢. معجم المؤلفين ٤/١٠٢.
١٣. شذرات الذهب ٥/٨٦.
١٤. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٥٢.
١٥. طبقات الشافعية ١/١١٨.
١٦. الكامل، پەراوێز ١٢٩.

## خەلیل ئیسحاق کوردی (٤٥٩)

ناوی خەلیلە، کوڕی ئیسحاقی، کوڕی یەعقوبە، مەزهەبی مالیکی بووە، زانایەکی چاك و بەدین و لە خواترس بووە، لە (میصر) دەرسی داوە، ساڵی ٧٦٧ك – ١٣٦٥ز کۆچی دوایی کردووە. چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. شەرحی (مختصر)ی ئیبن حاجیب، شەش بەرگە.
٢. شەرحی (ألفیة)ی ئیبن مالیك.
٣. مناسك الحج.
٤. مختصر في الفقه المالكي.

سەرچاوەکان:

١. درة الحجال في أسماء الرجال ١/٢٥٨.
٢. معجم المؤلفين ٤/١١٣ – ١١٤.
٣. كشف الظنون ٢/١٦٢٨ – ١٨٣١ – ١٨٤٢ – ١٨٥٥.

## خەلیل حوسێن سعێرتی (٤٦٠)

ناوی خەلیلە، کوڕی مەلا حوسێنی، خەڵکی (هیزانە) نزیك شاری (مەکسێ) مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ١١٦٧ك – ١٧٥٣ز هاتووتەدنیا. دەرسی لە لای موفتی (ئامێدی) مەلا مەحمودی بادینی خوێندووە، ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە، زاناترین و چاکترین زانای سەردەمی خۆی بووە. دانراوی زۆرن، لەوانە:

١. أزهار الغصون.
٢. أصول الحديث.
٣. تأسيس قواعد العقائد.
٤. تبصرة القلوب من كلام علام الغيوب: تەفسیرە.
٥. تفسير القرآن الكريم.
٦. زبدة ما في فتاوي الحديث.
٧. شرح الشاطبية.
٨. شرح الهمزية.
٩. محصول المواهب الأحدية.
١٠. القاموس الثاني في النحو والصرف والمعاني.
١١. منهاج السنة السنية.
١٢. ضياء بصيرة قلوب الحروف في التجويد والرسم وفرش الحروف.
١٣. مختصر شرح الصدور في الموت وأحوال القبور.
١٤. رسالة المنطق.
١٥. ملخص القواطع والزواجر.
١٦. المنظومة الزمردية.
١٧. نبذة من المواهب المدنية في الشطحات الوحدة الذاتية.
١٨. منظومة الخبية في المناظرة.
١٩. رسالة المعفوات.
٢٠. رسالة الوضع.
٢١. الكافية.
٢٢. ظروف بە کوردی.
٢٣. ئیساغۆجی بە کوردی.

٢٤. هۆنراوەی (نهج الانام) بە کوردی ساڵی ١٣٣٧ك لە تورکیا چاپ کرا.

٢٥. أصول الفقه.

٢٦. المختصر في الفقه لاختلاف الشافعي والحنفي: وە لەم نووسراوە ئەو زاراوانەی بەکار هینایە: (قش) قال الشافعي، واتە: فەرموودەی شافیعی یە، (قح) قال الحنفي، واتە: فەرموودەی حەنەفی یە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٥٩ك – ١٨٤٣ز ماڵئاوایی یەکجاری لە دنیا کرد، بارگەی خۆی تێکنا بەرەو بارەگای پەروەردگار. کوڕێکی مەلای هەبوو ناو مصطەفا، ئەویش دوو کوڕی مەلای هەبوو، مەلا حوسێن و مەلا حامید.

سەرچاوەکان:

١. الأعلام ١/ ٢٩٥.

٢. معجم أعلام الکورد ٢٦١.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٥٢٦ – ٥٣١.

٤. هدیة العارفین ٥/٣٥٧.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١١٦ – ١١٨.

٦. مشاهیر الکورد ١/٢٠٨.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدین ١٩٣.

٨. معجم المؤلفین ٤/١١٧.

٩. فهرس مخطوطات مکتبة الأوقاف المرکزیة في السلیمانیة ٢/١٧٣ – /٤/١٦١.

## خەلیل رەسول ( مخلصی شاعیر ) ( ٤٦١ )

ناوی خەلیلە، کوڕی رەسولی، کوڕی مصطەفایە، عەشیرەتی (سنجاوی)یە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (شۆڕەزەرتکەی) کەندیناوە، هاتووتەدنیا، خۆی پێناسەی خۆی دەکات دەڵێ:

کوردم و سنجاوییە تیرەم، لە صنعەتدا مەلام

نیشتمانمانە عێراق و شاری هەولێرە لیوام

خۆشە ناوی ناحییەم قوشتەپەیە دێم دووسەرە

بێ ڕەزابوونی خودا، ناکەم تکای هیچ لای خودام

خوێندنی: لە منداڵییەوە باوکی کۆچی دوایی کرد، دایکی بۆ خوێندن ناردیە گوندی (دووسەرە) لای مامی مەلا ئەبوبەکر، دوایی چوو (کەندار) لای مەلا ڕەشیدی موکریانی، دوایی چووە (سوریژە) لای مەلا عبدالقادر، دوایی چووە (پیرداود) لای مەلا محەممەد ئەمینی سوێری، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، ماوەکیش لای مەلا ئەحمەدی ڕەش و ماوەك لە لای مەلا شێخ جەلالی ترپەسپیانی خوێند، پاشان چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لە (هەولێر) لای مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، ماوە لە خزمەتی تا ساڵی ١٩٤٣ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: یەکەم جار لە (دووسەرە) جێگای مەلا ئەبوبەکری مامی بووە مەلا، ماوەکی زۆر لەوێ مەلا بوو، دەرسی فەقێیانی دەداوە، عبدالفتاح ئاغای گوندی زۆر یارمەتی دەدا و چەند کتێبی بۆ کڕی، دوایی بووە مریدی شێخ مصطفای نەقشبەندی لە (هەولێر)، خۆشویستنی تەریقەت کاری لێ کرد، بەرە بەرە لایەنی سۆفیاتی بەهێز بوو، لە ئەنجامدا وازی لە مەلایەتی هێنا، دووسەرە و منداڵەکانی بەجێهێشت، بە تەنیا هاتە خانەقای شێخ لە (هەولێر)، بەڵام جەنابی شێخ حەزی دەکرد، مەلایەتی بکا، ساڵی ١٩٦٣ز کردیە مەلا لە مزگەوتی حاجی طاها قەساب لە هەولێر، ماوەك لەوێ بوو، ڕۆیشت چووە (فەللوجە) لای مەلا شێخ عبدالعزیز سامەررائی، لەوێش لەگەڵ ئەوان چووە (سوریا) بۆ سەردانی شێخی (نەبەهانی)، گەڕانەوە (فەللوجە) مامۆستاش هاتەوە هەولێر، لە خانەقای شێخ نیشتەجێ بوو، خەریکی خواپەرستی بوو، زۆربەی حاشیەکانی سەر هەردوو بەرگەکانی (جمع الجوامع)ی لەو کاتە نووسییەوە و دانیان، پاشان لەسەر فەرموودەی (شێخ) چووە خانەقای (شەقڵاوە) بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و خەتم کردن، لەو

کاتە مامۆستا عبدالمجید گراوی زۆر جاران سەردانی دەکرد، پاشان مامۆستا خەلیل توشی نەخۆشی هات سەرما کاری لێ کرد، نەیتوانی لە (شەقلاوە) بمێنێ، هاتەوە خانەقای شێخ لە (هەولێر) بردیانە نەخۆشخانەی رزگاری، لە ئەنجامی نشتەرگەری دەروونی لە بەرواری ٥/٦/١٩٨٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گردی (پیرداود) بە خاك سپێردرا.

دکتۆر شێخ عبدالله نەقشبەندی (خوا لێی خۆش بی) لە بەغدا ئەم پارچە شیعرەی بەم بۆنەیە نارد، بۆ سەرەخۆشی سۆفییەکان و کەس و کاری مامۆستا، دەقەکەی ئەوەیە:

بەخێرچی، یا بەخێربێ لاوی لاوان     لە هەرجێ بێی، بەنازی هەردوو چاوان
وەبیرت دێ کە دەمگۆ هیچ مەترسێ     رەز و دارە و کولیك و باخی سێوان
کە خوات یاربی لە هەر کۆی بی بەهەشتە     لە کوردستان، لە دەشتێ، یا لە کێوان

نەساغ کەوتی پزیشك نەیدەزانی     چییە چ بووە لەنێو جەرگ و هەناوان؟
بە ناچاری چەقوی هێنانە گۆڕێ     ئەوەی ئازابوو ئەو دەرچوو لە نێوان
ئەوەی دیداری یارانی گەرەك بوو     لە رێگا نەیدەویست مانی بە مێوان
ئەتوو (مخلص) برای گەنجیم و پیری     ئەوا رۆیشتی من ماوم لە ناوان
هەموو رۆژ یادی جارانت دەکەم من     بەیانی و نیوەرۆ هەم نوێژی شێوان
بوێژی کورد و کوردستان من وتۆ     بە گەنجی کو بوو وامان و نەشێوان

کە (وافی) بوو لەوێ رۆ بیر و پەنجەت     دەپارێزن زمانی پاکی باوان
زبانی دە و (قەراج) و (کەندێناوە)     بە وێژەی تو دەهاتە زار و لێوان
چ نەخشێکە هەموو پەندێکی نووسیت     چ ئەزمانێکە تۆ کردت بە دیوان

لە بیرم ناچی سەیرانی بوواران     لە (زار مفتاح) و پێچی جۆگە ئاوان
لەوێش هەر (پیری خواناسان) بوو (مخلص)     من و تۆی کردە شەیدای کەند و شیوان
براتە (هەرشەمی) چاوی لە رێتە     بەخێربێی یا بەخێرچی لاوی لاوان

(بەغدا) سێشەم (١٥)ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ١٤٠٥ك ١٩٨٥/٦/٤ز

هەروەها (بێ دڵ)ی شاعیریش (١٢) دێڕە شیعری نووسیوە، بە ناوی شیوەن بۆ (مخلص)، لە کۆتاییدا دەڵێ:

وا لە مێژووی کۆچی ئەودا چوومە دەریای ئەبجەدی

{لیَ ببیتە باغی جنة} هاتە دەر دوڕڕی سەمین

١٩٨٥ز

مامۆستا عبداللە فەرهادیش پێنج خشتەکی کوردی و سەردولکەی عەرەبی بۆ نووسیوە.

شاعیراتی (مخلص): مامۆستا خەلیل، جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاکیش بووە، یەکەم جار نازناوی (وافی) بۆ خۆی دانا دوایی بیستی شاعیری تر هەیە بەو نازناوە، ئەمجارە (مخلص)ی دانا، هەرچەندە لە کێشەکە دەرنەچوو، چونکە شاعیری تر هەیە بە نازناوی (مخلص) جگە لە مامۆستا خەلیل.

شیعرەکانی (مخلص) دوو قۆناغیان هەنە:

قۆناغی یەکەم: کاتی گەنجی: زۆربەی شیعرەکانی ئەو قۆناغە باسی لاوێتی و یار و شۆخ و قەراج و مەڕ و بەرخ و بێری و هەوری و کۆڤی و شەدە و ئەمانە، وەك دەڵێ:

کە قاڕە قاڕی مەڕ هات، هەروەك هەوری بەهاری

هێنایە خوار لەسەر سەر، ئەم شۆخە کۆڤی لاری

بۆمان هەیە بڵێین ئەم جۆرە شیعرە تەنیا ئێ دەوری گەنجی نیە، بەڵکو کاری لێ کردووە، تا سەرەتای ڕۆژانی پیری، وەك دەڵێ:

(مخلص) ئەگەرچی پیرە قامەتی واچەماوە

بۆ گرتنی غەزالان مەیلی لە کەیف و ڕاوە

قۆناغی دووەم: کاتی سۆفیاتی و دوا عەمری: شیعرەکانی ئەو قۆناغە زۆربەیان ئاماژەنە بە شێخ مصطفای نەقشبەندی، کە شێخی خۆیتی، باسی خۆشویستنی خوایە،

دوورکەوتن لە ئارەزووی نەفس و شەیتانە، گازاندەنە لە خووڕەوشتی ناهەموار و هاوڕێی خراپ، لە هەردوو قۆناغان شیعرەکانی (مخلص) زۆر ڕێك و بە کێش و قافیەنە، بە تام و بۆنە، حەزی لە جوانکاری لە نێوان وشەکان بووە، وەك دەڵێ:

حەقیە دڵ بۆ پارە پارە پارەبی هەر قرەی بێ پارە با سەر پارەبی

(پارە)ی یەکەم: پارەی شت کڕینە، (پارەپارە)ی دووەم: پارچەپارچەبوونە، (پارە)ی سییەم: بە هەمان شێوەی پارەی یەکەمە، (پارە)ی چوارەم: سەپانە گەنم و جۆ دەدوری، بۆیە دەڵێ: (قرەی) واتە دوا سەپانی دواکەوتووی (سەرپارە) سەرۆکی سەپانانە.

(مخلص) سواری عەگیدی ڕەوانبێژی بووە کەم کەس توانیوویەتی لە کاتی قۆشمە تۆزی بشکێنی، لە سەر کتێبی (تشریح) و حاشیەی (منە)ی نووسیوە:

(تشریح) ڕوخ و (منە) و موو (قەید)یێ سییەم خالی

کێ دەبتە (ئەفەندی) بێ حەلکا هەموو ئیشکالی

مەبەست لە ئەفەندی جەنابی مەلا ئەفەندی کچك مەلای هەولێرە، کە زۆر شارەزا بووە لەو کتێبانەی باسی ئەستێرەناسی دەکەن.

بەرهەمەکانی: (هۆنراوەکانی کوردی)

١. دیوانی باغی لاوان: نوسخەکی دەستنوسی مەلا طاهیری کەندارەقەڵان لەلایە، (مخلص) خۆی دەڵێ:

(باغی لاوان) جەننەتێکە، گەر بە دڵ یاخۆ بە چاو

چیت هەوەس بێنی هەمووی تێدا هەیە پوختە و تەواو

(باغی لاوان) ناوی دیوانی (خەلیل) سنجاوییە

ئەو خەلیلەی وا لە نێو ئەشعار بە (موخلیس) ناوبراو

٢. چوارینەکان.

٣. تاکەکان: ئەوانەشمان لەلایە.

٤. دیوانی شیعر: جگە لەوانەی سەرەوە.

٥. ئیسلامی ڕاست.

٦. عەقیدەی کوردی: ئەوەشمان هەیە، بەڵام زۆر کورتە.

٧. دین و دنیا.

٨. مەولوودنامە: گێوی موکریانی لە هەولێر چاپی کرد.

٩. هیجرەتنامە: سەرەتایەکەی دەست پێ دەکات بە:

شاهم شاهێکە شاهی شاهانە قەیسەر و کیسرا لە لای گەدانە

د. فائیز مەلا بەکر لە گۆڤاری دەنگی زانا ژمارە ٦٨/٢٠٠٨ز بەلاوی کردەوە، وە پاشان لێکۆلینەوەی بۆ کراوە لە لایەن دکتۆر ئیبراهیم وە بە چاپی گەیاندووە.

کتێبە عەرەبییەکان:

١٠. مآثر الأبرار.

١١. موائد الفوائد.

١٢. مجمع العقائد.

١٣. قطف النظيف: شەرحی تەصریفی مەلا عەلی یە لە زانستی (صەڕف)، لە (هەولێر) چاپ کرا، دووبارە لە (سنە)ی ئێران چاپ کراوە.

پەراوێزە عەرەبییەکان:

١٤. حاشیە لەسەر (سیوطی) تا باسی (نەواسیخ).

١٥. حاشیە لەسەر فیعلی (سعداللە)ی گەورە کە ناسراو بە: (حدائق الدقائق).

١٦. چەند حاشیە لەسەر تەصریفی مەلا عەلی و قزلجی.

١٧. چەند حاشیە لەسەر جمع الجوامع.

١٨. چەند حاشیە لەسەر شەرحی مەنهەج.

١٩. چەند حاشیە لەسەر عبداللە یەزدی.

٢٠. چەند حاشیە لەسەر کەمالی شەرحی شافیە.

لەو حاشیانە دەنووسیت: (سنج) کورتکراوەی سنجاوی یە عەشیرەتی خۆی.

سەرچاوەکان:
١. مێژووی ئەدەبی کوردی ٧/١٦٩ – ١٨٢.
٢. النجم الزاهر ٦٦.
٣. دەستەگوڵ.
٤. مێرغوزار.
٥. قطف النظیف / پێشەکی.
٦. دەنگی زانا، ٦٨/٢٠٠٨ز ١٦ – ٣٥.
٧. دیوانی باغی لاوان / کۆیی

## خەلیل عبد اللە رەسول گۆڕەمەڕی (٤٦٢)

ناوی خەلیلە، کوڕی مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا رەسولی، کوڕی مەلا ئەحمەدی چەکۆیی یە، دەستی بە خوێندن کرد، تا کتێبی عبداللە یەزدی لە خزمەت باوکی بوو، پاشان هاتە (کۆیە)، لەوێ چووە (کەرکوك)، لەوێ هاتە (هەولێر) لای مەلا ئەفەندی لە (قەلات)، پاشان گەڕاوە (ئێران) لای مەلا وەسیمی سەردەشتی لە مزگەوتی ڕۆستەم بەگ لە (سابلاغ)، دوایی چووە لای شێخی بورهانی ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (گۆڕەمەڕ) لە شوێنی باوکی دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، پاشان گوندی (میراوە) سەر لە نوێ دامەزرا مامۆستاش بۆ وێندەر باری کرد، خانوو و بەرە و مزگەوت و حوجرەی فەقێیانیان بۆ دروست کرد، بە هەمان شێوە دەستی کرد بە دەرسدانەوە، چەندان فەقێی تێگەیاند و پێگەیاند وەکو: مەلا رەسولی کەرەمداری، مەلا سەید حەسەنی پارسایی، مەلا حەسەن مودەرریسی موتڵەق، مەلا رەسولی مەعروف زێوەیی، مەلا عبداللەی باغ شیرن، لەگەڵ زۆرانی تر.

پلەی مەلایەتی: مامۆستا مەلایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، یەك بوو لە چوار مەلایەکانی شەریعەت زان، سێیەکانی تر ئەو بەرێزانەن: مەلا شێخ محەممەدی خانەقا،

مەلا عبدالعزیز موفتی سەقز، مەلا سەعید موکریانی، هەروەها لـە ئەستێرەناسـی دانـراوی خۆی هەیە.

کۆچی دوایی: لە ئەنجامی نەخۆشییەکی درێژخایان، لـە (مـیراوە) کۆچـی دوایـی کرد، لە گۆڕستانی (گۆڕەمەڕ) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٩٢ – ٢٩٤.

## خەلیل عبدالله سعێرتی (٤٦٣)

ناوی خەلیلە، کوڕی عبـداللّٰهیـە، خـەڵکی شـاری (سـعێرتە)، زانایـەکی مـەزنی مەزهەبی شافیعی بووە، تەفسـیری قورئـانی پـیرۆزی هەیـە، بـەناوی (التفسـیر الخلیلـی)، مامۆستا ساڵی ١٢٥٢ك – ١٨٣٦ز لە ژیاندا بـوو، دوای ئـەو بـەرواره کۆچـی دوایـی کردووە.

سەرچاوە: هدیة العارفین ٥/٣٥٦.

– د –

## داود سولەیمان دێرەیی (قازی داود) (٤٦٤)

ناوی داودە، کوڕی مەلا سولـەیمانی، کوڕی مەلا خدرە، زانایەکی بـەرز و پایـەدار بووە، لە سەردەمی حکومـەتی عوسمـانی لـە (دێـرە) – کـە دەکەویتـە ڕۆژئـاوای چـیای سەربەن، قەڵاتێکی کەونی پاشای کۆرەی لیَ یە – قازی بووە، برادەراتی بتـوونی لـەگـەڵ مەلا ئیسحاقی هەولێری هەبووە، کە ساڵی ١٨٧٠ز لـە هـەولێر مـوفتی بـووە، هـەروەها لەگەڵ مەلا ئەحمەدی (دێرە بڕوشە) هاوچەرخ بـووە، جارێـك دەربـارەی تـەڵاقی پیاوێـك فەتوایان یەکدی گیرنابی، مەلا ئەحمەد نامەك بۆ مەلا عومـەر ئەفەنـدی خـەیلانی (ڕوانـدز) دەنێری لەو بابەتە، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە لە (جواهر الفتاوی)ی مامۆسـتا عبـدالکریم (مدرس) ٣/٢٩٨ – ٣٠٧ بڵاوکرایەوە، هەروەها لـەگەڵ مـەلا عبـداللّٰهی جـەلی کـۆیی برادەر بووە، محەممەد عەلی قەرەداغی، لە بوژاندنەوەی مێژووی زانایـانی کـورد ٦/٨٨ – ٨٩ دەڵێ: {داودی کوڕی سولـەیمان شـەرحی وەضعی مامۆستا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمەی

کردووە سەرەتایەکەی بە: (الحمد لمن أنطق لسان عبده بآیات إجلاله....) دەست پێ دەکا}، من بە دوور نازانم ئەو زاتە جەنابی قازی داودی دێرێ بێ.

(قازی داود) ساڵی ١٨٥٦ز دەرسی فەقێیانی داوە لە (دێرە)، یەك لەوانە: مەلا سعدالله ی کاوانی زراری بووە، کە پاشان بووە جێگری مامۆستا، هەروەها محەممەد ئەسعەد ئەفەندی کە شێخی تەریقەتی نەقشبەندی بووە لە هەولێر، یەکە لە فەقێیانی ئەو زاتە.

پلەی زانیاری قازی داود، لە چەند بەڵگە:

١. بەڕێز عبدالرقیب یوسف ڕاپۆرتەکی بۆ هێنام ئیمزا کرابوو لە لایەن چەند زانای بەرزی ئەو سەردەم، کە بریتییە لە بەڕێزان، مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی، مەلا سەید ئەحمەدی زیارەتی، مەلا ئەحمەدی شەوەکی: مەلای بەحرکە، مەلا محەممەد موفتی دێرە: قازی داودی دێرێ، بە پێی ئەو بەڵگەنامەیە دەردەکەوێ کە: قازی داود هاوشانی ئەو زاتانە بووە.

٢. کاکم مەلا طیب دەڵێ: {ساڵانی ١٩٧٠ز لەگەڵ بەڕێزان: مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری و مەلا فائیز مەلا عبداللەی هەولێر چووینە (کەرکوك) میوانی مامۆستا عبدالمجید قوطب و شێخ عبدالجبار شێخ باقی بووین، باسیان کرد: لێرە بنەماڵەی (خادم السجادة) هەنە دوگوردی پیرۆزی خۆشەویستی خوایان لە لایە، (بۆ زانیاری تەواو بڕوانە ژیاننامەی سەعدی خضر لەم مێژووە)، ئێمەش بەهۆی ئەوان بە خزمەت ئەو زیارەتە گەیشتین، هێنایان تۆمارێك نووسرابوو، ئەو دووگوردە، هی پێغەمبەرە (د.خ) بەخشیتی بە ئیمامی عوسمان، پاش ئەو هەڵگیراوە لە لای نەوەکانی ئێستا لە لای عەلی ڕەفیقە، چەند ئیمزای لەسەرە، لەوانە: شێخ مەحمودی ئالوسی: خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) وە چەند زانایانی تر، لەوانەش یەك جەنابی قازی داودی (دێرێ)یە، ئەوەش وادەگەیەنێت قازی لە دوورەوە ناسراوە و ئیمزای شان بە شانی ئالوسی لەسەر شتی وا گرینگ ڕۆیوە، ئێمەش کەسین، بەڵام بێ کەسین.

قازی داود هۆنراوەی فارسی هەیە، بەناوی (بیـا داود)، بەشـێك لـە نـەوەکانی قازی داود، ئەوانەی بووینە مەلا:

١. مەلا طاها مصطفا کۆڕی: لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٢. مەلا یاسین مصطفا مەلا سولەیمان قازی داود: برای مەلا طاها.

٣. مەلا عبدالرحیم: مەلایەکی چاك و زیرەك بوو، لە گوندی (مام خاران)ی ناوچـەی زرارەتی مەلا بوو.

٤. مەلا بیلال: لە (گردی ماوان)ی زراریان مەلایە، یەحیای کوڕیشی مەلایە.

٥. مەلا ئیبراهیم مەلا سەعید مەلا سولەیمان قـازی داود: بانگـدەر بـوو لـە مزگـەوتی پیربار ئاغا لە هەولێر.

٦. مەلا یوسف عبدالله رەسول فەقێ شێخ مەلا عبـدالرحیم قـازی داود: پـێش نوێـژ و ووتارخوێنە لە مزگەوتی حاجی سەنیە لە هەولێر.

سەرچاوەکان:

١. أربیل في مختلف العصور ١٠٨.

٢. علماء ومدارس في أربیل ٨٢.

٣. جواهر الفتاوي ٣/٢٩٨ – ٣٠٧.

٤. عنوان المجد ١٤٧.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٨٨ – ٨٩.

## داود شەهابەدین گۆرانی (٤٦٥)

ناوی داودە، نازناوی شەهابەدینە، گۆرانی یە، لە قوتابخانەی (شـامی)یەی دیمشـق دەرسی داوە، پاشان چووە (ئوردن) لە قوتابخانەی (سەلط) دەرسی دەدا، زانایەکی بە دیـن بووە، ساڵی ٧٣٤ك – ١٣٣٣ز کۆچی دوایی کرد، کتێبەکانی خۆی هەموو وەقف کرد، لە سەر قوتابیەکانی (سەیفییە) لە (سەلط).

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٢٧١.

## داود عبدالصمد مەجزوب ( ٤٦٦ )

ناوی داودە، کوڕی عبدالصمدە، ناسراوە بە (مەجزوب) لە (مەککە)ی پیرۆز دابەزیوە، لە مزگەوتی بەیتی خوا دەرسی داوە، بە داخەوە ماوەك پێش مردنی زەینی تێکچوو شێوا لە ٨٦١ك – ١٤٥٦ز لە مەککە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٠٢.

٢. الضوء اللامع ٣/١٩١.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٧٠.

## داود عبدالله بێتواتەیی ( ٤٦٧ )

ناوی داودە، کوڕی مەلا عبداللهی، کوڕی مەلا حوسێنی بێتواتەیە، زانایەکی بەرز و بە دین بووە، سەدو دوازدە ساڵ ژیاوە، بەو تەمەنە درێژە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە لە تەمەنی هەشتاو دوو سالیدا نووسخەکی قورئانی پیرۆزی بە خەتە خۆشەکەی نووسیتەوە لە (بێتواتە) کۆچی دوایی کرد، هەر لەوێ بە خاك سپێردرا، دوای ئەو مەلا شێخ محەممەدی کوڕی لە جێی دانیشت، دوایی چووە (زێوە) ساڵی ١٨٩٢ز چووە (کونەفلوسە) لەسەر داوای شێخ نەبی (ماویلی)، لەوێ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. نادي الإسلام ٢ – ٤.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٥.

## داود عەلی کوردی ( ٤٦٨ )

ناوی داودە، کوڕی عەلی یە، نازناوی بەهائەدینە، مەزهەبی شافیعی یە، لە شاری (حەلەب) دابەزیوە، هەر لەوێ شەریعەتی خوێندووە، گەیشتوتە پلەی بەرز، بە یەکە زانای سەردەمی خۆی ژمێردراوە، بەردەوام بووە لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، ساڵی ٨٠٣ك – ١٤٠٠ز کاتی (تەتەرەکان) هاتنە (حەلەب) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. الضوء اللامع ٣/ ١٩١.
٢. معجم أعلام الكورد ٢٧٠.

## داود عیسا مەلیك (٤٦٩)

ناوی داودە، کوڕی مەلیك عیسای، کوڕی مەلیك محەممەدی، کوڕی ئەییوبە، ساڵی ٦٠٣ك - ١٢٠٦ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای چەند زانایان خوێندووە، دوای ماوەك لە (بەغدا) خەریکی خوێندن بووە، ماوەکیش لە (کەرك) ئیجازەی لە مامۆستا موئەیەدی طوسی وەرگرتووە، فەرموودەی لە شەرەفەدین دیمیاطی وەرگرتووە، مەزهەبی حەنەفی بووە، زیرەك و زمان ڕەوان بووە، خەریکی کتێبانی نایاب بووە، بەخشیشی بە شاعیران داوە، کتێبی (الفوائد الجلية في الفوائد الناصرية)ی داناوە، پاش کۆچی دوایی باوکی ساڵی ٦٢٦ك لە (دیمشق) کرا مەلیك، پاشان مەلیك محەممەدی مامی بە زۆری دەستەڵاتی لێ ستاند و خۆی دانا بە مەلیك، مەلیك داود چووە (ئوردن) بووە مەلیکی (کەرك)، یازدە ساڵ لەوێ ماوە، ساڵی ٦٥٨ك - ١٢٦٨ز کۆچی دوایی کرد، مەلیك حەسەنی کوڕی زانیاریەکی چاکی هەبوو، لە ٦٧٠ك کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. شذرات الذهب ٥/٢٧٥.
٢. فوات الوفيات ١/٤١٩ - ٤٢٨.
٣. كشف الظنون ١/٨١٦.
٤. معجم المؤلفين ٤/١٤١.
٥. مشاهير الكورد ٢٠٠ - ٢٠٢.
٦. معجم أعلام الكورد ٢٦٩.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٥٠.

## داود محەممەد هەولێری (٤٧٠)

ناوی داودە، کوڕی محەممەدی، کوڕی حەسەنی، کوڕی ئەبوخالیدی هەولێری یە، ساڵی ٤٩٣ك – ١٠٩٩ز لە (موصل) لە دایك بووە، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) دوایی چوویتە (دیمشق)، گەڕایتەوە موصل، چوویتە (مەرو) لە دەورروبەری ساڵی ٥٢٠ك – ١١٢٦ز لە قوتابخانەی (حورانیە) دابەزیوە، زانایەکی شەرع زان بووە، زۆر لە دوو زانیاری فەرمووده گەڕاوە و ماندوو بووە، چوویتە (ماوراء النهر) دوایی چوویتە (سەمەرقەند) پاشان لە (حصن کیفا) کرایتە قازی، مامۆستا ئیجازەی بوخاری بە عبداللّٰهی کوڕی موبارەکی خوزاغی بەغدایی داوە، ساڵی ٥٧٣ك – ١١٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ١/٢٦٥ /٢/٤٤٦.

٢. أربيل في مختلف العصور ٢٣.

٣. طبقات الشافعية ١/١١٩ – ١٢٠.

٤. الأنساب ١/١٠٦.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٩٩.

## داود نەجمەدین کوردی (٤٧١)

ناوی داودە، نازناوی نەجمەددینە، مەزهەبی شافیعی یە، لە یەکە مەلایەکانی سەردەمی خۆی بووە، ماوەی سی ساڵان بە بەردەوامی لە شاری (قودس) دەرسی داوە، هەر لەوێ ساڵی ٧١٢ك – ١٣١٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٠.

٢. معجم أعلام الكورد ٢٧١.

- ر -

## ڕەجەب ئیبراهیم سیواسی (٤٧٢)

ناوی ڕەجەبە، کوڕی جەمالەدین ئیبراهیمە، خەڵکی شاری (سیواس)ە، زانایەکی ئەهلی تەریقەت بووە، ئەو کتێبانەی داناون: أسماء الوصول، نجم الهدی، نور الهدی، لە دەوروبەری ساڵی ١٠٣٠ك – ١٦٢٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٢/١٢٧.

٢. معجم المؤلفين ٤/١٥٢.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٨٤.

٤. هدية العارفين ١/٣٦٥.

## ڕەجەب ئەحمەد دیاربەکری (٤٧٣)

ناوی ڕەجەبە، کوڕی ئەحمەدی قەیسەری دیاربەکری یە، یەك بووە لە مودەڕیسەکانی قەیسەری ڕۆم، پاشان چوویتە (ئەزمیر) لەوێ پاش ساڵی ١٠٨٧ك – ١٦٧٦ز کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی داناون:

١. الوسيلة الأحمدية والذريعة السرمدية.

٢. شرح الطريقة المحمدية: ساڵی ١٠٨٧ك تەواوی کردووە.

٣. جامع الأزهار ولطائف الأخيار: ساڵی ١٠٦٠ك تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٢٨٤.

٢. مشاهير الكورد ٢٠٨.

٣. معجم المؤلفين ٤/١٥٢.

٤. هدية العارفين ٣٦٥ – ٣٦٦.

## ڕەزا عبدالرحمان طاڵەبانی (شێخ ڕەزای شاعیر) (٤٧٤)

ناوی ڕەزایە، کوڕی شێخ عبدالرحمانی، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی مەلا شێخ مەحمودی کوڕی یوسف ئاغایە، ساڵی ١٨٣٧ز هاتووتەدنیا.

زانایەکی زیرەك و بیر تیژ و، زمان ڕەوان بووە، بێ شەرم و نەترس و قسە لەڕوو بووە، دیوانی شیعری بە چوار زمان هەبووە: کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، قەسیدەی (مەربوتە حەیاتم بە سولەیمانی و خاکی...) لە مەتحی کاك ئەحمەدی شێخ داناوە، – لە پێشدا نووسیمان –، شێخ ڕەزا لە (کەرکوك) و (بەغدا) و (ئەستەمبۆڵ) ژیاوە، لەسەر فەرمانی شێخ عەلی برا گەورەی چووە (بەغدا) بۆ سەرپەرشتی تەکیەکەیان لەوێ.

لە زیرەکی شێخ ڕەزا دەڵێن: لەگەڵ شێخ عەلی برا گەورەی چوونە (بەغدا) لەوێ لەگەڵ زانایەکان کۆبوونەوە کەوتنە قسان، شێخ عەلی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) (دَعْ مَا يُرِيبُكَ إلى مَا لاَ يُرِيبُكَ)، (رواه الترمذي تحفة الاحوذي ٣/٣٢٢)، هە ردوو یائەکانی (دەبەر – الضمة) خوێندەوە، مەلایەکان کردیانە گارە: دەبی یائەکان (لەسەر – الفتحة) بی، شێخ عەلی نەیتوانی پێیان بسەلمێنی، شێخ ڕەزا یەکسەر گۆتی: {یا شێخ لێیان گەڕێ ﴿أنهم كانوا في شك مريب﴾ ، (سورەتی سەبەء)، واتە: ئەوانە گومانیان هەیە وازیان لێ بینە، لە لایەکی ترەوە وشەی (مُریب) لە وشەی (یُریب) وەرگیراوە، هەڵبەت یائەکە دەبەر دەبیت، دەبیتە بەڵگە بۆ ڕاستی خوێندنەوەکەی شێخ عەلی، ئەمجا عەرەبەکان سەلماندیان، هیچیان بۆ نەهات.

کۆچی دوایی: لە مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣٢٨ك – ١٩١٠ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ عبدالقادری گەیلانی بە خاك سپێردرا، دوو کوڕی هەبوو:

١. عبد الله: ساڵی ١٢٩٨ك – ١٨٨٠ز لە کەرکوك لە دایك بوو، لای مەلا محەممەد ئەفەندی قوطب زادە و مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی خوێند، ساڵی ١٣٢٨ك

چووە بەغدا بۆ سەرپەرشتی تەکیەکە، لە ١٩٧٠ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گەیلانی بە خاك سپێردرا.

٢. محەممەد: ساڵی ١٨٧٥ز لە دایك بوو، لە ١٩٢٤ز کرا قایمقامی کفری، شاعیرەکی چاك بوو، نازناوی (خالیص) بوو لە ١٩٢٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. لب الألباب ٢/٤٢٨.
٢. الشیخ عبدالرحمان الطالباني ٢١٦.
٣. مشاهیر الکورد ٢١٢.
٤. معجم المؤلفین ٤/١٦٢.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٠٦.
٦. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٠٧.
٧. أسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الاسلامیه ٢٥٦.
٨. دیوانی شێخ ڕەزا / پێشەکی ٣ – ٤.
٩. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٢٧٩ – ٣٤٤.
١٠. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/٢٥٧ – ٢٩٣ /٤/ ١٩٧ – ٢٠٩ /٥/٢٨٨ – ٢٩٤ /٦/ ٣٧٤ – ٣٧٧.
١١. بنەماڵەی زانیاران ٥٦٧ – ٥٧١ – ٥٧٤ – ٥٨٥ – ٥٩٢ – ٥٩٦ – ٦٠٢.
١٢. تاریخ مشاهیر کورد ٢/١٦٩.
١٣. معجم أعلام الکورد ٢٩١ – ٤١٤.

## ڕەزا موسا شازەلی (٤٧٥)

ناوی ڕەزایە، کوڕی شێخ موسای، کوڕی شێخ مەحمودی، کوڕی شێخ یوسفی، کوڕی شێخ عبدالرحمانە، لە نەتەوەی شێخ ئەبولحەسەنی شازەلی یە، نازناوی (موعینەدین) بووە، زانایەکی بەرز و لە خواترس بووە، لە تەسەووف دەستی باڵا بووە، چوویتە

(مەککە)ی پیرۆز لە خزمەت ئین حەجەری خاوەنی توحفەی خوێندووە، ئیجازەی لێ وەرگرتووە، دەقی ئیجازەنامەکە لە (علماؤنا)ی مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) هەیە، شێخ ڕەزا دوای ئیجازە وەرگرتن، گەڕاوە کوردستان، دەستی کرد، بە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا کۆچی دوایی کرد، کتێبی (مسلك المسالك)ی داناوە لە دەستووری تەریقەت.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٣ – ٢٠٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٠٧

٣. تاریخ مشاهیر کورد ١/١٦٢.

## ڕەزا وەیسی واعیز (٤٧٦)

ناوی ڕەزایە، کوڕی وەیسی یە، عەشیرەتی (زەنگەنە)یە، ساڵی ١٢٨٧ك – ١٨٧٠ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغەکانی بڕی، لە کۆتاییدا چووە (بەغدا) لای محەممەد فەیزی زەهاوی ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (کەرکوك)، کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، دەرسی فەقێیانی دەداوە، هەروەها تەریقەتی لە شێخ عەلی خالیصی وەرگرت، لە مزگەوتەکەی شێخ دەرسی دەدا، دوایی کرا (واعیز)، ساڵی ١٩٢١ز کرا بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوك، مامۆستا هۆنراوەی عەوامیلی جورجانی هەیە، شیعری بە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە.

کۆچی دوایی: مامۆستا چووە لای نورەدین، واعیزی کوڕی لە (بەغدا) ساڵی ١٩٦٣ز لە تەمەنێکی درێژ لە خزمەت ئایین و زانست، کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ئیمامی ئەعزەم بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٥.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٠.

٣. معجم المؤلفين ٤/١٦٥.

## رەسول ئەبوبەکر هەکاری ( ٤٧٧ )

ناوی رەسولە، کوڕی ئەبوبەکری، کوڕی حوسێنی، کوڕی عبداللە زەینی هەکاری یە، ساڵی ٨٠٣ك – ١٤٠٠ز هاتووتەدنیا، خوێندنی تەواوکرد، چووە (حەلەب) دوایی چووە (قاهیرە) لەوێ نیشتەجێ بوو، زانایەکی بە دین و خواناس و ملکەچی ئایین پەروەران بووە، ناوبانگی مەلایەتی دەرکردووە، ساڵی ٨٥٣ك – ١٤٤٩ز بە نەخۆشی تاعوون کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٣/٢٠٠.

٢. مشاهیر الکورد ١/٢٢٢.

## رەسول ئەحمەد شەوەکی ( ٤٧٨ )

ناوی رەسولە، کوڕی مەلا ئەحمەدی، کوڕی مەلا رەسولە، خەڵکی گوندی (شەوەکە) دەکەویتە سەر رێگای شاوێس بۆ مەلا ئۆمەر، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە، پاشان ماوەك چوویتە لای مەلا عبدالقادری گۆرانی، لە کۆتایی ئیجازەی لە مەلا عبدالرحمانی جەلی کۆیە وەرگرت، ئەمجا چووە (بەغدا) دووبارە ئیجازەی لە مەلا عوبەیداللەی حەیدەری (موفتی حەنەفییەکان) لە بەغدا وەرگرتووە، دەرسی بە مەلا ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری داوە.

منیش ئیجازەنامەکی ئەو زاتەم دیتووە بەخشیتی بە مەلا مصطفا حەمزە داودی، بە داخەوە لەبەر کەونی و دڕانی لاپەڕەکە نەمتوانی زانیاری تەواوی لێ وەربگرم، دوایی کاکم مەلا طەیب نوسخەکەی بەخشی بە مەلا عبداللە مەلا رەسول شەوەکی ئەویش لەو بنەماڵەیە، مامۆستا ساڵی ١٢١٥ك – ١٨٠٠ز لە ژیاندا بووە و دەرسی داوە، پاش ئەو بەرواره کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٧.

٢. عنوان المجد ١٤٦.
٣. الإكليل في المحاسن أربيل ٢٥٤.

## رەسول ئەحمەد گڕاوی (٤٧٩)

ناوی رەسولە، کوڕی مەلا ئەحمەدی، کوڕی مەلا رەسولی گڕاوی یە، ساڵی ١٢٢٨ك - ١٨١٣ز لە (هەولێر) لە دایك بووە، خوێندویەتی بوویتە مەلا، لە قوتابخانەی باوکی لە (قەلات) دەرسی داوە، ساڵی ١٣١٢ك - ١٨٩٤ز کۆچی دوایی کردووە، دوو کوڕی مەلای هەبووە: مەلا سەلیم و مەلا عبدالرحمان.

سەرچاوە: أربيل في مختلف العصور ١٠٩ - ١٣٣.

## رەسول تەلانی (٤٨٠)

مامۆستا مەلا رەسول خەڵکی گوندی (تەلانە) نزیك (سەرگەلوو) سەر بە شاری (سلێمانی)، لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٢ز - ١٣٣٠ك لە دایك بووە، دەستی بە خوێندن کرد، لە چەند شوێنان گەڕا، دوا جێگا چووە تەکیەی مەولانا خالید لە (سلێمانی) لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی ماوە، لە دەریای زانستی ئەو هەڵی دێنجا، تا کۆتایی پێ هێنا و ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (تەلان) دەستی کرد بە دەرس دانەوە و جێبەجێکردنی کاروباری ئاینی، پاشان باری کرد، هاتە مزگەوتی (نەقیب) لە (سلێمانی) کرا (مدرس)، ساڵی ١٣٨٥ك - ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٨ - ٢٠٩.

## رەسول شەریف دێلژەیی (٤٨١)

ناوی رەسولە، کوڕی شەریفە، خەڵکی گوندی (دێلژە)یە لە دەوروبەری ساڵی ١٢٨٠ك - ١٨٦٣ز هاتوتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند قوتابخانانی (قەرەداغ) و (سلێمانی) گەڕا دوایی چووە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ لە (سلێمانی) تەریقەتی قادری لێ وەرگرت، ماوەك پێ چوو لە لایەن شێخ کرا (خەلیفە)، مامۆستا

هیوایەتی ئامۆژگاری خەڵکان بوو، خۆی دەگەڕا لە قاوەخانان، دیوەخانان، تەکیەکان، خاناقایەکان، بە دەنگی بەرز وەعزی دەدا.

مامۆستا ساڵی ١٣٣٥ك لە (بیستان) و (بانە) سەرلەشکری کوردی ئیسلام بوو، بۆ بەرگری کردنی لەشکری ڕووسەکان، کە هێرشیان هینا سەر کوردستان، مامۆستا شاعیرەکی چاك بووە، شیعری لە مەتحی شێخ نەجمەدینی شێخ عومەری بیارە داناوە، ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (سەیوان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٩ – ٢١٠.

## ڕەسول کەکال سورچی (٤٨٢)

ناوی ڕەسولە، کوڕی کەکالە، عەشیرەتی سورچی یە، بەرەبابی شێخەل زانایەکی مەزنی صەدەی یازدەی کۆچی بووە، ساڵی ١٠٢١ك– ١٦١٢ز لە (هیزان) حاشیەی میرزاجانی نووسیتەوە، هەر لەوێ ساڵی ١٠٢٢ك (رسالة إثبات الواجب)ی نووسیتەوە، (هیزان) شارەکە لە نزیك سعێرت لە کوردستانی تورکیا، وادیارە مامۆستا ڕەسول بۆ خوێندن چوویتە ئەو ناوچەویە، مایتەوە تا ساڵی ١٠٢٥ك لە قوتابخانەی ئیخلاص لە شاری (بەدلیس) شەرحی (رسالة إثبات الواجب)ی نووسیتەوە و نوسخەی تری (إثبات الواجب) لە گوندی (سینان) نووسیتەوە حاشیەی خۆشی لەسەر داناون.

دەشبیت لەگەڵ (هیزانی) کوردستانی عێراقی بی، کە گوندێکە دەکەوێتە سەر زێی بادینان لە باشوری (ئاکرێ)، گۆیا لە پێشدا شارەکی گەورە بووە، مامۆستا حاشیەی لەسەر حاشیەی حەسەن زێباری لەسەر (رسالة الوضع) هەیە، هەروەها حاشیەی لەسەر حاشیەی شیرانشی لەسەر عیصامەدینی وەضع هەیە.

ئەنوەر مائی دەڵێ: (ڕەسول سورچی فەقێی یوسفی ئەصەمە).

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/ ٧، ٦/ ١٠٩ – ١١١.

٢. الأكراد في بهدينان ١٨٩.

## رەسول محەممەد تەكیەیی (٤٨٣)

ناوی رەسولە، كوڕی شێخ محەممەدە، لە نەتەوەی ئیمام حەمزەی كوڕی ئیمام موسای كاظمە (خوا لێی رازی بێ)، لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز لە گوندی (تەكیە) هاتووتەدنیا، لەوێ دەستی بە خوێندن كرد، پاشان چووە مزگەوتی (بابا عەلی) لە (سلێمانی)، دوایی چووە (هەڵەبجە) لای شێخ مصطەفای موفتی، لە خزمەت ئەو كۆتایی بە خوێندن هێنا، هەر لەوێ ماوە یارمەتی مامۆستای دەدا بۆ دەرسدانەوە و كاروباری ئاینی، پاشان مزگەوتی (خانم)ی بە خێرخوازان نوێ كردەوە، چووە وێ پێش نوێژی و كاری خێری ئەنجام دەدا، ساڵی ١٣٨٥ك – ١٩٦٥ز كۆچی دوایی كرد، مەلا محەممەدی كوڕی جێگری بوو.

سەرچاوەكان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٨.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٢١٢.

## رەسول محەممەد كوردی (٤٨٤)

ناوی رەسولە، كوڕی محەممەدی، كوڕی عومەری، كوردییە، مامۆستا محەممەد عبدالرحمان سەخاوی كە لە صەدەی نۆ و دەی كۆچی ژیاوە، دەڵێ: {رەسول محەممەد كوردی: یەكە لە فەقێیەكانی مامۆستای خۆم}.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٣/٢٠٠.

## رەسول مەحمود مەستی (٤٨٥)

ناوی رەسولە، كوڕی مەحمود بەگە، نازناوی مەستی ئەفەندی یە، ساڵی ١٢٨١ك – ١٨٦٤ز لە گوندی (سراوی كوندە) سەر بە (هەڵەبجە) هاتووتەدنیا، ماوەك لە (هەورامان) و ماوەك لە (سنە)ی خوێند، پاشان چووە (ڕواندز) لەوێ چووە (ئەستەمبۆڵ) كۆتایی بە خوێندن هێنا، كرا مامۆستا، دوایی ناردرا (موصل) پاش دوو ساڵ ناردرا (كەركوك)، لەوێ ڕەوانی (بەصرا)یان كرد، ماوەك پێ چوو گەڕاوە (ئەستەمبۆڵ)، لەوێ دەرسی بە

کورەکانی عبدالرحمان پاشا دەدا، دوایی کرا پشکێنەری زانیاری لە (وانـە)، لـەوێوە کـرا بەڕێوەبەر لە (موصڵ)، پاشان چووە لای عـەبباس حیلمـی پاشـا لـە میصـر، دوای چـوار مانگ سوڕا لە وڵاتان، مامۆستا عەرەبی و فەڕەنسی و فارسی و تورکی بە چاکی دەزانـی، جگە لە زمانە شیرنە کوردییەکەی خۆی، ساڵی ١٩٠٨ز لە (ئەستەمبۆڵ) کۆچـی دوایـی کرد، ئەو کتیبانەی داناون:

١. تشريح الإدراك في شرح تشريح الأفلاك.

٢. علم الفيزياء: پێشکەشی بە سوڵتان عبدالعزيز کرد.

٣. حوادث عناصر: لە چاپخانەی عامرە ساڵی ١٢٩٠ك چاپ کرا.

٤. سبر زلـزلـە: ساڵی ١٣١٩ك چاپ کرا.

٥. إثبات الواجب.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢١١ – ٢١٢.

٢. معجم المؤلفين ٤/١٥٧.

٣. تاريخ السليمانية ٢٥٠ – ٢٥١.

## ڕەسول میرزا عەلی (٤٨٦)

ناوی ڕەسولە، کوڕی میرزا عەلی ئاغایە، ساڵی ١٩١٦ز هاتـەدنیا، لـە خزمـەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای میرزا ئەحمەد فتـوحی لـە (سەردەشـت)، دوایی چووە مزگەوتی کانی چاوانی (مەرگە)، لەوێ گەڕاوە عێراق، ماوەك لە (وەرێ) و ماوەك لە (زێوە) و ماوەك لـە (هەرتـەل)، پاشـان چـووە (شـەقڵاوە) لای مـەلا صـاڵحی ئەختەتەری کە لەو کاتە لەوێ موستەعید بوو، دوایی چووە (ڕواندز) گـەڕاوە (هەرتـەل)، لەوێ چووە (گردمەیتەر) گەڕاوە (زێوە)، لەوێ چووە گونـدی (ئەحمـەد برێـو) لای مـەلا عبدالله، لەوێ چووە (پێنجوین) لای مەلا عیزەتی مەریوانی لەوێ چووە (کێلـە)، دوایـی چووە (مەسۆ) دوایی چووە (وێنە) لای مەلا ڕەحیمی مەریوانی، لەوێ چووە (شـوێیە) لای

مەلا مصطەفا، ئەمجا بۆ خوێندنی گەلەنبەوی بورهان چووە (باساوێ) لای مەلا ئەحمەدی جەریجی، دوایی چووە (مێراوێ)ی سەردەشت لای مەلا خەلیلی گۆڕەمەڕی، لەوێ چووە پیشاسپ ساڵی ١٩٤٣ز چووە مزگەوتی بازاڕ لە (سابلاغ) لای مەلا حوسێنی مەجدی شەرحی مەواقیفی خوێند، ماوەی چوار ساڵ لەوێ ماوە، ساڵی ١٩٤٧ز لە کۆماری مەهاباد بەشداری کرد، کرا بەرپرسی ناوچەی (سەردەشت)، کە کۆماری مەهاباد شکستی هێنا، مامۆستا گەڕاوە (میراوە) دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندن، چوار ساڵی دی خوێند، هەر لەوێ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: لە گوندی (ترکەش) سەر بە ناوچەی (پیرانشار) بووە مەلا دەستی کرد بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٥٤ز گەڕاوە (زێوە)، مامۆستا تا ساڵی ١٩٦٠ز لەو شوێنە خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، ئامۆژگاری موسڵمانان و پێکهێنانەوە و ئاشت بوونەوەی نێوان خەڵکان.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٩٨ – ٣٠٠.

## ڕەسول یەعقوب زەکی (٤٨٧)

ناوی ڕەسولە، کوڕی مەلا یەعقوبی، کوڕی مەلا خضری، کوڕی مەلا عومەرە، ساڵی ٩١٠ك – ١٥٠٤ز لە (قەڵاچوالان) هاتووتەدنیا، ئەوە ڕەسولی یەکەمە، دەرسی لە لای مەلا یوسفی (ئەصەم) و مەلا صالحی تلنباری خوێندووە، پاشان چووە (ماوەران) لای مەلا حەیدەر ئەفەندی یەکەم تەواوی کرد، لەسەر فەرمودەی مامۆستا گەڕاوە (سەردەشت)، ماوەك لە (سوسنایەتی) دەرسی دەدا، هەروەها خەریکی نووسین و کتێب دانان بوو، لەوانە:

١. فتاوی: لە (ئەنوار) و (شەرحە مەنهەج)ی دەریناوە، سەرەتایەکەی بە (إعلم، هذه مسائل مجوعة....) دەست پێ دەکات.

٢. حاشیە لەسەر (توحفە)ی ئیبن حەجەر: لەوێ ناوی باوکی خۆی (یەعقوب) نووسیوە.

٣. حاشیه لەسەر (سعدالله )ی گەورە.

مامۆستا ماوەك لە گوندی (کلو) نزیك (سەردەشت) دەرسی دەدا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا حەسەن محەممەد پشدەری، خان ئەحمەد سوسی: لە سەر توحفەکەی ئێمە چەند حاشیەی دەست نووس هەنە بەناوی (خان ئەحمەد)، بە دوور نازانم ئەو خان ئەحمەدە بی کە فەقێی مامۆستا رەسول زەکی یە.

کۆچی دوایی: ساڵی ٩٨٤ك – ١٥٧٦ز لە گوندی (کاژە)ی نزیك سەردەشت کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی مەلای هەبووە، ئەوانەن:

١. مەلا عەلی: لە گوندی (زیڤە) دەرسی داوە، حاشیەی لەسەر (توحفە) هەیە، (مختصر الچغمینی) داناوە.

٢. مەلا ئیبراهیم: حاشیەی لەسەر توحفە و چەند فەتوای شەرعی هەیە، کوڕی ویش یوسفە، کوڕی ویش عبدالله یە. ئەوە ڕشتەی نەسەبی بەو شێوەی سەرەوە نووسیوە، دەڵێ: {ئێمە لە (کلاسی) شارباژێڕ دانیشتووین}.

٣. مەلا محەممەد: حاشیەی لەسەر عبدالحکیمی جامی هەیە، کوڕی وی مەلا حوسێنە، ساڵی ١١٤٥ك – ١٧٣٢ز بە دەستی لەشکری (قزلباش) شەهیدکرا، کوڕی وی مەلا عبدالوهابە: ساڵی ١٢٣٠ك کتێبی (الفرق بین المصدر واسم المصدر والحاصل بالمصدر)ی مەلا محەممەدی (بانە)ی نووسیتەوە، کوڕی دووەمی مەلا محەممەد، ناوی رەسولە، ئەوە رەسولی دووەمە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/٢٩٣ – ٢٩٥ ، ٧/٢٨٣.

٢. مشاهیر الکورد ١/٢٢٤.

٣. تاریخ مشاهیر کورد ١/١٩٧ – ١٩٨.

٤. تاریخ السلیمانیة ٢٥٠.

٥. معجم أعلام الکورد ٢٨٦ – ٢٨٧.

٦. خۆری ئیسلام: ژمارە ٣٥، ٢٠٠٧ز

## ڕەشاد محەممەد موفتی (٤٨٨)

ناوی ڕەشادە، کوڕی محەممەد ئەفەندی، کوڕی عوسمان ئەفەندی، کوڕی ئەبوبەکر ئەفەندی (کچك مەلا)یە، ساڵی ١٩١٥ز لە قەڵاتی هەولێر هاتووتەدنیا.

خوێندنی: ساڵی ١٩٢١ز چووە قوتابخانەی پەروەردە، ساڵی ١٩٢٧ز لەسەر فەرموودەی باوکی وازی هێنا، لە مزگەوتی (قەڵات) دەستی کرد بە خوێندنی ئاینی، پاش تەواوکردنی زانستەکان، باوکی ناردیە (جامع الأزهر) لە (قاهیرە) لەوێ بڕوانامەی وەرگرت گەڕاوە (هەولێر).

مەلایەتی: ساڵی ١٩٤٥ز باوکی کۆچی دوایی کرد، ڕەشاد ئەفەندی لە جێگای دانرا بە وتار خوێن و دەرس بێژ و کاروباری ئاینی، ساڵی ١٩٥٦ز کرا قازی (کەرکوك) پاشان کرا قازی (سلێمانی) ساڵی ١٩٥٧ز کرا قازی (هەولێر)، ساڵی ١٩٧٨ز خانەنشین کرا، دوایی کرا ئەندامی ئەنجومەنی زانستی، پاشان کرا سەرۆکی ئەنجومەنەکە.

کۆچی دوایی: لە ١٢/٩/١٩٩٢ز لە ماڵی خۆی لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی (باداوە) بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەکانی: مەولودنامە: چەندجار چاپ کراوە، تەرجومەی قەسیدەی بوردیە، سیرەتی شێخ مەعروفی کەرخی، ئیسماعیل نامە، دیوانی شیعر، عەبا نامە، وتاری ڕۆژانی هەینی، ژیانی سەید ئەحمەدی بەدەوی، فەلسەفەی ژیان و مردن، سبائك الإملا في سلسلة کچك ملا، مناسك الحج، الإسراء والمعراج، سيرة الشيخ حسام الدين، إعادة الظهر بعد الجمعة، المواعظ الدينية، العلوم اللدنية في الطريقة النقشبندية، راحة الأبدان في صوم رمضان، تحفة الأصفياء في التوسل بالأنبياء، تاريخ جوامع أربيل، سيرة الشيخ عبدالقادر الگيلاني، سيرة الشيخ نورالدين البريفكاني.

مامۆستا ڕەشاد چەند کوڕی نووسەر و ڕۆشنبیری هەیە، لەوانە: عوسمان ئەفەندی لە جێگای بابیتی و سەرپەرشتی کتێبخانەکە دەکا، ماوەك بەڕێوەبەری گشتی بوو لە

وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی، کتێبی (عالم الغیب والشهادة) و چەند قەسیدەی دەرکردووە، شاعیرەکی بەتوانایە، ئێستا راوێژکارە لە وەزارەتی ئەوقاف.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ١٤٩.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٣٦.
٣. معجم أعلام الكورد ٢٨٨.
٤. أعلام كورد العراق ٣١٢ – ٣١٣.
٥. هەولێرم وادیوە ٢٢٢ – ٢٢٤.
٦. خۆری ئیسلام (٢٠)، ٢٠٠٣ز / ١١٥ – ١٢٣.
٧. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٥٦.

## رەشید حەسەن خانەقینی (٤٨٩)

ناوی رشیدە، کوڕی حەسەن ئاغایە، لە شاری (خانەقین) هاتووتەدنیا، لەبەر زۆرزانی ناوبردراوە بە: (حەکیمی کوردی)، ماوەك لە ناوچەکەی خۆی خوێند، ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز چووە (بەغدا) لای غولام رەسولی هیندی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژ لە مزگەوتی حاجی ئەمین چەلەبی پاچەچی لە (بەغدا)، مامۆستا رەشید کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی زانیوە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی هەیە، لە ١٣٧٤ك – ١٩٥٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ مەعروف کەرخی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٠٤.

## رەشید حوسێن شالگەیی (٤٩٠)

ناوی رەشیدە، کوڕی حوسێنە، لە سەیدەکانی (سەدبار)ی بانەیە، ساڵی ١٩٢٩ز لە گوندی شالگەی (سەردەشت) هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، ماوەك لای مەلا عبدالرحمانی سیسێری، ماوەك لای مەلا شێخ ئەحمەدی شەریعەتی، دوایی چووە لای قازی

عەلی (سەردەشت)، لە ١٩٥٥ز ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە (میرسیخەیدەر) لەوێ چووە (بێور)ی سەرێ، دوایی چووە (بێور)ی خوارێ، سێزدە ساڵ ماوە لەوێ، ساڵی ١٩٦٩ز لەگەڵ چەند مەلایان، لە بەندیخانەی (فلك الأفلاك) گیرا، دوو ساڵ لە زیندان ماوە، بەردرا بەڵام دووریان خستەوە بۆ (بافت)ی کەرمان، خوای گەورە دەرفەتی دا خۆی دەربازکرد، هاتە (قەڵادزێ)، چوار ساڵ لەوێ ماوە، چووە (دەشتێو).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٥ز سەر لە بەیانی لەسەر حەوزی مزگەوت، کاتی دەستنوێژ شووشتن، لە لایەن حکومەتی (ئێران) شەهیدکرا، کوڕێکی هەیە لە سەردەشت، ناو سەید محەمەد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٩٧.

## ڕەشید ڕەسول سیگرتکانی (٤٩١)

ناوی ڕەشیدە، کوڕی ڕەسولە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (ئۆمەرگونبەت) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە لای مەلا محەمەد نور و ماوەك لای مەلا بەهائەدینی کۆیی و ماوەك لای مەلا عبداللە ی گڕاوی و ماوەك لە لای شێخ مصطەفای نەقشبەندی لە (هەولێر)، پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە خزمەت مەلا محەمەدئەمینی (کونەفلوسە) ئیجازەی وەرگرت بووە مەلا لە (ئۆمەرگونبەت) چەند ساڵ لەوێ بوو، دوایی وەزعی گۆڕا، تێکچوو، وازی لە هەموو شت هێنا، دوایی چابۆوە، بووە مەلا لە گوندی (عەسکەر)، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٠ز لە خانەقای سەید ئەحمەد لە (کەرکوك) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## ڕەشید عبد اللە موکریانی (٤٩٢)

ناوی ڕەشیدە، کوڕی عبداللەی، کوڕی خضری، کوڕی جەوهەرە، عەشیرەتی (کەڵهوڕ)ە، ساڵی ١٨٩٤ز لە گوندی (قاراوە)ی سەر بە (موکریان) هاتووتەدنیا، لای مەلا جەلالی مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لە شارەکانی شنۆ و سابلاغ

و تورجان چەند ساڵان خەریك بوو، دوایی لەگەڵ مـەلا ئەحمـەدی بانـەیی (مـەلای ڕەش) چووە (بیارە)، دوایی چـووە (سـلێمانی) دوایـی هاتـە (هـەولێر) لای مـەلا ئەفەنـدی لـە مزگەوتی (قەلات)، پاشان مەلا ئەحمەد ئیجازەی وەرگرت بووە مەلای (مەخمور)، مامۆسـتا ڕەشیدیش لە سەر فەرموودەی مەلا ئەفەندی چووە لای ئەو لـە (مـەخمور)، دوایـی چـووە (کۆیە) لای مەلا بەهائەدین فەلەکیاتی خوێند، دوایی چووە (بالیسان) لای مامۆسـتا شـێخ طاها، هەر لە خزمەت ئەو تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، ئەمجا هاتە (هەولێر) لای جەنابی شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: لەسەر فەرموودەی (شێخ) کرا مەلا، لە گوندی (شاوێس) ماوەی چوار ساڵان لەوێ ماوە، باری کرد بۆ (کەندار)، ماوەك دەرسـی فـەقێیانی دەدا، پاشـان چـووە (کۆزەپانکە).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی گەزنەیی، مەلا خـەلیلی (مـوخلیص)، مـەلا کەریمی بـەرزەواری، مـەلا سـەعید زمزەمـۆکی، مـەلا حەسـەن مـەولود، مـەلا عـەزیزی دووکەرەیی.

پاشان هاتە (هەولێر) لە مزگەوتێك لە گەڕەکی (کـوران) کـرا پـێش نوێـژ، لـە ٢٢/٤/١٩٨٢ز کۆچی دوایی کرد، مەلا صالّحی کوڕی مامۆسـتای کۆلێـژی (ئـاداب) بوو لە زانکۆی (سەڵاحەدین) لە هەولێر، ئێستا خانەنشین کراوە.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٥٠٨ – ٥١١.

## ڕەشید فەتتاح بەگ بابان (٤٩٣)

ناوی ڕەشیدە، کوڕی فەتتاح بەگی، کوڕی محەممەدی، کوڕی خالید پاشای بابانی یە، ساڵی ١٨٦٨ز لە شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، دوایـی چووە قوتابخانەی (نەقیب) لە سلێمانی لای مـەلا عبـدالرحمانی پێنجـوێنی، پاشـان لەگـەڵ مامۆستای چووە (پێنجوێن) ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، کرا (مدرس) لـە مزگـەوتی شێخ سەلام، لە قوتابخانەی سەر بە حکومـەتی عوسمـانیش دەرسـی دەدا، سـاڵی ١٩٢٢ز

سلێمانی بە جێ هیشت لە (ئەستەمبۆڵ) نیشتەجێ بوو، ماوەك واعیزی لەشکر بوو، دوایی کرا دادوەر، ساڵی ١٣٦١ك – ١٩٤٢ز کۆچی دوایی کرد، بەرهەمەکانی:

١. الدرر النضيدة في شرح منظومة الفريدة: شەرحی ئەلفیەی سیوطی یە.

٢. نەحو و صەرف بە زمانی کوردی.

٣. إقتران النيرين في مجمع البحرين: شەرحی بوخاری و موسلیمە بە کوردی بە لێکۆڵینەوەی محەممەد عەلی قەرەداغی چاپ کراوە.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستا في العراق في الثقافة الإسلامية ١١٨ – ٢٥٦.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٧ – ٢٠٨.

٣. بنەماڵەی زانیاران ٤٥٣ – ٤٥٥.

٤. أعلام كورد العراق ٣١٤ – ٣١٦.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/ ٢٦٩ – ٢٨٢.

**رەشید محەممەد نوری دێرشەوی (٤٩٤)**

ناوی رەشیدە، کوڕی محەممەد نورە، خەڵکی گوندی (دێرشەوە) ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز لە جزیرەی بۆتان هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان و ئەهلی تەسەووف بووە، نەحو و صەرف و مەنتیق و ئاداب و بەلاغەی لە وڵاتی خۆی خوێند، ئەمجا چووە (موصل) زانستەکانی قورئانی پیرۆزی تەواوکرد، پاشان چووە (سوریا) ئیجازەی تەریقەتی ڕوفاعی وەرگرت، دەستی کرد، بە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ساڵی ١٣٩٧ك – ١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ١/٤٤١.

٢. عقد الجوهر ١٨١٥ – ١٨١٦.

٣. معجم أعلام الكورد ٢٨٨.

## رەضیەدین ڕەزا شازەلی (٤٩٥)

ناوی رەضییەدینە، کوڕی شێخ ڕەزای، کـوڕی شـێخ موسـای شـازەلی یـە، لـە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، وازی نەهێنا، تا زانسـتەکانی ئاشـکرا و نهـێنی تەسەووف تەواوکرد، دەستی کرد بـە ڕێ نیشـاندانی خـەڵکان و خزمـەتی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام تا کۆچی دوایی کرد، لە بارەی ژیانی هەر ئەوەندەی لێ زاندراوە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٠٨ – ١٠٩.

## ڕەمەزان ئەبوهورەیرە (٤٩٦)

ناوی رەمەزانە، کوڕی ئەبوهورەیرەیە، خەڵکی جزیرەیە، تەریقەتی قـادری بـووە، کتێبـی (حل الخلاصة لأهل الرئاسة)ی داناوە، لە ١٠٩٢ك – ١٦٨١ز تەواوی کردووە، سەرەتایەکەی بە: (نحمدك يا من أعداد نعمه لا تُحصَى...) دەست پێ دەکا.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/ ٧٨.

٢. معجم المؤلفين ٤/١٧٣.

٣. إيضاح المكنون ٣/٤١٦.

٤. هدية العارفين ٥/٣٧٠.

## ڕەمەزان عبدالله کوردی (٤٩٧)

ناوی رەمەزانە، کوڕی عبداللهی، کوڕی عبدالرحمانی کوردی یە، نازنـاوی (ئـەبو عەبدە) مامۆستای فەرموودە بووە، لە گونـدی (خوبرقـە)ی نزیـك (دیمشـق) ووتـارخوێن بووە، زاتێکی چـاك و بـە دیـن بـووە، لـە ٧٠٧ك – ١٣٠٧ز هاتووتـەدنیا، لـە مـانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٠٥.
٢. الدرر الكامنة ٢ – ٦٥.

## رەمەزان عومەر بوطی (٤٩٨)

ناوی رمەزانە، کوڕی عومەری، کوڕی مـرادە، سـاڵی ١٣٠٦ك – ١٨٨٨ز لـە گوندی (جبلکا)ی سەر بە جزیـرەی بۆتـان هاتووتـەدنیا، لـە لای مەلایـە باشـەکانی ئـەو سەردەمی خوێندنی تەواوکرد، لە مەزهەبی حەنەفی و شـافیعی شـارەزایی پەیـدا کـرد، لـە گوندەکەی خۆیان کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن، پاشان (ئەتاتورك) دەستی کرد بـە پیلانـی دوژمنایەتی ئیسـلام و کـورد، مامۆسـتا نەحـەواوە، خـۆی و منداڵـەکانی ئـاوارەبوون بـۆ (دیمشق) لە گەڕەکی کوردان نیشتەجێ بوو، لە مزگەوتی ڕوفاعی ئامۆژگـاری خـەڵکانی دەکرد، ناوبانگی مەلایەتی بەلاوبۆوە، ماوەك لەگەڵ یەکگرتووی ئیسـلامی ئیشی دەکـرد، دوایی وازی هێنا، دەستی کرد بە خواپەرستی و دەرسدانەوەی فەقێیان، بە زۆری خـەریکی (إحياء العلوم)ی ئیمامی غەزالی بوو، (کاکم مەلا طەیب) دەڵێ: {ساڵی ١٩٧٩ز لەگەڵ خاڵم مەلا مەسعود، چووینە سەفەری عومرە بە ڕێگای دیمشق، لەوێ بە خزمەت مامۆسـتا گەیشتین، کە چووینە لای دەرسی ڕیسالەی قوشەیری دەداوە، زاتەکی موبـارەك بـوو، بـە کوردی قسەی دەکرد}، ساڵی ١٤١٠ك – ١٩٨٩ز لـە دیمشـق کۆچـی دوایـی کـرد، کوڕێکی زانای هەیە دکتۆر محەممەد سەعید ڕەمەزان بوطـی، خـاوەنی کتـێبی: فقـه السـيرة وكبرى اليقينيات الكونية و اللآمذهبية و چەندان کتێبـی دی.

سەرچاوەکان:

١. عقد الجوهر ١٨١٨ – ١٨١٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٢٩٤.

## رەیحان تیکان موسەك (٤٩٩)

ناوی رەیحانە، کوڕی تیکانی، کوڕی موسەکی کوردی یە، لە چاوان نابینا بـووە، لە (بەغدا) دانیشتووە، دەرسی لە لایەن چەند مامۆستایانی ئەو سـەردەمی خوێنـدووە، لـە زانیاریەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، دەرسی فەقێیانی داوە، ئیجازەی بە مەلایان داوە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٦١٦ك – ١٢١٩ز لە تەمەنی صەد سالیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: سیر أعلام النبلاء ١٣/٥٠.

– ز –

## زاهید صەلاحەدین پاوەیی (٥٠٠)

ناوی زاهیدە، کوڕی صەلاحەدینی، کوڕی محەممەدی، کوڕی عیـوەضـە، خـەڵکی گوندی (پاوە)ی سەر بە (سنە)یە، پاش کۆچی دوایی بـاوکی دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، دوایی چووە گوندی (گەلالە)ی قەزای چوارتا لای مەلا محەممەدی رەئـیس، پاشـان چـووە (بیارە) شەرحی تەهزیبـی لای مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) خوێند، هەر لە خزمـەت ئـەو ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (پاوە) دەستی کـرد بـە دەرسـدانەوە، تـا سـالی ١٤٠١ك – ١٩٨٠ز لە ژیاندا مابوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢١٥ – ٢١٦.

## زاهید مصطفی رەباتی (٥٠١)

ناوی زاهیدە، کوڕی مصطەفای، کوڕی محەممەدە، خـەڵکی گونـدی (رەباتـە) لـە ناوچـەی (سـنگاو) نزیـك قـەرەداغ، لـە دەوروبـەری سـالی ١٣٣٠ك – ١٩١٢ز هاتووتەدنیا، لە زووەوە باوکی کۆچی دوایی کرد، بەڵام وازی لە خوێندن نـەهێنا، سـاڵی ١٣٤٣ك چووە (نەرگسـەجاڕ) لای مامۆستا عبـدالکریمی (مـدرس)، دوایـی لـە خزمـەت مامۆستا چووە (بیارە) فەریدەی سیوطی و خـەیالی و شـەرحی عەقائیـدی خوێنـد، دوایـی چووە (فەقێ جنە)ی وارماوا، لای مەلا عبدالقادری صۆفی، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، لە (نەمال)ی شارەزور بووە مەلا، دەوری ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢١٧.

## زەکەریا عبدالرحمان شازەلی (٥٠٢)

ناوی زەکەریایە کوڕی عبدالرحمانی کوڕی سولەیمانی کوڕی حەسەنی کوڕی ئەبوحەسەنی شازەلی یە،لەگوندی (خالدیە) –کاکۆزەکەریا– هاتووتەدنیا، تەمەنی یازدە ساڵ بوو شێخ عبدالرحمانی باوکی بە دەستی (تەتەرە) تاوانبارەکان شەهیدکرا، هەرلەوگوندە دەستی کرد بەخوێندن، دوای چووە(میصر)، ماوەك لە (جامع الأزهر) بوو، تاشارەزابوو لەزانستەکان، ئەمجا چووە(مەککە)ی پیرۆز دووساڵ لەوێ ماوە، چووە (مەدینە)ی پیرۆز سێ ساڵ لەوێ ماوە، چووە (بوخارا) تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، گەڕاوە (بەغدا) تەریقەتی (قادری) وەرگرت، چووە (بەلخ) گەڕاوە بۆ کوردستان، گەیشتە (کەرمان) خوای گەورە نیعەتوالله ی کوڕی پێ بەخشی، بۆیە ناوبردرا بە نیعمەتوالله ی کەرمانی، مامۆستا ڕەز و باغ و کشتوکاڵی زۆر بوو، بەروبوومەکەی خەرج دەکرد، لە خۆراکی فەقێیان و تەکیە و خانەقا و مورید و میوانان، بەو شێوەیە توانی خزمەتێکی لە ڕادە بەدەر بە ئایین و گەلەکەی بکا.

بە داخەوە ساڵی ٧٧٥ك – ١٣٧٣ز شەهید کرا، لە گۆڕستانی بەرانبەر گۆڕستانی شێخ خالیدی باپیرە گەورەی بە خاك سپێردرا.

خەلیفەکانی: عبدالخالق شارەزوری، عبدالغفار مەردۆخی، شێخ عەبدال مەحمود مەراغی، پیر ئیبراهیم، یەعقوب جان: ئەوە باپیری سێیەمی مامۆستا ئەبوبەکری (مصنف)ە.

کوڕەکانی: نیعمەتوالله، بابا عەلی، شێخ حەسەن، محەممەد شەریف، پیر یونس، میر طاهیر، بابا شێخ، میر موتەوەککیل، شێخ عەطار، شێخ یوسف، محەمەدئەمین، پیرمحەممەد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢١٣ – ٢١٥.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٩٤ – ١٠٢.

## زەکی ئەحمەد بەرزنجی (٥٠٣)

ناوی زەکی یە، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی زەینەلعابیدینی بەرزنجی شافیعی یە، لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٩٤ك – ١٨٧٧ز لە (مەدینە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر کرد، پاشان لە مزگەوتی خۆشەویست (د.خ) بەشداری خوێندنی دەرسی ئاڵقەی مامەکانی سەید عبدالکریم بەرزنجی و سەید جەعفەر بەرزنجی کرد، ئیجازەی وەرگرت.

دەستی کرد بە دەرسدانەوە لە مزگەوتی خۆشەویست (د.خ)، دوایی کرا پشکێنەر بۆ شافیعی یەکان، پاشان لە لایەن حکومەتی عوسمانی کرا (قازی)، دوایی لە لایەن حکومەتی هاشیمی کرا سەرۆکی (داد)، دوایی لە ساڵی ١٣٥٧ك کرا سەرۆکی دادگای گەورە، لە (مەککە)ی پیرۆز.

سیفەتەکانی: سەید زەکی لە ژێر چاودێری باوکی ئاین پەروەر و ڕەوشت چاك بوو، ملکەچ و نەرم و بێ فیز بوو، ڕاست و حەق گۆ بوو، ڕەشید و بەغیرەت بوو دڵ فراوان و خۆشەویست بوو، یارمەتی هەتیو و بێ نەوایانی دەدا.

قوتابییەکانی: شێخ حەسەن مەشاط، شێخ عەلەوی مالیکی، شێخ زەکەریا، شێخ ئەبوبەکر حەبەشی، شێخ موحسین موساوی، شێخ محەممەد یاسین قادانی، شێخ ئیبراهیم خوتەنی.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی دووشەممەی ٢٣ی مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٦٥ك – ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. قضاة المدينة المنورة ١/٧١ – ٧٢.
٢. نثر الجواهر والدرر ٤٤٩ – ٤٥٠.

## زەید ئەبو ئەنیسە جزیری (٥٠٤)

ناوی زەیدە، کوڕی ئەبو ئەنیسەی جزیری یە، زانایەکی شەرع زان و بەدین بووە، فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) لە کۆمەڵێك لە زانایەکانی (تابیعین) گێڕایتەوە، ئیمامی زەهەبی دەڵێ: {ناوبراو بڕواپێکراو بووە لە ١٢٥ك – ٧٤٢ز کۆچی دوایی کردووە.}

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ١/١٦٦.

٢. الأنساب ٤/٢٨٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٣٠٤.

## زەید جزیری نەصیبی (٥٠٥)

ناوی زەیدە، کوڕی جزیری یە، خەڵکی نوصەیبینە، بەندەی ئەسمائی کوڕی خەدیجە بووە، فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی عبداللەی کوڕی مەسعود گێڕایتەوە، خەڵکی شارەکەی خۆی لەویان وەرگرتووە، زاتەکی شەرع زان و بەدین بووە.

سەرچاوە: الأنساب ٥/٣٩٤.

## زەید زیاد حەڕانی (٥٠٦)

ناوی زەیدە، کوڕی زیادی، کوڕی حیمڕانی حەڕانی یە، نازناوی (ئەبوالفضل)ە، دەستی بە خوێندن کرد، ماوەکی زۆر خەریکی شەریعەت بووە تا شارەزا بوو، دوایی ڕووی خۆیدا زانیاری: ئامۆژگاری و نەحو و شیعر، ئیبن مستەفی[1] دەڵێ: {لە حەڕان کەمێکم لە خزمەت خوێند}.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ١/٢٩٦.

---

[1] لە ٥٦٤ ك – ١١٦٩ز لە دایکبووە، لە ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٠٤.

## زەینەب سولەیمان سعێرتی (٥٠٧)

زەینەب خان، کچی سولەیمانی، کوڕی ئیبراهیمی، کوڕی ڕەحمەتی (سعێرتی) یە، فەرموودەی خۆشەویستی (د.خ) لە چەند زانایانی پیاو و ژن وەرگرتووە، تا ئیجازەی وەرگرت، دەرسی دەدا، ساڵی ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد، تەمەنی (٨٠) ساڵ تێپەڕی بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢١٥.

٢. شذرات الذهب ٦/١٢.

٣. الدرر الكامنه ٢/٧١.

## زەینەب عبدالرحيم عێراقی (٥٠٨)

زەینەب خان، نازناوی (أم محمد)ە، کچی حافیزی عێراقی عبدالرحیم حوسێن عبدالرحمانە، لە بەرەبەیانی (١١)ی مانگی ذي الحجة ی ساڵی ٧٩١ك – ١٣٨٩ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە و ئیجازەی وەرگرتووە، موسنەدی ئیمامی ئەحمەدی لە باوکی بیستووە، سەفەری بۆ (مەککە)ی پیرۆز کردووە، لەوێ دەرسی داوە، ڕۆژی یەك شەمەی (١٨)ی مانگی مەولودی ساڵی ٨٦٥ك – ١٤٦١ز پاش ئەوەی چاوەکانی نەمان و گوێ یەکانی قورس بوون، کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی هەبوون: محەممەد، عبدالرحمان، عبدالقادر.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١٢/٤٠.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٠٥.

## زەینەب عبد الله بن تەیمییە (٥٠٩)

زەینەب خان، کچی عبداللەی، کوڕی عبدالحلیمە، برازای تەقیەدین ئەحمەد بن تەیمییەیە، زانایەکی فەرمووردەناس بووە، یەکە لە مامۆستایەکانی زانای بەناوبانگ ئیبن حەجەری عەسقەلانی - خاوەنی کتێبی (فتح الباری) شەرحی بوخاری -، ساڵی ٧٩٩ك - ١٣٩٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٥٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٠٥.

## زەینەب مەکی حەڕانی (٥١٠)

زەینەب خان، کچی عەلی، کوڕی کامیلی (حەڕانی)یە، نازناوی (أم أحمد)ە، خانمەکی زانا و بەدین بووە، بە کۆمەڵ خەڵکان بۆ خوێندن دەچوونە خزمەتی لە مانگی شەوالی ساڵی ٦٨٨ك - ١٢٨٩ز لە تەمەنی (٩٤) ساڵی دا، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. درة الحجال في أسماء الرجال ١/٢٧٨ - ٢٧٩.

٢. شذرات الذهب ٥/٤٠٤.

٣. معجم أعلام الكورد ٣٠٥.

## زەینەلعابیدین محەممەد بەرزنجی (٥١١)

ناوی زەینەلعابیدینە، کوڕی سەید محەممەد بەرزنجی یە، زانایەکی مێژووناس بووە لە پیاوە دیارەکانی (مەدینە)ی پیرۆز بووە، کتێبی (كشف الحجب والستور عما وقع لأهل المدينة مع أهل مكة سرور)ی داناوە، ساڵی ١٢١٤ك - ١٧٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٣٠٤.

- س -

## سالار حەسن هەولێری (٥١٢)

ناوی سالارە، کوڕی حەسەنی، کوڕی عومەری، کوڕی سەعیدی (هەولێری)یە، ناسراوە بە (کەمالەدین) لە مامۆستایە مەزنەکانی مەزهەبی شافیعی بووە، دەرسی لە لای (ابن الصلاح)ی شارەزوری خوێندووە، خۆشی دەرسی بە ئیمامی نەوەوی داوە، لە (دیمشق) کرایتە موفتی، کتێبی (بەحری رەویانی) کورت کردیتەوە لە چەند بەرگ، ئیبن ئەثیر دەڵێ: {نوسخەکی دەستخەتی دانەرم لە لایە}، مامۆستا سالار ساڵی ٦٧٠ك – ١٢٧١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٢٦٦.
٢. أربيل في مختلف العصور ٩٣.
٣. هدية العارفين ٥/٣٨٠.
٤. مشاهير الكورد ٢/١٢١.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢٢.
٦. معجم المؤلفين ٤/٢٣٥.
٧. شذرات الذهب ٥/٣٣١ – ٣٣٣.
٨. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٣٢٠.
٩. طبقات الشافعيه / ئەسنەوی ٢/٦٩.
١٠. معجم أعلام الكورد ٣٢٣ – ٥٦٢.

## سالم عەجلان حەڕانی (٥١٣)

ناوی سالمە، کوڕی عەجلانە، ناسراوە بە: (ئەفطەس)، خەڵکی (حەڕانە)، فەرموودەی لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕایتەوە، ساڵی ١٣٢ك – ٧٤٩ز بە دەستی عبداللهی کوڕی عەلی شەهید کرا.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ١/١٨٩.

٢. معجم أعلام الکورد ٣٠٨.

## سالم مەنصور خاپوری (٥١٤)

ناوی سالمە، کوڕی مەنصوری، کوڕی عبدالحمیدە، نازناوی (ئەبوغەنائیمە) لە دەوئاوی خاپوری جزیرە دانیشتووە، لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، لە شەریعەت دەستی بالاّ بووە، دوای ساڵی ٥٠٥ك - ١١١١ز چووە (بەغدا)، چەند ساڵ لە قوتابخانەی (النظامیة) دەرسی فەرموودەی خوێند، لە مانگی جیمادی دووەمی ساڵی ٦٠٤ك - ١٢٠٨ تەمەنەکی درێژ لە خزمەت ئایینی پیرۆز کۆچی دوایی کرد لە بەغدا.

سەرچاوە: معجم البلدان ٤/٩٦.

## ست الدار عبدالسلام بن تەیمییە (٥١٥)

ست الدار خان کچی عبدالسلامی، کوڕی تەیمییەی (حەڕانی)یە، خانمەکی فەرموودەناس بووە، لەلای عبداللطیفی کوڕی یوسفی خوێندووە، بوویتە مەلا دەرسی بە ئەبولعەبباس و ئەبومحەممەدی برازای خۆی داوە، چەندانی تر لە لایان خوێندووە، لە ٦٨٦ك - ١٢٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٣٠٨.

## ست العلم ئەحمەد حەڕانی (٥١٦)

ست العلم خان کچی ئەحمەدە، خەڵکی (حەڕانە)، ساڵی ٦٣٨ك - ١٢٤٠ز هاتووتە دنیا، خانمەکی فەرموودەناس بووە، مامۆستا ئەبومحەممەدی حەلەبی و چەند زانایانی تر دەرسیان لە خزمەت خوێندووە، ساڵی ٧٢١ك - ١٣٢١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٣٠٩.

## ستیتە محەممەد یوسف گۆرانی ( ٥١٧ )

ستیتەخان کچی محەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی عبداللّهی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی خضری گۆرانی یە، لە زانایەکانی صەدەی نۆی کۆچی یە، خانمەکی بە دین بووە، خوێندنی تەواوکردیە، ئیجازەی وەرگرتیە.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١٢/٥٧.

٢. مشاهیر الکورد ٤٣٨.

٣. معجم أعلام الکورد ٣١٠.

## سەعد حەسەن تورانی ( ٥١٨ )

ناوی سەعدە کوڕی حەسەنی کوڕی سولەیمانە، خەڵکی گوندی (توران)ی نزیك (حەڕان)ە، زانیاری تەواوی لە (نەحو) هەبوو، هەروەها نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، هاتووچۆی (شام) و (میصر) و (عێراق) و (خوراسان)ی دەکرد، بۆ بازرگانی لە مانگی ذي القعدەی ساڵی ٥٨٠ك - ١١٨٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بغیة الوعاة٥٧٧/١.

٢. معجم البلدان ٢/٥٧.

٣. معجم أعلام الکورد ٣١٣.

## سەعدەدین مەروان فارقی ( ٥١٩ )

ناوی سەعدەدینە، ناسراوە بە: سعداللّه، کوڕی مەروانی کوڕی عبداللّهی کوڕی خەیرە، خەڵکی (میافارقین)ە، زانایەکی زمان زان و زمان ڕەوان و شاعیر و ڕۆشنبیر و زەین تیژ و قسەخۆش بووە، خوێندنی تەواوکرد، چووە (میصر) ماوەك دەرسی دا، پاشان چووە (دیمشق) خەریکی دەرسدانەوە بوو، تا ساڵی ٦٩١ك - ١٢٩١ز کۆچی دوایی کرد، لەژێر چیای (قاسیون) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفیات ٢/٤٧ – ٤٨.

٢. شذرات الذهب ٥/٤١٨.

## سەعد عبدالله دیاربەکری (٥٢٠)

ناوی سەعدە، نازناوی سعدالدینه، کوڕی عبدالله یە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (طەرابلس) دابەزیوە، دەرسی کتێبی (الحاوی) داوە، هەروەها موفتی بوو، لە زانیاری ئوصولْ شارەزا بوو، ساڵی ٨٣٢ك – ١٤٢٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٣/٢٢٠.

## سعدالله عبدالأحد حەڕانی (٥٢١)

ناوی سعدالله یە کوڕی عبدالأحدی کوڕی سعداللهی کوڕی عبدالقادری کوڕی نەجیحی (حەڕانی)یە، ساڵی ٦٤٧ك – ١٢٤٩ز هاتووتەدنیا، زانیاری لە فەرموودە بەهێز بوو، چووە (بەغدا) زۆر ڕیزیان لینا، گەڕاوە (حەڕان) کە شارەکە خراپ کرا، باری کرد بۆ (ماردین)، ماوەك لە (رأس العین) بوو، دوایی چووە (حەما) لەوێ چووە (دیمشق) ناسرابوو بە زاتەکی دڵپاك و ڕۆشنبیر، خەریکی جێبەجێ کردنی ئیش و کاری خەڵکان بوو، لە ٧٢١ك – ١٣٢١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٢/٨٠.

## سەعدی خضر (خادیم سجادە) (٥٢٢)

ناوی سەعدیە، کوڕی مەلا خضرە، لە نەتەوەی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففانە (خوا لێی رازی بی)، ساڵی ١١٥٠ك – ١٧٣٧ز لە شاری (کۆیە) هاتووتە دنیا، هەر لەوێی خوێندووە و پێگەیشتووە، کتێبی (مشکلات القرآن)ی داناوە، محەممەد طەبەقچەلی بەغدایی مەدحی کردووە و پەسندی کردووە، چەند دانراوی تری هەنە، دەڵێن: هەمو دانراوەکانی خۆی لەسەر یەك دادەنان، تا ڕاست بە ڕاست بەژنی خۆی دەبۆوە، ئەو

بەرەبابە ناسراون، بە (خادم السجادە)، واتە: خزمەتگوزاری دووگوردی پێغەمبەر (د.خ)، ئەو دووگوردە کاتی خۆی خۆشەویست (د.خ) بە حەزرەتی عوسمانی بەخشی، دوای ئەو پشت بە پشت درا بە نەوەکانی، ئێستا ئەو دوگوردە لە (کەرکوکە)، خەڵکان ساڵانە جارەك یا دووجار دەچن زیارەتی دەکەن، کاکم مەلا طەیب، دەڵێ: {من لەگەڵ بەڕێزان مەلا فائیز مەلا عبدالله و مەلا سەید عبدالله گردەسۆری و مەلا عبدالله سەبحەی ڕەحیماوا، بەهۆی مامۆستا مەلا عبدالمجید قوطب و شێخ عبدالجبار شێخ عبدالباقی، بە خزمەت ئەو بەرماڵە گەیشتین، دیتمان لە تووکی حوشتر دروست کراوە، قاد قاد لەسەر یەك دانراوە، لە ناو قاسەکی قایم پارێزراوە، مۆری چەند زانایانی لە تۆمارەك پێوەبەستراوە، لەوانە: شێخ مەحمودی ئالوسی خاوەنی تەفسیری (روح المعانی)، قازی داودی دێری، لەگەڵ چەندان پیاوەماقوڵانی تر}.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ١٢٦٠ك – ١٨٤٤ز لە تەمەنی سەدو یازدە ساڵی دا، لە خزمەت ئاینی پیرۆزی ئیسلام کۆچی دوایی کرد، دوایی ئەو خزمەتگوزاری بەرماڵەکە کەوتە دەست مەلا محەممەد ئەفەندی کوڕی، دوای ئەو کەوتە دەست حاجی ئەمین ئەفەندی کوڕی، دوای ئەو کەوتە دەست ڕەفیق ئەفەندی کوڕی، دوای ئەو کەوتە دەست هەر سێ کوڕەکانی خۆی: عەلی ئەفەندی و ڕەئفەت ئەفەندی و ئەمجەد ئەفەندی.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢١.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٦٠٣ – ٦١١.

## سەعید ئیسماعیل دیاربەکری (٥٢٣)

ناوی سەعیدە، کوڕی ئیسماعیلی سۆرانی (دیاربەکری)یە، ناسراوە بە (ماویلی) چوویتە شاری (قوسطە نطەنیە) چووە (میصر) کرا سەرۆکی چاپخانەی بۆلاق، کتێبانی (الرسالة الفتحيه في بيان المراتب الجليلة العليه) و (رسالة اثبات الواجب)ی داناوە، ساڵی ١٢٤٧ك – ١٨٣١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ٤/٢١٩.
٢. هدية العارفين ١/٣٨٦ – ٣٨٧.
٣. معجم أعلام الكورد ٣١٧.
٤. مشاهير الكورد ٢٢٠.

## سەعید بەکر هیرانی (٥٢٤)

ناوی سەعیدە کوڕی بەکری کوڕی خدرە، نازناوی (خاکی)یە، خەڵکی (هیران)ە، ساڵی لە دایکبوون و ساڵی کۆچی دوایی لێم دیار نیە، ساڵی ١٨٧٠ز بەرگەکی کتێبی (توحفە)ی نووسیتەوە، ساڵی ١٨٧٤ز لە هیران دەرسی فەقێیانی داوە، ساڵی ١٨٧٦ز چوویتە (موصل) لە تەکیەی شێخ محەممەدی بامەڕنی دابەزی، لە بەرواری ٢٥/١١/١٨٨٣ز خەدیجەی ئیبراهیم بەگی خێزانی کۆچی دوایی کرد، پاشان گەڕاوە (هیران)، مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، یەك لە فەقێیەکانی ئەو بوو، دوایی چووە (دیبەگە) ماوەك لەوێ دەرسی دەدا، دوایی چووە (کۆیە) بووە مەلای مزگەوتی بایز ئاغا، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (دەروێش خدر) بە خاك سپێردرا.

بەرهەمەکانی:

١. أحرف المعاني: هۆنراوەیە بە عەرەبی، سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

أَلّفتها في مسجدِ الإيرانِ ربِّ احفظِ الجيرانَ من نيرانِ

٢. وەفاتنامەی پێغەمبەر (د.خ) سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

ئەووەل: بە زاتی کەریم دووەم: ڕەحمان و ڕەحیم
حەیی مەعبودی قەدیم (بكل شيء عليم)

دانەکی لەلای مەلا ئیساعیل شێخ عێزەدینی سەرانە، لە (هەولێر) مەلا مەحمودی عبدالصمدی سەران لە ٢٣/١/١٨٩٧ز لە بێتواتەی نووسیتەوە.

٣. هۆنراوەی (بەهنەسا): باسی گرتنی شاری ئەهناس و بەهنەسایە ڕزگار کردنیـان و هێنانەدەریان لـە دەست گاوران، هۆنراوەکی نزم سوار و سووك و خۆشە، جاران سەپان لـە کاتی دروونە و گاز دەیانگۆت سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

ئەووەل دەڵێم: ڕەببەنا　　لایقتە حەمدو سەنا
کار و بازاڕت دانا　　کە عالـەمت کرد بینا

کۆتایی یەکەی دەڵێ:

ببەخشی بە لوتفی خۆت　　ئەو عەبدی گوناهکارت
(خاکی) غەریبی ناشی　　دەربەدەری ناچارت
شەهیدیکەی لـە ڕێی خۆت　　شوکریکا هەزار جارت

دانەکی کۆپی دەستخەتی مامم مەلا عبدالقادر مەلا سولـەیمان مان لـە لایە، سـاڵی ١٩٦٨ز لـە گوندی پەلاسانی نووسیتەوە

سەرچاوەکان:

١. بەهنەسا: دەستنووسی مەلا عبدالقادر مەلا سولـەیمان.
٢. دەنگی زانا، ژمارە (٧) ساڵی ١٩٩٧ز

## سەعید ڕەحیم بۆکانی (٥٢٥)

ناوی سەعیدە، کوری مەلا ڕەحیمە، لـە (بۆکان)ی (ئێران)ژیاوە، خوێندنی لـەلای مەلا عەلی قزلجی و چەند زانایانی تر تەواوکرد، مامۆستا قزلجی ئیجازەی پێدا بووە مەلا لـە گوندی (تیکان تەپە)، ماوەی بیست ساڵان لـەوێ دەرسی داوە.

سەربردەیەك: مەلاسەعید لـەوکاتی لـەلای مامۆستای قزلجی دەخوێند، لـەبەرئەوەی مامۆستا دەرسی زۆربوو، فەقێیەکان سرەیان دەگرت، نۆرەی مەلاسـەعید هـات، مامۆستا بانگی کرد، کەهات زۆر کزبوو، مامۆستا لێی پرسی بۆچ وا کزی؟ وەڵامـی داوە: چـیت لێ بشارمەوە مـن چـیدی نـاخوێنم چـونکە خـۆم بـە ئیسـلام نـازانم، مامۆستا فـەرمووی تۆشێواوی چیە؟ گۆتی: لـەخەودا دیتومە چومە شاری (مەککە) پەلامیزەم پێداکرد، مامۆستا

گۆتی: بۆچوونی تۆ هەڵەیە، مانای خەونەکەت ئەوەیە کورێکت دەبی لەوێ (شاری مەککە) دەمری، مەلا سەعید ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز کۆچی دوایی کرد، کورێکی هەبوو، ناو مەلا ئەحمەد، چووە حەج لە (مەککە) کۆچی دوایی کرد ئەوەبوو کەرامەتی مامۆستا مەلا عەلی قزلجی.

سەرچاوە: ژیناوەری زانایانی کورد ٢٣٢ – ٢٣٥.

## سەعید سەعید فارقی ( ٥٢٦ )

ناوی سەعیدە، کوڕی سەعیدە، نازناوی (ئەبولقاسمە) خەڵکی (میافارقین)ە، زانایەکی نەحو و ڕێزمانی عەرەبی بووە، کتێبانی (تقسیمات العوامل وعللها) و (تفسیر المسائل المشكلة في أول المقتضب للمبرد)ی داناون، ساڵی ٣٩١ك – ١٠٠٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. هدیةالعارفین ١/٣٩٠.

٢. معجم المؤلفین ٤/٢٢٤.

٣. کشف الظنون ٢/١٧٩٣.

## سەعید سولەیمان ئاوماری ( ٥٢٧ )

ناوی سەعیدە، کوڕی سولەیمانی (ئاوماری)یە، مەلایەکی چاك و زیرەك بووە، لەگەڵ مەلا عبدالقادری کانی دەربەندی لە لای مەلا محەممەدی جەلی (کۆیە)ی دەخوێند، کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی لەوێ وەرگرت، لە (بەردەسپی) بووە مەلا، پاشان باری کرد بۆ (قەشقە)، ماوەی بیست و پێنج ساڵ لە دەشت مەلا بوو، دەرسی فەقێیانی دەداوە، ساڵی ١٩٦٣ز چووە سەفەری حەج بە ڕێگای (عەرعەر)، دوایی هاتە (هەولێر) لەوێ کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەد و کاك عبدالرحمانی لە دوا بەجێما.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربیل ١٢١.

## سەعید عبداللە باشتەپەیی (٥٢٨)

ناوی سەعیدە، کوڕی مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا ئۆمەری، کوڕی مەلا فـەیزوالله یە، عەشیرەتی (سیان)ە، ساڵی ١٨٨٨ز لە گوندی (باشتەپە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی باوکی کۆچی دوایی کرد، لەبەر ناڵەباری ژیانی و لەبەر دەست کورتی ماوەك وازی لە خوێندن هێنـا، دوایـی لە تەمەنی بیست ساڵی دا چووە (بەحرکە) سەرلەنوێ دەستی پێ کردەوە، دوایـی چـووە (دۆڵەسزە) لای مەلا عوسمان، ماوەکیش لە (کەسنەزان) و، مـاوەك لـە (هەرتـەل) دوایـی چووە (شەقڵاوە) لای مەلا طاها، پاشان چووە (پەسوە) لای مەلا عبداللە، چەند ساڵ لەوێ ماوە، قەرەنی ئاغای گوندەکە یارمەتی دەدا و کتێبـی بۆ دەکڕی، دوایی چـووە (ڕوانـدز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، دوا قۆناغی چووە (هـەولێر) لـە مزگـەوتی (قـەڵات) لای مەلا ئەفەندی، ساڵی ١٩١٩ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: لە (باشتەپە) بووە مەلا، دەرسی فەقێیانی دەدا، چەند مەلا لەسەر دەستی دەرچوون، بۆ نمونە: مەلا عبداللە فەرهادی، مەلا محەممەدئـەمین مـەلا ڕەسـول، مـەلا خضـر عارەبکەندی.

خووڕەوشتی: ناسرابوو، بە زانایـەکی پایـەدار، بـە دیـن و دڵپـاك، ڕووخـۆش و قسەخۆش، مەجلیس ئاوەدان، نوکتەزان.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٦٦ز کۆچی دوایی کرد، لە (باشتەپە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١٢١.

## سەعید عبداللە شارەزوری (٥٢٩)

ناوی سەعیدە، کوڕی عبداللەی، کـوڕی قـاسمی شـارەزوری یـە، نازنـاوی (ئـەبو ڕەضـا)یـە، سـاڵی ٥٠٦ك - ١١١٢ز هاتووتـەدنیا، دەرسـی فـەرموودەی لـە (بەغـدا) خوێندووە، دوایی چوویتە (خوراسان) لـەوێ شـەریعەت و بەشـێکی تـری لـە فـەرموودە

خوێند، بووە مەلا، چەندان زانا لەسەر دەستی دەرچوون، لە سالّی ٥٩٦ك - ١١٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الاعيان ٦/٨٣.
٢. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٥٨.
٣. تاريخ أربيل ١/٣٧٣ /٢/٥٨٠.
٤. مشاهير الكورد ١/٢٣٧.
٥. معجم أعلام الكورد ٣١٤.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢١.

## سەعید عبداللە قامیشی (٥٣٠)

ناوی سەعیدە، کوڕی مەلا عبداللە یە، سالّی ١٩١٨ز لە گوندی (قامیش) ناوچەی (ماوەت) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا ئەبوبەکری بۆسکێنی لە (سەرکەپکان)، ماوەکیش لای مەلا محەممەد بوو، لە (بێتواتە)، ماوەك لای مەلا خدری خورخوری، ماوەك لای مەلا ئەحمەدی ئبن ئادەم، سالّی ١٩٥٣ز باوکی دەستوری دەرسدانەوەی پێدا، هەر لە لای ئەو دەرسی فەقێیانی دەدا، دوایی باری کرد بۆ (زنگلاّن) لەوێ ڕۆیشت بۆ (ماخۆبزنان) لەوێ چووە (پیرانان) پاشان چووە (گردمەمەند)، سالّی ١٩٥٧ز چووە (کۆلەك) لەوێ چووە (چوارقوڕنە) سالّی ١٩٦٤ز لەوێ حوجرەی فەقێیانی دروست کرد، سالّی ١٩٦٧ز بە سەرپەرشتی شێخ مصطفای باقلان مزگەوتیان بۆ دروست کرد، سالّی ١٩٨٢ز چووە (سارتکە) لە ١٩٨٥ز چووە (سلێمانی) لە ٧/٣/١٩٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی هەبوو: مەلا محەممەدئەمین و کەیوان.

سیفەتەکانی: دوور لە دنیا بووە، ڕوو لە خوا بووە، تێکەڵی کاربەدەستان نەبووە لەگەڵ هەژاران برادەر بووە، بیٚ فیز بووە، خۆهەڵکێش نەبووە، قسەخۆش بووە، ڕێزی خەڵکانی گرتووە، پابەند بووە بە شەریعەت، نیشتمانپەروەر بووە.

سەرچاوە: پەیامی زانایان، ژمارە ١١/ ٧ ٢٠٠٧ز، ١١٨ – ١٢٠.

## سەعید عەلی ساداوە ( ٥٣١ )

ناوی سەعیدە، کوڕی عەلی، کوڕی خودامرادە، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بیارە) لای مامۆستا مەلا عبدالکریم (مدرس) تەواوی کرد ئیجازەی وەرگرت بووە مەلا، لە (ساداوە) نزیك (پێنجوین) دەرسی دەدا، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، تا ساڵی ١٤٠٠ك – ١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد، مەلا یوسفی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢٦.

## سەعید فەرهاد فەرهادی ( ٥٣٢ )

ناوی سەعیدە، کوڕی فەرهادی، کوڕی مەولودی، کوڕی عوسمانی، کوڕی حەمەدی، کوڕی دەروێش مەمانە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٧ز لە گوندی (لهێبان) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن لەگەڵ مەلا صادقی برای لە چەند شوێن گەڕا، تا قۆناغەکانی خوێندنی بردەسەر، لە کۆتایی دا چووە مزگەوتی (قەڵات) لە (هەولێر) لای مەلا ئەفەندی، ماوە لە خزمەتی، تا ساڵی ١٩٣٩ز ئیجازەی وەرگرت لەگەڵ ئەو بەڕێزانە: مەلا صادقی برای و مەلا محەممەدئەمینی سوێری.

ئەمجا بووە مەلا، لە گوندی (ماجید) ماوەك لەوێ بوو، دوایی باری کرد، هاتە (هەولێر)، ساڵی ١٩٦١ز کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی مەلا (نەبی) لە گەڕەکی تەعجیل، مامۆستا دەنگی خۆش بوو، زۆرجاران بەشداری ئاهەنگ گێڕانی ئیجازەی مەلایانی دەکرد، بە خوێندنەوەی چەند هۆنراوەی ئاینی، ساڵی ١٩٩٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (مەعمەل قیر) لە هەولێر بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. هەولێرم وادیوە ٨٧ – ٨٨.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٣٩٠ – ٣٩١.

٣. نامەی دەستنووسی حەمەصالّح مەلا صادق فەرهادی.

## سەعید کولەجۆ (٥٣٣)

مامۆستا سەعید کولەجۆ یەکە لە زانایە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، لە شاری (کفری) و دەوروبەری خوێندنی بردەسەر، بووە مەلای (کولەجۆ) نزیك (کەلار) ساڵی ١٣٨٢ك – ١٩٦٢ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عەلی کوڕی بووە جێگری.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢٧.

## سەعید ماردینی (٥٣٤)

مامۆستا سەعید، خەڵکی (ماردین)ە، زانایەکی شەرع زان و مەزهەب حەنەفی بووە، لە لای شێخ عبدالحکیمی ئەفغانی و چەندان زانای دیمشقی خوێندووە، پاشان دەستی بە ئیشی بازرگانی کرد، لە ١٣٤٤ك – ١٩٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ١/٤٧٣.

## سەعید محەممەد بەدلیسی (٥٣٥)

ناوی سەعیدە، کوڕی شێخ محەممەدە، لە گوندی (بیسان) سەر بە قەزای (بەدلیس) هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، دوایی چووە لای مەلا صبغةاللّٰهی فارسی نەقشبەندی و مەلا محەممەد و مەلا جەلالی کوڕی مەلا محەممەد لە شاری (هیزان)، پاشان ئیجازەی لە مەلا خەلیفە سەلیم وەرگرت، مامۆستا بە توندی ڕووبەڕووی کردارە دڕندەکانی ئەتاتورك دەوەستا، خەڵکی لێ گاردەدا، بانگەوازی دەکرد بۆ ئەوەی لە دژی هەستن، کارەکانی لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ، بۆیە ئەتاتورك بڕیاری لە سێدارەدانی دا، بەڵام مامۆستا ئازا و دلێرانە، خۆی نەدا دەست، لەگەڵ مەلا عبدالمجیدی برای، خۆیان گەیاندە (دیمشق) لە گەڕەکی کوردان نیشتەجێ بوو، لە مزگەوتی کوردان دەستی کرد بە

دەرسـدانەوە و بەلاوکردنـەوەی دەسـتووری تەریقـەت، بـەرێزانی وەك شـێخ حەسـەن حەبەننەکە و عبدالحکیم مونیر و محەممەد ئەمین زەهەبی و شێخ ئەحمـەدی کفتـارۆ سـەرۆکی زانایانی (سوریا) دەرسیان لە خزمەت ئەو زاتە دەخوێند.

ماموستا زاتەکی بە دین و دلپاك بوو، لە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) شـارەزابوو، لە شەریعەت وئوصول دەستی بالاّ بوو، خەتی خۆش بوو، بە تایبەت لە (ثلـث) و (نسـخ) ماموستا بوو.

دوو نامیلکەی کوردی هەیە: یەکەم: فەرائیز، دووەم: ئوصول.

ماموستا خەزووری (بدیع الزمان) سەعید نورسـی یـە، سـالّی ١٩٤٣ز لـە شـاری (مەدینە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، لە گۆرستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٣١٧.

## سەعید محەممەد گوران (٥٣٦)

ماموستا قـازی سـەعید گـورانی یـە، بـەلاّم محەممـەد و بـەهرامی بـاپیری چـووینە (حەلـەب)، پێشتر لە صەدەی حەفتەمی کۆچی باپیرەگەورەکەیان لـەوێ نیشـتەجێ بـووە، ماموستا سەعید زیرەك و شـاعیر بـووە، سـالّی ٩٨٣ك – ١٥٧٥ز لـە حەلـەب کۆچـی دوایی کردووە.

سەرچاوە: مشاهیر الکورد ٢٢١

## سەعید محەممەد مائی (٥٣٧)

ناوی سـەعیدە، کـوڕی مـەلا محەممـەدی، کـوڕی مـەلا سـەعیدی، کـوڕی مـەلا عبدالواحیدی، کوڕی مەلا سەعدی، کوڕی عبدالقادرە، ناسراوە بـە (سـەیدا) عەشـیرەتی بەرواری یە، سالّی ١٩٢٩ز لە گوندی (بریفکان) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، چەند کتێبـی سەرەتایی خوێند، دوایی چووە گوندی (ڕەبەتکی) سـەر بـە ئەترووش لای مەلا شێخ جەعفەر، دوایی چووە بەرواری بالاّ لای مەلا محەممەدئەمینی مـائی، ماوەك چووە (ئەسپێندارە) لای مەلا حوسێن، پاشـان چـووە (زاخـۆ) لای مـەلا ئەحمـەدی

زاخۆیی، چووە (ئـاکرێ) لای مـەلا ئەحمـەدی ئـاکرێ، دوا قۆنـاغی هاتـە (هـەولێر) لـە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مامۆستا مەلا عبداللە بێتواتەیی ئیجازەی وەرگرت، بـووە مەلا لـە مزگەوتی خانەقای شێخ مەزهەر، دەرسی دەداوە سـالّی ١٩٦٠ز کـرا مامۆسـتای سەرەتایی وەزارەتی پـەروەردە، لـە گونـدی (حەسـەن شـام) سـەر بـە ئـەترووش، سـالّی ١٩٨٠ز گەڕاوە وەزارەتی ئەوقاف، کرا مەلا لە مزگەوتی (مانگیش) لە (دهۆك)، پاشـان گـەڕاوە (هـەولێر) کـرا مـەلا، لـە مزگـەوتی (قـەلاّت)، پاشـان گـەڕاوە خانـەقا، لـە ١٥/٧/١٩٨٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ناو بازاڕ بە خاك سپێردرا.

بەشێك لـە فەقێیەکانی: مەلا عوسمانی ماجیداوەی، مەلا خالیدی ئەترووشـی، مـەلا مصـطەفای کۆزەپانکەی، مەلا حەکیمی کۆزەپانکەی.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٢٨٥ – ٢٨٩.

## سەعید مەحمود پیران (شێخ سەعیدی پیران) (٥٣٨)

شێخ سەعید کوڕی شێخ مەحمودی پیرانە –گوندێکـە لـەڕۆژئاوای (مـورات) –، سالّی ١٢٨٥ك ـ ١٨٦٨ز لە گوندی (کلدار) هاتووتەدنیا، لەخزمـەت بـاوکی دەسـتی کرد بەخوێندن، قورئانی پیرۆزی لەبـەرکرد، شـەریعەتی تـەواوکرد، پـاش کۆچـی دوایـی بـاوکی (لـە سـالّی ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز)، خـۆی بـووە جێگـری لـەکاروباری ئـایینی، زانایەکی مەزن و بـەدین و زیـرەك بـووە، شـاعیر و ڕۆشـنبیر و نووسـەر بـووە، چـەندان قەسیدەی نایابی بە کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، دوازدە ئیجازەی مەلایەتی داوە، بـەو کەسانە کە دوایی ڕێ نیشاندەری گەلی کورد بووینە.

ناوبراو تەریقەتی نەقشبەندی بەکاردەهینا، مریدی لـە عێـراق و ئێـران و تورکیـا هەبوون، لەگەلّ ئەو هەموو خواپەرسـتیە و تاعەتـە، کوردایـەتی هـەر لـەبیر بـوو، وەکـو ڕۆلّەکی دلّسۆزی نەتەوەکەی، هەستی کوردایەتی لە دلّدا کاری لـێ کردبـوو، بۆیـە لـە (٧)ی ئازاری سالّی ١٩٢٥ز شۆڕشـی سـازدا، بـە نیـازی ئـازادکردنی گەلەکـەی، لـە ستەمکاری و زۆرداری، بە تایبەت لە قانوونـە چـلّکنەکەی کـەمال ئـەتاتورك کـە سـالّی

١٩٢٤ز بە زەقی حاشای لە هەموو مافەکانی گەلی کورد کرد، شێخ سەعید لەگەڵ مرید و سەرۆك هۆزەکان هەستان بەشێکی زۆریان لە کوردستانی تورکیا ئازاد کرد، سەرباز و هێزەکانی تورکیان لێ دەرکردن، لەوانە: دیاربەکر، خاربوت، ئەرگانا، پالوو، پیران، سولیوان، هازور، چرمیك، لە رۆژئاوای دەریای وان تا دەگاتە (مالاتیا)، شاری (کینج)ی کردە پایەختی کاتی کوردستان، وەیزانی مصطفا کەما پاشا لەشکرەکی گەورەی چەکداریان - کە بریتی بوو لە سێ هەزار کەس - ناردە سەر کوردستان، بە هاوکاری دەوڵەتانی ئاوروپا بە تایبەت فەرەنسا، ئابلوقەی لەشکری شێخیان دا، شێخ سەعید و سوپایەکەی ماوەك لە چیایەکان خۆیان حەشاردا، بە داخەوە لە ئەنجامدا بەشێك لە سەرۆکەکان شەهیدکران، ئەوانی تر کە ژمارەیان بیست و پێنج سەرکردە بوو، هەر هەموویان لەگەڵ شێخ بە دیل گیران، وە لە بەرواری ١٥/٥/١٩٢٥ز هەر هەموویان لەسەریان دراو ئیعدام کران، ئەمجارەش شۆرشی کورد کوژاوە و کۆتایی پێ هات، بەڵام ژێردەستە بوونی گەلی کورد هەمیشە هەر لە زیادبووندا بووە و کۆتایی پێ نەهات، خوای گەورە ئازادمان بکا.

سەرچاوەکان:

١. تاریخ مشاهیر کورد ٣/٥٨٣ - ٥٨٦.

٢. معجم أعلام الکورد ٣١٨ - ٣١٩ - ٧٠١.

٣. مشاهیر الکورد ٢٢٢.

٤. شۆرشەکانی کورد ٥٤ - ٥٥.

٥. مێژووی ئەدەبی کوردی ٥/١٧.

٦. محمد بن عبدالله الجلي ٢٩٧.

### سەعید مصطفی باغەمرەیی (٥٣٩)

ناوی سەعیدە، کوری مصطەفای کوری سەعیدە، لە خزمەت باوکی لە گوندی (چەلتوك) ناوچەی (کەندیناوە) دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆز و کتێبە

سەرەتاییەکانی تەواوکرد، لە چەند شوێنان گەڕا بۆ فێربوونی زانیاری، هەروەها چووە قوتابخانەی حکومەتی عوسمانی لە (مەخمور) لەوێ فێری زمانی تورکی بوو، هاتووچۆی چەند زانایانی کرد، تا فێرە شەریعەت و ڕێزمانی عەرەبی بوو، پاش جەنگی جیهانی یەکەم بووە مەلا لە (باغەمرە)ی مەلا ئەفەندی، دەوری چل ساڵان لەو گوندە خەریکی دەرسدانەوە و کاروباری ئاینی بوو، تا لە مانگی (٥)ی ساڵی ١٩٧٨ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٤٩.

## سەعید میرزا نورسی (٥٤٠)

ناوی سەعیدە، کوڕی صۆفی میرزایە، ناسراوە بە: (بديع الزمان)، ساڵی ١٨٧٣ز لە گوندی (نوڕسی) ناحیەی (ئەسباریت) قەزای (خیزان) سەر بە (بەتلیس) لە کوردستانی تورکیا، لە دایك و باوکێکی ئاین پەروەر، هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە گوندی (تاغ) دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە منداڵییەوە سیمای زیرەکی پێوە دیار بوو، دوای خەتم کردنی قورئانی پیرۆز دەستی کرد بە گەڕان و سوڕان، لەو شوێن بۆ ئەو شوێن، لەو شار بۆ ئەو شار، لەو گوند بۆ ئەو گوند، نەحو و صەرف و بەلاغەی لە لای مەلا عبداللەی برای تەواوکرد، دوایی چووە لای مەلا محەممەدئەمین و شێخ سەید نور محەممەد، ساڵی ١٨٩٠ز بۆ خوێندنی تەفسیر و فەرموودە و شەریعەت چووە لای مەلا شێخ محەممەدی جەلالی بایەزید.

هۆی سەرکەوتنی زانیاری: لە کاتی فەقێیەتی و گەنجی شەوێك لە خەودا، شادمان بوو، بە دیتنی جەمالی پاکی پێغەمبەر (د.خ) لەو خەوە مەلا سەعید داوای فێربوونی عیلم و زانستی لێ کرد، خۆشەویست (د.خ) فەرمووی: {خوای گەورە فێری زانستی قورئانی پیرۆزت بکا، بەشێوەیێکی وا کە پێویستیت نەبی پرسیار لە کەس بکەی}.

خوای گەورە ئەو دوعایەی قەبوڵ کرد، شارەزاییەکی وای پەیدا کرد، بووە دەریای زانستانی ئەقلی و نەقلی، لە هەموو بابەت مەلەوان و پسپۆڕ بوو، بۆیە لە ناو

خەڵکان ناوی بەلاوبۆوە بە (بدیع الزمان) واتە زانایەکی وایە،، نایابە و وێنەی چەنگ ناکەوی، لەو چەرخە بژاردەیە، کەس وەك ئەو هەڵناکەوی، ساڵی ١٨٩٢ز چووە (ماردین) لای مەلا سەعید، ماوەکیش لە شاری (تیلو)ی خوێند، قامووسی فەیرۆز ئابادی تاپیق (س) لەوێ لەبەر کرد، ساڵی ١٨٩٤ز چووە شاری (وان) بۆ زانیاری تەواو لە ئەستێرەناسی و کیمیا و فیزیا و مێژوو، ساڵی ١٩٠٧ز چووە (ئەستەمبۆڵ) سوڵتان عبدالحمید چەند زانایەکی کۆکردنەوە، پرسیاریان لە مامۆستا دەکرد، ئەویش وەڵامی دەدانەوە، لایان سەیر بوو ئەو هەموو شتانە دەزانی، لە هەموو بابەتێك لە خۆبوویتەوە، لە کۆتاییدا دانیان بەوەدانا، کە زانینی ئەو پیاوە بە ماندووبوون و خوێندن نیە، تەنیا شتێکە خوای گەورە پێی بەخشیوە.

مەلایەتی: ساڵی ١٩١١ز چووە (شام) لە مزگەوتی ئەمەوی ووتاریکی دا، بانگەوازی موسوڵمانانی کرد، بۆ هۆشیاربوونەوە و یەکدی گرتن، گەڕاوە (ئەستەمبۆڵ) پێشنیاری دامەزراندنی زانکۆی ئیسلامی پێشکەش بە سوڵتان ڕەشاد کرد، ڕەزامەندی نواند و پارەی بۆ تەرخان کرد، بەڵام جەنگی جیهانی بەسەردا هات و پڕۆژەکە سەری نەگرت.

مامۆستا نورسی ماوەك ئەندامی دەستەی باڵا بوو لە حکومەتی عوسمانی، سەرۆکی لەشکری چینی یاریدەدەری خێرخوازان بوو، لە جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵەی (الأنصار)ي لە فەقێیانی خۆی دروست کرد، بەرەو ڕووی هێزی روسەکان وەستان، لەلای (قەفقاس)، لەو کاتە لەناو خەندەکی شەڕ تەفسیری قورئانی پیرۆزی بەناوی: (إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز)ی تەواو کرد، کە لەشکری ڕووسان گەیشتە (بەتلیس) خۆی و فەقێیەکان شەڕێکی چاکیان کرد، بەڵام بە داخەوە مامۆستا بە سەختی بریندار کرا وە لە لایەن ڕووسەکان دەستگیرکرا، هاویشتیانە ناو بەندیخانە، لەوێش ئامۆژگاری خۆی هەر دەکرد، پاشان خوای گەورە دەرفەتیدا، هەڵات و شێرانە لە دەستیان دەرباز بوو، لە ڕێگادا بە (وارشۆ) و (ئەڵمانیا) و (ڤیەننا)دا چوو، گەڕاوە (ئەستەمبۆڵ) پێشوازییەکی

گەرمیان لێ کرد، کردیانە ئەندامی (دار الحکمة)ی ئیسلامی، ساڵی ١٩٢٢ز بانگیان کرد بۆ (ئەنقەرە) بۆ هاندانی موسوڵمانان دژی یۆنانەکان، ساڵی ١٩٢٣ز وازی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هێنا، ڕووی کردە شاری (وان)، ماوەی دوو ساڵان لە کێوی (ئەراك) خەریکی خواپەرستی بوو، تا ئەو ڕۆژە دەڵێتە خۆی: (سەعیدی کەون)، لەو ڕۆژە بەدواوە بە خۆی دەڵێ: (سەعیدی نوێ)، دوایی خۆی و فەقێیەکانی دوور خرانەوە، بۆ شوێنەك بە ناوی (بوردور)، پاشان تەنیا مامۆستا دوورخراوە بۆ (بارلا)، ساڵی ١٩٢٦ز لەوێ نیشتەجێ کرا بە زۆری (الإقامة الجبرية)، بەڵام دژانی ئیسلام بە بەندکردن و دورخستنەوە و ئازار و ئەشکەنجەدان نەیانتوانی بەرگری مامۆستا بکەن لە بەلاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، لەو ماوەی لە (بارلا) بوو، زۆربەی (رسائل النور)ی نووسی و بۆ وڵاتانی نارد، دوایی گرتیان لە بەندیخانەی (ئەسکی شەهر)، گواستیانەوە بۆ بەندیخانەی (دینزلی)، پاشان ماوەی هەشت ساڵان نیشتەجێی بە زۆری کرا لە (قسطمونی)، ساڵی ١٩٤٤ز دوورخراوە بۆ قەزای (ئەمیرداغ).

ساڵی ١٩٤٨ز گیراوە لە بەندیخانەی (ئافیون) لەوێ کتێبی (الثمرة) و (حجة الزهراء)ی تەواوکرد، ساڵی ١٩٥٠ز بەردرا - بەڵام نیشتەجێ کرا بە زۆری لە (ئەمیرداغ)، ساڵی ١٩٥٣ز بە زۆری ناردیانە (قۆنیە)، دوایی ناردیانە (ئۆرفە).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا حامی، زوبێر قۆنەوی، مەلا رەسولی وانی، مەلا حافیزی عەلی، مەلا خولوصی یەحیا، مصطەفا سونگوڕ، محەممەد فەیزی، محەممەد طاهیر موتلو، محەممەد حافیز تەوفیق.

کۆچی دوایی: لە ٢٣/٣/١٩٦٠ شەوی (لیلة القدر)ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ساڵی ١٣٧٩ك لە شاری (ئۆرفە) کۆچی دوایی کرد، لە (اولو جامع) بە خاك سپێردرا. پاش پێنج ساڵان لەسەر بڕیاری حکومەتی تورك، تەرمی پیرۆزیان، دەرینا، بردیانە شوێنێکی نەزاندراو.

بەوبۆنەیە دەڵێم:

تەرمەکەی لابەی بۆ جێی نالەبار تاکو بزربی، بۆ جێی نادیار
کەس پیێ نەزانی بچتە زیارەت نەمینیٚ شوێنی تاکو قیامەت
ئەدی چی دەکەی لە زانیاری هەموو نوسین و چاکە و کرداری
تەرجومەکران بە چەندان زمان بەلاوکراون، وا لە چاپ دران
ئەو زانستانەی لە هەموو جیهان لە وڵاتان و لە ناو کوردستان
تریسکە دەدەن وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ خاوەن بڕوا و، لاوانی دڵپاك
قوڕت بەسەری لە خەفەت ماوی کەنەفت و چاوشۆڕ، سەر لێ شێواوی
ئەو کەسی لە دڵ دژی ئایینە سەراوژێری کەی ڕەببی (ئامینە)

بەرهەمەکانی:

١. الصيقل الاسلامي: ساڵی ١٣٢٧ك لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا
٢. الخطبة الشامية: ساڵی ١٣٣٨ك چاپ کرا.
٣. قزل ايجاز على السلم: ساڵی ١٣٣٩ك چاپ کرا.
٤. ايشارات الاعجاز في مظان الايجاز: ساڵی ١٣٣٤ك چاپ کرا.
٥. التفكر الايماني الرفيع: ساڵی ١٩٧٤ز لە بێروت چاپ کرا.
٦. المثنوي العربي النوري: ساڵانی ١٣٤٠،١٣٤١،١٣٤٢ك لە ئەستەمبۆڵ چاپ کرا.
٧. الخطوات الست.
٨. الحزب النوري.
٩. ریچك: کوردی و عەرەبی و تورکییە.
١٠. سوزلر.
١١. مكتوبات.
١٢. لمعلر.
١٣. شعاعلر.

١٤. سنوحات.

١٥. بارلا لاصقەلی.

١٦. قصطمونی لاصقەسی.

١٧. ئەمیرداغ لاصقەسی.

١٨. سکه تصدیق غیبی.

١٩. محاکمات.

٢٠. مناظرات.

٢١. لمعات.

٢٢. نورعا لمنك انا ختاري.

٢٣. دیوانی حرب عرفی.

٢٤. رموز.

٢٥. شوعاعات.

٢٦. طلوعات.

٢٧. نطق لر

٢٨. مقالەلر.

٢٩. معرفة النبـي (صلى الله عليه وسلم).

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٧١ – ٢٧٦.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٢٠ – ٣٢٢.

٣. دەنگی زانا، ژمارە ٦٤/ ٢٠٠٢ز.

٤. علماء الاسلام ١٨٣ – ١٩٧.

٥. ذكريات عن سعيد النورسي.

٦. الآية الكبرى.

٧. المثنوي العربي النوري.

٨. حقيقة التوحيد.

### سەکینە محەممەد گۆران (٥٤١)

سەکینەخان کچی محەممەدی کوڕی یوسفی گۆرانی یە، مامۆستایەکی خاوەن زانیاری صەدەی نۆیەمی کۆچی بووە، خوشکێکی ناو فاطیمەی هەبووە، ئەویش زانابووە ساڵی ٧٦٤ك – ١٣٩١ز لە دایك بووە، لە ٨٧٣ك – ١٤٦٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ١٠٠/١٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٣٤.

٣. مشاهير الكورد ٢/٢٣٧ – ٢٤٦.

### سەلام ئەحمەد کاژاوی (٥٤٢)

ناوی سەلامە، کوڕی سەید ئەحمەدی کاژاوی یە، ساڵی ١٩٠٤ز لە گوندی (زێوە) سەر بە (سەردەشت) هاتووتەدنیا، ساڵی ١٩١٢ز باوك و دایکی هەردووك کۆچی دواییان کرد، بە هەژاری لە حوجرەی (نەلاس) دەستی بە خوێندن کرد، پاشان چووە ناو مەنگوڕان لە (میراوە) لای مەلا خەلیل ماوەکی خوێند، لەوێوە چووە لای مەلا شێخ محەممەدی بێژەوی، دوایی هاتە (سلێمانی) لەوێ (جمع الجوامع)ی تەواوکرد، گەڕاوە (ئێران) لە باغچەی موکریان لای مەلا سەید عبدالکریم ماوە، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (نەمەشیر) سەر بە (بانە)، دەرسی فەقێیانی دەدا، دوایی چووە ئەو گوندانە: (نەلاس)، (لیلانە)، (ڕەبەت)، (هەنداوی)، (بەسرێ) لە ناوچەی سەقز و سەردەشت، ئیجازەی بە چەند مەلایان داوە، ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣٠١ – ٣٠٢.

## سەلامە صەدەقە حەڕانی (٥٤٣)

ناوی سەلامەیە، کوڕی صەدەقەی کوڕی سەلامەیە، خەڵکی شاری (حەڕان)ە، زانایەکی شەرع زان بووە،، زانیاری تایبەتی لە (فەرائیز) و (ژمێریاری) و (جەبر) و (موقابەلە) هەبووە، کتێبی (مقدمة في الفرائض)ی داناوە، ساڵی ٦٢٧ك – ١٢٢٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/١٢٣ – ١٢٤.

٢. معجم المؤلفين ٤/٢٣٦.

٣. الكفاية في المواريث / ملحق ١٩٠.

## سەلامە عومەر نەصیبی (٥٤٤)

ناوی سەلامەیە، کوڕی عومەری کوڕی عیسای کوڕی حارسی کوڕی قاسمە، ساڵی ٣٣٧ك – ٩٤٨ز لە شاری نوسەیبین هاتووتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس و بڕواپێکراو بووە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٤١٧ك – ١٠٢٦ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، مامۆستا عبدالکریم سەمعانی دەڵێ: {منیش یەك بووم لەوانەی نوێژیان لەسەر کرد}.

سەرچاوە: الأنساب ٥/٣٩٥.

## سەلمی محەممەد جزیری (٥٤٥)

سەلماخان، کچی محەممەدی کوڕی محەممەدی جزیری یە، نازناوی: (أم الخير)ە، ئەو خانمە قورئانی پیرۆزی لەگەڵ هەر دە جۆرە خوێندنەوەکانی لەبەر بووە، لە زانیاری قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، شاعیر و زمان ڕەوان بووە، شیعری عەرەبی و فارسی هەیە، هەروەها خۆش نووس بووە، ساڵی ٨٣١ك – ١٤٢٧ز لە ژیاندا بووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٣٢٣.

## سەلمان عومەر حەڕانی ( ٥٤٦ )

ناوی سەلمانە، کوڕی عومەری کوڕی سەلمانە خەڵکی حەڕانە، مەزهەبی حەنبەلی یە زانایەکی شەرع زان و ئوصوڵ زان بووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: الراجح في أصول الفقه، إعتقاد أهل حران، نفي الآفات عن آيات الصفات، صرف الإلتباس عن بدعة قراءة الأخماس. دوای ساڵی ٦٢٠ك – ١٢٢٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/١٧٨.

٢. معجم المؤلفين ٤/٢٤٠.

٣. هدية العارفين ٥/٣٩٨.

## سەلیم ئەحمەد مەردۆخی ( ٥٤٧ )

ناوی سەلیمە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالکریمی کوڕی عبدالغفاری کوڕی حەمەکەریمی کوڕی مەحمودی کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخ مصطفای تەختی یە، ناسراوە بە: مەردۆخی ساڵی ١٢٦١ك – ١٨٤٥ز لە گوندی (تەخت) سەر بە (سنە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٢٧٦ك – ١٨٥٩ز چووە (سنە) لە ١٢٨١ك – ١٨٦٤ز چووە (بیارە) سیوطی خوێند، دوایی چووە (مەریوان)، ساڵی ١٨٦٦ز گەڕاوە (سنە) لای مامۆستای نۆدشەیی شەرحی عەقائید و (مختصر)ی خوێند، لە ١٨٦٩ز چووە (سابلاغ) لای مەلا عبداللهی پیرەباب ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (سنە) لە مزگەوتی شێخ سەلیم کرا (مدرس)، خەریکی دەرسدانەوە و کاروباری ئاینی بوو، ناوبراو جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بوو، ناودەبردرا بە (امرؤ القيس)ی کوردان، نازناوی شیعری (سالم) بووە، شاعیری تریش هەیە بەو نازناوە، ناوی عبدالرحمانە کوڕی محەممەد بەگی صاحێبقڕانە، ئەوە جیایە لەگەڵ ئەو سالمەی ئێمە باسی دەکەین.

مامۆستا سەلیم پاش تەواوکردنی زانستەکان دڵی بزفت بۆ وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی، چووە خزمەت شێخ عومەری (بیارە)، لە دوورڕا بە دەرکەوت شێخ فەرمووی ئایا دەزانن (سەلیم) بۆچی هاتووە؟ هەریەك ڕاوێژێکی هاویشت، شێخ فەرمووی: نا نا بۆ ئەوشتانە نەهاتووە، تەنیا بۆ یەك تێ هاتووە، واتە: پیتی تێ (ت) باوێتە سەر ناوەکەی خۆی (سەلیم) دەبێتە: تەسلیم، واتە: دەبێتە صۆفی و مریدی ئێمە، مامۆستا سەلیم بووە مریدەکی ڕاستەقینە، خۆشویستنی شێخ عومەری لە دڵ و دەروون و هەموو ئەندامی چەسپا، چەند شیعری کوردی و عەرەبی لە مەدحی شێخ داناوە، لەوانە بۆ نمونە، بە عەرەبی دەڵێ:

من حسنه قد تم وما خالط شينا | من أصبح في الحسن وحسناه حسينا
من كان بدور فلك الدين سهاه | من دك له الصم وكانت له لينا
من زمرة أصحاب جمال وجلال | من عزه يمشون حواليه هوينا
من ذب عن الدين دجى البدعة ذبا | من زان سنا طلعته الملة زينا
شمس لسناها أفلت كل شموس | من أفئدة الخلق ازاحت هي رينا
أعني (عمر) الثاني ومن فيه تجلي | مولاه غدا قلبه طوراً له سينا

بە کوردیش، دەڵێ:

پیری صیددیقی طەریق و تاجی فاروقی لەسەر
واریسی عوسمانی زیننورەین و کەڕڕاری سەبات
ڕووحی شیرنم لە دەوری قەددی شمشادت گەڕێ
تا تەسەددوق بێ لە بۆرەددی هەموو دەرد و بەلات
خاڵی هیند و زوڵفی چین و ڕۆمی ڕوویی ڕوومەتت
وان لە قەبزەی قەهری شمشێری برۆی جەنگ ئازمات
گیان فیدای گوفتاری شیرینت کە عەینی حیکمەتە
کەشفی ئەسراری تەریقەت جەللی کونهی موشکیلات

بێنە مەیدانی سەداقەت (سالیما) قەلبی (سەلیم)

تا موشەررەف بێ بەیومنی دەوڵەتی بیری خودات

ساڵی ١٩١٤ز کۆچی دوایی کرد، لە مزگەوتەکەی خۆی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥٤١ – ٥٦٤.

٢. ژیناوەری زانایانی کورد ٥٦٦ – ٥٧٠.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢٣ – ٢٢٥.

٤. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٦٠٥ – ٦٠٧.

## سولەیمان ئیبراهیم سعێرتی (٥٤٨)

ناوی سولەیمانە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی هبةالله یە، ساڵی ٥٦٧ك - ١١٧١ز لە (سعێرت) هاتووتەدنیا، بۆخوێندن چووە (دیمشق) لەلای زانایەکانی خوێند، لەوێ چووە (میصر) ماوەك لە (ئەسکەندەرییە)ی خوێند، تا کۆتایی پێ هێنا، بووە زانایەکی فەرموودەناس، چەند مەلا لەسەر دەستی دەرچوون، مامۆستا زاتەکی بڕواپێکراو و بەدین و زمان ڕەوان و ووتارخوێن بووە، لە (١٢)ی مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٦٣٩ك – ١٢٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الذيل علي طبقات الحنابلة ٤/٢٢٣.

٢. شذرات الذهب ٥/٢٠٤.

## سولەیمان سەیف حەڕانی (٥٤٩)

ناوی سولەیمانە، کوڕی سەیفی کوڕی یەحیای کوڕی دیرهەمە، خەڵکی (حەڕان)ە، دەرسی فەرموودەی بە چەندان زانایان داوە، پاش ساڵی ٢٧٠ك – ٨٨٣ز لە حەڕان کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ٢/٢٣٢.

## سولەیمان عبد الله حەڕانی (٥٥٠)

ناوی سولەیمانە، کوڕی عبداللەی کوڕی محەممەدی کوڕی سولەیمانە، نازناوی: (أبو أیوب)ە، خەڵکی حەڕانە، زانایەکی فەرموودەناس بووە، دەرسی بە ئەبوعوروبەی حەڕانی داوە، لە (٨)ی مانگی شەوالی ساڵی ٢٦٣ك – ٨٧٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ٢/٢٣٢.

## سولەیمان عبد الله دێرەبڕوشەیی (٥٥١)

ناوی سولەیمانە، کوڕی مەلا عبداللەی، کوڕی مەلا محەممەدی، کوڕی مەلا حەسەنی دێرەبڕوشەیە، ساڵی ١٩٣٠ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا عبدالرحمان مەلا رەسول گڕاوی، ماوەکیش لە لای مەلا عومەری گردلانکەیی خوێند، دوایی چووە لای مامۆستا طەیبی دوشیوانی، لە کۆتاییدا چووە لای مامۆستا مەلا صاڵحی کۆزەپانکە، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٥٦ز ئیجازەی وەرگرت، سوپاس بۆ خودا کوڕەکی مەلای هەیە، خوابکا خێراتی ئەو بنەماڵە تێك نەچی و مەلایەتی ئەو بنەماڵە نەبڕێتەوە.

## سولەیمان عبد الله گڕاوی (٥٥٢)

ناوی سولەیمانە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا رەسولی کوڕی مەلا عومەرە، خەڵکی (گڕاوە) – نزیك سەرێ ڕەش – زانایەکی مەزن بووە، لە قوتابخانەی باپیری لە (قەڵاتی) هەولێر دەرسی داوە، ساڵی ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز هاتووتەدنیا، لە ١٣٥٦ك – ١٩٣٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٢٨٢.

## سولەیمان عوسمان بناوەسوتە (٥٥٣)

ناوی سولەیمانی، کوڕی فەقێ عوسمانی کوڕی حەیدەرە، خەڵکی گوندی (بناوەسوتە)یە، نزیك پێنجوین، لە دەوری ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز هاتووتەدنیا، دەستی بەخوێندن کرد، دوایی چووە (پێنجوین) ماوەکیش لە (مەریوان)بوو، لە چەند

شوینانی تر گەڕا تا کۆتایی بە خوێندنەکەی هینا، لە گونـدی (سـەردووش) بـووە مـەلا و پێش نوێژ و دەرس بێـژ، لـە دەوری سـاڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز کۆچـی دوایـی کـرد، کوڕێکی هەبوو ناو (عبدالله) بووە مـەلا، سـاڵی ١٣٩٨ك – ١٩٧٨ز لـە (سەیدصـادق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٢٦.

## سولەیمان محەممەد ئاشوکانی (٥٥٤)

ناوی سولەیمانە، کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کـوڕی عـەزیزی کـوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، خەڵکی گوندی (ئاشۆکان)ە، لە ناوچەی بەڕانـەتی، ئـەم زاتە باپیری نووسەری ئەم مێژووەیە، قورئانی پیرۆزی لە (ئاشۆکان) لە لای باوکی خوێند، پاشان ماوەك لە (بەحرکە) خەریکی خوێندن بوو، دوایی لە چەند شوێنان گەڕا، تا کۆتایی بە خوێندنەکەی هینا.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (شەمشوولە) لەوێ مـاوە چـەند سـاڵان، پاشـان گەڕاوە (ئاشۆکان) ماوەك لەوێ بوو، باری کرد بۆ (بەحرکە)، لـەوێ چـووە (بـەربیان)، دوایی باری کرد بۆ (گردەچار)ی خۆشناوەتی، لەوێش ڕۆیشت چـووە (کـۆڕێ)، دوایـی چووە گوندی (مام خاران) لە ناوچەی زرارەتی، چەند سـاڵان لـەوێ مـەلا بـوو، پاشـان چووە (قەفەر) لەوێش باری کرد بۆ (جێژنیکان)ی ئەبابەکر.

کۆچی دوایی: خەریکی کاروباری مەلایەتی و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بـوو، تا ساڵی ١٩٤٢ز لە (جێژنیکان) کۆچی دوایی کرد، لـە گۆڕسـتانی (شـێخ وەیـس) لـە (بەحرکە) لە تەنیشـت مـەلا نەجمـەدینی کـوڕی – کـە لـە کـاتی فەقێیـەتی لـەو گونـدە جوانەمەرگ بوو بوو – بە خاك سپێردرا.

سەفەرەکانی: باپیرم مەلا سولەیمان، لەگەڵ برایەکانی و دەستەی مەلا و فـەقێیان، چەکیان هەڵگرت و چوونە ناوچەی (ڕواندز) بۆ بەرگری کردنی لەشـکری ڕووسـەکان، کە هێرشیان هێنا بۆ داگیرکردنی کوردستان، هەروەها چەند جار سـەفەری کـردووە، بـۆ

(کەرکوك) و بۆ (بیارە) لەسەر فەرمانی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی، پێنج جار حەجیماڵی خوای کردووە، یەك لەو جارانە لە خزمەت شێخ ئەبوبەکردا بووە، ساڵەك زیاتر مایتەوە لە (مەککە)ی پیرۆز، لەو سەفەرە دوو حەجیان کردووە، ئەمجا گەڕایتەوە.

سیفەتەکانی: عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە، دەستی دکتۆری هەبووە، ددان دەرهێنان و خوێن لێ بەردان و نەشتەرگەری کردووە، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی تووشی ئازار دەبوون لە ئەنجامی مار پێوەدان، هەروەها دارتاشی دەزانی، وەستابوو بۆ دامەزراندنی ئاشی ئاو، نانی دەستی خۆی دەخوارد، چاوی لە دەستی کەس نەبوو، بۆ نمونە: لە (شەمشولە) ئیشی کشتوکاڵی دەکرد، لە (بەربیان) ئاشی بە زەمان گرتبوو، لە (کۆڕە) و لە (گردەچار) ڕەز و بەراوی هەبوو، لە (جێژنیکان) شینایی هەبوو.

کوڕەکانی: شەش کوڕی مەلای هەبوون: (مەلا نەجمەدین)، ساڵی ١٨٩٢ز لە دایك بوو، کاتی فەقێیەتی لە (بەحرکە) کۆچی دوایی کرد، هەر لەوێ بە خاك سپێردرا. وە (مەلا مصطەفا) و (مەلا عبداللّٰەی باوکم) و (مەلا محەممەدئەمین) و (مەلا عبدالعزیز) و (مەلا عبدالقادر)، کە هەریەکە لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین – إن شاء الله –.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٦

٢. گۆڤاری هەولێر ١٤٥ – ١٤٧.

٣. چەند زانیاری لە لایەن مامم مەلا عبدالقادر.

٤. چەند زانیاری لە لایەن کاکم مەلا طیب.

## سولەیمان محەممەد جۆخدار (٥٥٥)

ناوی سولەیمانە، کوڕی محەممەدی کوڕی سولەیمانە، نازناوی (جۆخدار) بووە، جۆخە: جۆرە قوماشەکی ئەستورە، دەکرێتە: ساقۆ و غەرگە و شتی وا، مامۆستا باب و باپیرانی لە (دیاربەکر) بوونە، بەڵام خۆی لە (دیمشق)، ساڵی ١٢٨٤ك – ١٨٦٧ز هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە دەرسی شەریعەت و ڕێزمانی عەرەبی لە لای باوکی خوێند، بابی

کۆچی دوایی کرد، ماوەیەك لە جێگای بابی کردیانە (قازی)، پاشان بۆ پەرەپێدانی زانیاری، چووە قوتابخانەی قازیاتی لە (ئەستەمبۆڵ)، لەوێ ماوە تا بڕوانامەی خوێندنی بالآی وەرگرت، ساڵی ١٣٠٨ك کرا قازی (بەعقوبە)، ساڵی ١٣٢٥ك ناردرا بۆ (دیمشق) لە ١٣٢٧ك کرا موفتی (شام)، لە ١٣٢٩ك کرا قازی (مەدینە)ی پیرۆز، پاشان گەڕاوە (دیمشق)، لە ١٣٣٣ك کرا وەزیری داد، ساڵی ١٣٧٧ك – ١٩٥٧ز کۆچی دوایی کرد.

ئەو کتێبانەی داناون: (أحكام الأراضي) و (الحقوق المدنية).

سەرچاوەکان:

١. قضاة المدينة المنورة ١/١٨٥.

٢. معجم المؤلفين ٤/٢٧٣.

٣. نثر الجواهر والدرر ١/٤٩٥ – ٤٩٦.

## سولەیمان نەظیف دیاربەکری ( ٥٥٦ )

ناوی سولەیمانە، کوڕی نەزیفی کوڕی سەعیدە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز هاتووتەدنیا، ڕۆشنبیر و نووسەر بووە.

ئەو کتێبانەی داناون: (النحيب الخفي) و (رسائل الجزيرة) و (فواق العراق) و (ليالي مالطة) و (الحكمة المسروقة).

ساڵی ١٣٤٥ك – ١٩٢٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٤/٢٧٨.

## سەلیم ڕەسول گڕاوی ( ٥٥٧ )

ناوی سەلیمە، کوڕی مەلا ڕەسولی، کوڕی مەلا ئەحمەدە، خەڵکی (گڕاو)ە، ساڵی ١٢٩٩ك – ١٨٨١ز هاتووتەدنیا، لە گوندی (عەزە) مەلا بووە و دەرسی داوە، ساڵی ١٣٦٦ك – ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: أربيل في مختلف العصور ١٣٣.

## سەلیم سەعید ئاکرەیی ( ٥٥٨ )

ناوی سەلیمە، کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی مەلا سەلیمی کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا عبدالرحمانە، لە تیرەی (تاقی)یە، خەڵکی شاری (ئاکرە)یە، ساڵی ١٣٤٤ك – ١٩٢٥ز لە ئاکرێ هاتووتەدنیا، باوکی کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالرحمانی مامی لەبەر خوێندنی دانا، لەلایەن ئەو زانایانەی خوێند: مەلا محەممەد شەریف، مەلا قاسم پێندرۆیی، مەلا محەممەد عبدالخالق، مەلا صەدیق حاجی ئیبراهیم، مەلا محەممەد ئاکرەیی، مەلا سەعید قازی.

ساڵی ١٩٤٥ز هاتە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر)، لە لای ئەو بەڕێزانەی خوێند: مەلا ئەحمەدی سورچی، مەلا عەلی مەلا عبدالله بێتواتەیی، مەلا عومەری خۆران، گەڕاوە (ئاکرە) ساڵی ١٩٤٧ز کرا مەلای مزگەوتی قازی لە (ئاکرێ)، هەروەها ناوە ناوە هاتووچوی ئەو بەڕێزانەی دەکرد بۆ خوێندن: مەلا هبةالله موفتی، مەلا خالید ئەفەندی قازی، مەلا پیری زێباری.

پاشان گەڕاوە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر)، ساڵی ١٩٥٢ز لە لایەن مامۆستا مەلا عبداللهی بێتواتە ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (ئاکرە) لە شوێنی جاران بووە مەلا، دەستی کرد بە کاروباری ئاینی و دەرسدانەوە، ساڵی ١٩٧٢ز چووە مزگەوتی موفتی، ساڵی ١٩٧٥ز گواستراوە بۆ مزگەوتی حاجی عومەر لە (کۆیە)، ساڵی ١٩٧٨ز گواستراوە بۆ مزگەوتی حاجی قادر باریکە لە (هەولێر)، ساڵی ١٩٨٠ز گەڕاوە مزگەوتی موفتی لە (ئاکرێ)، ساڵی ١٩٧٣ز لەسەر بڕیاری سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانی، کرا جێگری سەرۆکی مەکتەبی تەنفیزی (یەکیەتی زانایانی ئاینی کوردستان) لە (گەلالە).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا شێخ محەممەد میرسیدی، مەلا شاکر ئاکرەیی، مەلا صالح ئەرگۆشی، مەلا ئیبراهیم و مەلا زاهیر و مەلا خالید و مەلا عیسا (زێباری)، مەلا حوسێن مخافی، مەلا محەممەد سەلیم ڕێکانی، مەلا سولەیمان گۆران، مەلا سەید عبدالقادر ئیروانی، مەلا شێخ عبدالرحمان، مەلا عوسمان مەلا محەممەدئەمین ئاشۆکانی.

کۆچی دوایی: لە ٦/٩/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (حجرا شێخا) لە تەك مەلا سەلیمی باپیری لە (ئاکرە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٢٩٨ – ٣٠٤.

## سەلیم شاکر هێلەوەی (٥٥٩)

ناوی سەلیمە، کوڕی وەستا شاکری کوڕی صالّحی کوڕی مصطەفای کوڕی جوبرائیلە، عەشیرەتی (مەمان)ە، ساڵی ١٣٣٠ك – ١٩١٢ز لە گەڕەکی (تەعجیل) لە هەولێر هاتووتەدنیا، باوکی لە (دۆغان) ئاسنگر بوو، دوایی باریان کرد، بۆ (بیرعارەبان) لەوێ چوونە (سۆربەش) لەوێ چوونە (قولتەپە) لەوێ چوونە (دووکەرە).

خوێندنی: یەکەمجار چووە (دیبەگە) دوایی چووە (دۆلەسزە) لای مەلا عوسمان، ماوەك چووە (گردەسۆر) لای مەلا سەعید، هەر لەوێ ماوەك لە لای مەلا صەدیقی نۆغەرانی بوو، پاشان چووە (قەشقە) لای مەلا طەیبی دووشیوانی، ئەمجارە چووە(باقرت) لای مەلا ئیسماعیلی ناقیص، پاشان چووە (کۆیە) لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری، دوایی چووە (پەرکێ) لای مەلا ئەبوبەکر، پاشان چووە (عەلیاوا) لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری، دوایی چووە (گردمەلا) لای مەلا عومەری ڕەش، هەروەها لە (یارمجە)ی ساڵەیی و (ئەسپیندارە)ی خۆشناوەتی ماوەکی خوێند، دوا قۆناغی چووە (دووگرتکان) لە لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، کۆتایی بە خوێندن هێنا، چووە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی تەریقەتی وەرگرت، هەروەها لە ٢٢/٤/١٩٤١ز ئیجازەی مەلایەتی لە جەنابی شێخ وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (هێلەوە)، پاشان هاتە (هەولێر) نزیکەی بیست ساڵ پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو، دەرسی فەقێیانی دەداوە، لە ١٠/٧/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی پیرداود بە خاك سپێردرا.

بەشێك لە فەقییەکانی: سەید طاهیر سەید عوبێدی، مەلا صابیر محەممەدئەمین، مەلا شێخ طاهیر، مەلا محەممەد مەلا ئیبراهیم، مەلا ئەحمەد و مەلا حامید و مەلا جەعفەر و مەلا جەوهەری هێلەوەی.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٢٩٢ – ٢٩٧.

## سەلیم عبدالرحمان زاویتە (٥٦٠)

ناوی سەلیمە، کوڕی عبدالرحمان ئەفەندی یە، لە گوندی (زاویتە)ی سەر بە (دهۆك) هاتووتەدنیا، زانایەکی زیرەك و وردبین بووە، بەتایبەت لە مەنتیق و ڕیازیات دەستی بالاّ بووە.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبەکانی قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، دوایی چووە (هەولێر) لە مزگەوتی قەلاّت لای مەلا ئەفەندی، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، پاشان چووە (تورکیا) لە (باش قەلعە)ی سەر بە (وانە) لای مەلا شێخ طاهای ئەرواسی، دوایی گەڕاوە عێراق، چووە (ئەتروش) لای مەلا عبدالهادی ئەفەندی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، کرا قازی ناوچەی (ئەتروش)، مامۆستا حاشیەی لەسەر گەلەنبەوی مەنتیق هەیە، نامیلکەی فەلەکی مەلا ئەفەندی کورت کردیتەوە، کاتی نوێژەکانی لەسەر ئوسطرلاب داناوە، لە ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز کۆچی دوایی کرد، لە (بریفکان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦.

## سەنان ئەبولفەتح حەڕانی (٥٦١)

ناوی سەنانە، کوڕی ئەبولفەتحە، خەڵکی حەڕانە، لە (بەغدا) نیشتەجێ بووە، لە ژمێریاری دەستی بالاّ بووە، چەند کتێبی داناون، لەوانە: (حساب المکعبات) و (شرح الجبر والمقابلة)ی خوارەزمی و (شرح الجمع والتفریق)ی خوارەزمی و (التحت في الحساب الهندي) و (کتاب الوصایة) و (کتاب الجمع والتفریق).

سەرچاوەکان:

١. الفهرست ٢٨١.

٢. هدية العارفين ٤١٠٥.

٣. معجم المؤلفين ٤/٢٨١ - ٢٨٢.

## سەنان ثابت حەڕانی (٥٦٢)

ناوی سەنانە، کوڕی ثابتی، کوڕی قەرەیە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە سەرەتاوە مەسیحی بوو، خەلیفە قاهیر داوای لێ کرد ئیسلام بێت، ئەویش خۆی نەدا دەست هەڵات پاشان ئیسلام بوو، بەڵام لە ترسی قاهیر نەوێرا بێتەوە (بەغدا)، ماوەك ماوە لە (خوراسان)، پاشان گەڕاوە (بەغدا)، لەوێ ماوە تا ساڵی ٣٣١ك - ٩٤٢ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا دکتۆرەکی چاك بوو، ناسرابوو، بە (ئەبو سەعید).

چەند کتێبی دانراوی خۆی هەیە، بۆ نمونە: (رسالة في الإستواء) و (رسالة في تأريخ ملوك السريانيين) و (رسالة في السهيل) و (رسالة في شرح مذهب الصابئين) و (رسالة في الفرق بين المترسل والشاعر) و (رسالة في قسمة أيام الجمعة على الكواكب السبعة) و (رسالة في النجوم).

کوڕەکانی:

١. ئیبراهیم: لە ئەندازە چازان بوو، لەو بابەتە چەند دانراوی هەیە.

٢. ئەبولحەسەن: لە مێژوو دانراوی هەیە، ساڵی ٣٦٥ك - ٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١١/ ٢٢١ - ٢٢٢.

٢. معجم المؤلفين ٤/٢٨١.

٣. هدية العارفين ١/٢٤٨ - ٤١٠.

٤. الأعلام ٣/٢٠٦.

٥. معجم الأدباء ٤/٢٥٧ – ٢٥٨.
٦. الكامل ٦/٢٩٤.
٧. الفهرست ٢٧٢ – ٣٠٢.

- ش -

## شبلی جونەید زەرزائی (٥٦٣)

ناوی شیبلی یە، کوڕی جونەیدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی خەڵەکانی قازییە، عەشیرەتی زەرزائی بووە، ساڵی ٥٧٦ك ـ ١١٨٠ز لە(هەولێر) هاتووتەدنیا، خوێندوویەتی بوویتە مەلا، ئیجازەی وەرگرتووە، کرایتە قازی (أخميم) – شارێکە لەسەر رووباری نیلی (میصر) – هەر لەوێ ساڵی ٦٥٣ك ـ ١٢٥٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا فی خدمة العلم والدین ٢٣١.
٢. معجم البلدان ١/١٢٣.

## شبیب حوسێن بروجەردی (٥٦٤)

ناوی شەبیبە، کوڕی عوبەیداللەی کوڕی حوسێنی کوڕی شەبابە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٤٥١ك ـ ١٠٥٩ز لە (بروجەرد) ڕۆژهەڵاتی (کەرمانشا) هاتووتەدنیا، لەتەمەنی بیست ساڵیدا چووە (بەغدا) لەلایەن مەلایە چاکەکانی ئەوسەردەمی خوێند، تاشارەزا بوو لەشەریعەت و فەتوا دان و ئاداب و شیعر، گەڕاوە (بروجەرد) لەوێ کرا قازی.

مامۆستا زاتەکی بێ فیز و قسەخۆش بوو، سێ جار سەفەری حەجی کرد، دواجار لە گەڕانەوە، چواری مانگی مەولودی، ساڵی ٥٣٤ك ـ ١١٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا فی خدمة العلم والدین ٢٣١.

## شەرەفخان شەمسەدین بەدلیسی (٥٦٥)

ناوی شەرەفخانە، کوڕی شەمسەدینە خەڵکی شاری (بەدلیس)ە، لەمانگی ذي القعدەی ساڵی ٩٤٩ك - ١٥٤٣ز لەگوندی (گرهرود)ی سەربەشاری قوم هاتووتەدنیا، لەو کاتە باوکی ئاوارە ببوو بۆ (ئێران).

ئەو زاتە هەروەکو خۆی لەکۆتایی شەرەفنامە باسی ژیانی خۆی دەکات: لەمنداڵییەوە باوکی لەبەر خوێندنی دانا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، ماوەك خەریکی نەحو و صەرف بوو، پاشان دەستی کرد بەشەریعەت و ئوصول، بەشێکی لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) خوێند، پاشان ماوەك خەریکی زیکر و یادی خوای گەورە بوو، تاگەیشتە پلەی بەرزی، لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا، (شا طەهماسب)ی ئێران کردیە سەرۆکی عەشیرەتی - ڕۆژکی - هەروەها بەڕێوەبەری گوندانی: (سالیانی) و (مەحمودئاوا)ی سەر بە(شێوان)، پاشان کردیە ئەمیری (گەیلان)، لەوکاتە خەڵکانی ئەو دەورووبەر سولتان هاشمیان دەست نیشان کردبوو، بۆ سەرۆکایەتی (گەیلان)، لەو ڕکە (هاشم) لەشکرێکی گەورەی هینا، بۆ جەنگی (میر شەرەف) ڕووبەڕووی یەك بوون، لە پێکدادانێکا، لەشکری (هاشم) شکا، میر شەرەف سەرکەوت ماوەی حەوت ساڵان لە (گەیلان) ماوە، پاشان لەبەر نەسازی ئاو و هەوایەکەی لەوێ باری کرد، بۆ (قەزوێن)، لەوێ (شا) ناردییە (شێروان)، پاشان حەسود و ناحەزەکان زمانیان لە (میر شەرەف)دا لەلایەن (شا)، (شا) چونکە کابرایەکی (تریاك کێش) بوو غروری لەکەللە و مێشکی دا، پێش ئەوەی بیر بکاتەوە و ڕاستییەکە وەربگری، یەکسەر پروپاگندەکانی باوڕکردن، میرشەرەفی دوور خستەوە بۆ (نەخجوان)، بەناوی سەرپەرشتی کردنی عەشیرەتی (لوڕستان) و (گۆران)، دوایی ڕەوانی (ئازربێجانی) کرد، پاشان بەشێکی ئەو دەورووبەری خسترا بەر حکومڕانی (تورکیا)، سولتان مرادی سێیەم میرشەرەفی گەڕاندەوە (بەدلیس)، ساڵی ٩٨٦ك - ١٥٧٥ز لەجێگەی باوك و باپیرانی کردیە (میر)، بەو بۆنەیە (خوسرەو پاشا) شیرەکی ئاوزێڕی پێ خەڵات کرد (میر شەرەف) دەستی کرد بەڕێکخستنی کاروباری وڵاتەکەو،

بەرگری کردن لەبەرانبەر داگیرکەران، ماوەی دە ساڵان خەریکی شەڕ و پێکدادان بوو لەگەڵ سەرۆکەکانی (جۆرجیا) و(ئازربێجان)، بەرانبەر ئەو هەموو سەرکەوتنانە ساڵی ٩٩١ك بەروبووم و بەرهەمەکانی ناوچەی (موش)ی لەلایەن سوڵتانەوە پێ خەلات کرا.

ساڵی ١٠٠٥ك ـ ١٥٩٧ز سوڵتان محەممەد خان، کردیە میری تەواو، بەلام لەوکاتە (میر شەرەف) خەریکی دانانی کتێبی (شەرەفنامە) بوو، بۆیە ئەو پلەی وەرنەگرت وازی هینا، بۆ شەمسەدینی کوڕی، ئەوی لەجێی خۆی دانا، لەکۆتایی ئەوساڵەدا کتێبەکەی تەواو کرد، لەبابەت مێژووی میرانی کورد، بەزمانی (فارسی)، ساڵی ١٠٧٨ك لەلایەن (شامی) تەرجوومە کرا بۆ زمانی (تورکی).

لە ٨/١/١٣٦٣ك ـ ١٠/١/١٩٤٤ز لەلایەن مەلاجەمیلی ڕۆژبیانی، تەرجوومە کرا بۆ زمانی (عەرەبی)، ساڵی ١٩٥٠ز پەراوێزی لەسەر نووسیەوە، ساڵی ١٩٥٣ز چاپ کرا، ساڵی ٢٠٠١ز لەچاپخانەی پەروەردەی (هەولێر) دووبارە لە چاپ دراوە، هەروەها هەژار موکریانی، تەرجومەی کردووە، بۆ زمانی (کوردی)، ساڵی ١٩٧٤ز لە چاپخانەی (نعمان) لە شاری (نەجەف) چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. شەرەفنامە ٩٦٤ – ٧٠٣.

٢. مشاهیر الکورد وکوردستان ٢٣٦ – ٢٣٧.

٣. هدیة العارفین ١/٤١٦.

## شورەیح ڕەبیان خاپوری ( ٥٦٦ )

ناوی شورەیحە، نازناوی (ئەبو ڕەبیانە) کوڕی ڕەبیانە کوڕی شورەیحە، خەڵکی شاری (عەرەبانە) لە دەوئاوی (خاپور)، زانایەکی مەزن و چاك و ڕاستگۆ بووە، مامۆستا عبدالکریم سەمعانی، دەڵێ: {لە کۆتایی ساڵی ٥٣٥ك – ١١٤١ز بە خزمەت ئەو شێخە گەیشتم، کەم شتەکم لێ وەرگرت و نووسیمەوە}.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٢/٣٤٩.
٢. اللباب ١/٤٠٨.

## شەریف ئەحمەد دووشیوانی (٥٦٧)

ناوی شەریفە، کوڕی مەلا ئەحمەدی، خەڵکی گوندی (دووشیوانە)، عەشیرەتی (مەنتکە) ساڵی ١٨٩٤ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە سەرەتاوە لە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان وەکو فەقێیەکانی کوردستان، لە چەند شوێنان گەڕا، تاکو خوێندنەکەی بباتە سەر.

بەشێك لە مامۆستایەکانی: مەلا عەلی ڕواندزی، مەلا عوسمانی خورمەڵەی، مەلا ئیسماعیلی ناقیص، مەلا عبدالقادری سێگرتکانی، دوایی چووە مزگەوتی شێخ مصطفا لە (هەولێر) لە خزمەت ئەو کۆتایی بە خوێندنەکەی هینا، ساڵی ١٩٢٦ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەروەها ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی، لە جەنابی شێخ وەرگرت.

مەلایەتی: مامۆستا لە چەند شوێنان مەلا بوو، دەرسی فەقێیانی دەدا، لەوانە گوندانی: (سۆربەش) و (سووریژە) و (ماستاوە) و (یەدیقزلەر) و (قەشقە) و (جل بەسەر) و (گردمەلا) و (گردەسۆر) و (بشیریان)، پاشان لە دەشت باری کرد، هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی خانەقای شێخ مەزهەر کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا طەیبی برای، مەلا محەممەدئەمینی سویری، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا عبداللّٰهی سێبەردان، مەلا عەلی بیرەعارەبان، مەلا سەید محەممەد پیرداودی، دکتۆر محەممەدی کوڕی، مەلا عبدالرحمانی شەمشولەی، مەلا طەیبی بەحرکەیی، مەلا طاهیری بەحرکەیی (نووسەری ئەم مێژووە).

خووڕەوشتی: زاتەکی زەین تیژ بوو، زیرەك بوو، لە بوارەکانی زانست شارەزابوو، بە تایبەت لە شەریعەت هۆدەکەی کراوەبوو، بۆ پرسیار قەدەغە نەبوو، نەك تەنیا بۆ نەخوێندەواران، بەڵکو مەلایان لە دووررا دەهاتن، لە دێهات و لە شاران، بۆ

پرسیارانی قورس و گران، زانایەکی ئایین پەروەربوو، باسی کەسی بە خراپە نـەدەکرد، لـە هۆدەکەی ئەو تەنیا باسی خودا بوو، ئەگەر یەك باسی دنیای کردبا و بێ کرنـەباوە، ناچـار هەڵدەستا دەست نوێژی دەشووشت.

بە بیرمە جارەك مانگی ڕەمەزان بوو، منـیش لـە خزمـەتی دانیشـتبووم، لەوکاتـە شێخەك – ناوی نادەم– باسەکی دنیای کرد، مامۆستا تـوڕە بـوو، فـەرمووی: {یـا شـێخ ڕەمەزانە، لۆ خۆت قورئان بخوێنە}.

بەڕاستی هەر کەس چووبا هۆدەکەی، فێرە ئایین دەبوو، فێرە زانست دەبوو، فێرە ئەخلاق دەبوو، لام وایـە ئـەو زاتـە یەکـە لـەو خواناسـانەی پێغەمبـەر (د.خ) دەربارەیـان فەرموویەتی: (خِیَارُکُم الذِینَ إذا رُءُوا ذُکِـرَ اللهُ عَـزَّ وَجَـلَّ) (رواه ابـن ماجـة ٢/١٣٧٩) :چاکترین کەسان لە ئێوە ئەوانەن کە بدیترێن یادی خـودا دەکرێـت، واتـە: ئەوانـە هـۆی یادی خودانە.

بەجێ هێشتنی خانەقای شێخ مەزهەر: مامۆسـتا بـۆ کاروبـاری ئـایینی، بـەردەوام هاتووچوی مزگەوتی دەکرد، ماڵەکـەی لـە مزگـەوت دوور بـوو، پاشـان پـیر بـوو، بـێ هێزبوو، نەیتوانی بێتە خانەقا، لەوێ ڕۆیشت، چووە مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشـبەندی لە ماڵەکەی نزیك بوو، لەوێ جەنابی شێخ هۆدەکی تایبەتی بۆ دابین کرد، یـەکی تایبـەتی دانا بۆ خزمەتی مامۆستا، ماوەکیش لەوێ ماوە خەریکی خواپەرستی بوو.

کۆچی دوایی: پاشان نەخۆشی کاری لێ کرد، خانەقای بەجێ هێشـت، گـەڕاوە ماڵی خۆی لە شەوێکی بەفر و سـەرما، ٢٢/١/١٩٨٦ز شـاد بـوو بـە بارەگـای خـوای گەورە، لە گۆڕستانی (گردەڕەشە) بە خاك سپێردرا.

دکتۆر محەممەد شەریفی کوڕی زانایەکی بەرزە، ماوەك بریکاری وەزارەتی ئـەوقاف عێراقی بوو، بەو دوایە کرا ئەنـدامی پەرلـەمانی عێراقـی، ئێسـتا مامۆسـتای زانکۆیـە لـە (هەولێر)، وە سەرۆکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامیە، بڕیاری لە چاپدانی ئەو کتێبەی لەبەر دەستت دایە، لەسەر ئەرکی کۆڕبەند، لە لای ئەو دەرچوو – خوا خێری بنوسی –.

بەرهەمەکانی: مامۆستا مەلا شەریف، خەتەکی خۆشی هەبوو، چەند پەرتووکی بە دەستی خۆی نووسیتەوە، چەند پەراوێزی کورتی لەسەر فەرائیزی شەرحی مەنهەج هەیە، هەروەها، هۆنراوەی مەولودی هەیە، بە کوردی دانەکی لە لای ئێمەیە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ١٢٠.

٢. النجم الزاهر ٦٨.

٣. دەنگی زانا ٢٦ – ٢٧ / ١٩٩٩ز.

## شەریف رەسول عاللایی (٥٦٨)

ناوی شەریفە، کوڕی رەسولی کوڕی حەسەنی کوڕی محەممەدی کوڕی داودی کوڕی فەقێی کوڕی وەلییە، عەشیرەتی (گەلالی)یە، ساڵی ١٨٩٦ز لە گوندی (باقرت) هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە لای مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دووگرتکان) ماوەك چووە (هیران)، ماوەك چووە (باداوە)، ماوەك چووە (کۆیە) پاشان چووە (سابلاغ)، گەڕاوە کوردستانی عێراق، ماوەك لە لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری بوو، ماوەکیش چووە لای مەلا عبداللهی بێتواتەی، ماوەکیش چووە لای مەلا ئەفەندی هەولێر، دوایی چووە کۆیە لای جەنابی مەلا محەممەدی گەورە ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (چغەمیرە) چەند ساڵ لەوێ بوو، پاشان باری کرد بۆ گوندی (عالەلا)، دوایی ناخۆشی لە ناوچەکە پەیدابوو، باری کرد بۆ (کەرکوك) لە مزگەوتی گەڕەکی ئیمام قاسم بووە مەلا، دوایی هاتە (هەولێر) کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی حاجی صالح دەباغ، ماوەك لەوێ بوو پاشان چووە مزگەوتی (صەدیقە خاتوون).

مامۆستا خەتەکی خۆشی هەبوو، چەند بەرگی (توحفە)ی ڕازاندیتەوە، بە چەند پەراوێزی نایاب، بە تایبەت پەراوێزەکانی مامۆستایانی بنەماڵەی جەلی زادە، بەردەوام بوو لە سەر خزمەتی ئایینی پیرۆز تا لە ١٤/٤/١٩٧١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٥٢٤ – ٥٢٨.

## شەریف ڕەنگەڕیژانی (٥٦٩)

مامۆستا شەریف ناسراوە بە محەممەد شەریف، خەڵکی گوندی (ڕەنگەڕێژانە) سەر بە ناوچەی (سەقز) لە کوردستانی (ئێران).

خوێندنی: یەکەم جار چووە (سەقز) ماوەکی لەوێ خوێند، دوایی چووە (سەردەشت) لەوێ کتێبی (سیوطی) خوێند، دوایی چووە (سابلاغ)، پاشان چووە (شنۆ)، ئەمجا ئێرانی بەجێ هێشت، هاتە (ڕواندز) ماوەك لەوێ ماوە، هۆنراوەی (مسألة الإضمار)ی دانا، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی (قەڵات) لای مەلا عومەر ئەفەندی، لەوێ (شەرحي مسألة الإضمار)ی کرد، بەناوی (غاية الإظهار) لەو کتێبە زۆر مەتحی خەڵکی ڕواندز دەکات، بە تایبەت مامۆستا مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی، هەروەها ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشی بۆ مەلا عبدالکریمی برای کە لە (سەردەشت) بە جێمابوو، لێك دابڕان، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| نظمتُها قد كنتُ ذا حُزنٍ وهمْ | منْ هجرِ إخوانٍ وأحبابٍ وعمْ |
| لاسيّما أخي الّذي نورُ البصرْ | مِنّي بسردشتَ بعيداً قدْ هجرْ |

ماوە لە (قەڵات) تا مامۆستا عومەر ئەفەندی ئیجازەی مەلایەتی پێدا، هەر لەوێ ساڵی ١٨٦٨ز کتێبی (شەمسییە)ی نووسییەوە.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە گوندی (عەزە) ماوەی دوازدە ساڵ لەوێ ماوە، لەو کاتە مەلا ئەحمەدی مەریوانی لە خزمەتی دەخوێند، دوایی باری کرد چووە (تەڵەرخێم)، پاشان چووە (یەدیقزلەر) ماوەکی زۆر لەوێ ماوە، بۆیە ناودەبردرا، بە مەلا شەریفی یەدیقزلەری، خۆشی نازناوی بە (العثماني) دەنووسی، لەوانەیە مریدی شێخ عوسمانی تەوێڵەی بی.

مامۆستا حەزی لە ڕاو و شکار بوو، ماین و تاژی هەبوو، ڕۆژانی سێشەمان، دەرسی فەقێیانی نەبوو، بە زۆری دەچووە ڕاو.

پلەی بەرزی زانایی: مامۆستا مەلا شەریفی دووشیوانی بۆی گێرامەوە، ئەویش لە مەلا ئەحمەدی باوکی بیستووە دەڵێ: {کۆمەڵێك مەلا دانیشتبووین، پرسیارەکی شەریعەت هاتە لای، هەرچەند هەوڵمان دا وەڵامان نەزانی، لە هیکەوە ئەو مەلا شەریفەمان لێ بەدەرکەوت، بە ئاسانی بۆمانی ڕۆن کردەوە، لە دڵی خۆم گرت ئەگەر خوای گەورە کوڕێکم پێ ببەخشی، شەرت بی بەناوی ئەو مەلایە چاکەی بکەم}. مامۆستا مەلا شەریفی دووشیوانی دەڵێ: {ئەمن هەوم، کە بە ناوی ئەو کرام}.

کۆچی دوایی: لە کۆتایی سەدەی سێزدەی کۆچی، لە (یەدیقزلەر) کۆچی دوایی کرد، هەر لەو گوندە، بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی:

١. المنفصلة: مەنتیقە، لە (تەلەرخێم) نووسیتیەوە.
٢. شەرحی (فەریدە): نەحوە.
٣. شەرحی هۆنراوەی (شامل)ی شێخ مەعروف: نەحوە.
٤. شەرحی جەدوەلی (مختلطات)ی شەرحی شەمسییە: مەنتیقە.
٥. چەند پەراوێز لەسەر کتێبی (خلاصة الحساب).
٦. هۆنراوەی (مسالة الإضمار) نەحوە.
٧. غاية الإظهار، شەرحی (مسالة الإضمار).
٨. وە هەروەها لەگەڵ چەند پەراوێز، لەسەر ئەو کتێبانەی خوارەوە: شرح المنهج، تحفة المحتاج، جمع الجوامع.

سەرچاوەکان:

١. غاية الإظهار: دەستنووس.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٣.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٩٠ - ٩٧.

## شەعبان ئەبوبەکر هەولێری (٥٧٠)

ناوی شەعبانە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عومەری خەڵکی (هەولێر)ە، ساڵی ٦٢٤ك – ١٢٢٧ز لە هەولێر لە دایك بووە، بۆ خوێندن چوویتە (حەلەب) ماوەکی لەوێ خویند، دوایی چووە (دیمشق) پاشان چووە (میصر)، دوایی گەڕاوە (دیمشق) کرا مامۆستای فەرموودە، زاتەکی بە دین و بەڕێز و پیرۆز بوو، خەریکی خواپەرستی بوو، یارمەتی فەقیر و هەژارانی دەدا، ئازوقەی بۆ دابین دەکردن، نیشتەجێی دەکردن، قسەخۆش و مەجلیس بەخێر و بەرەکەت بوو.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی شەمەی ٢٩ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٧٢١ك – ١٣٢١ز لە تەمەنێکی درێژ و پڕ خێر و خزمەتی ئاینی، لە دیمشق کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی صۆفییەکان بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٣٢.
٢. الإكليل في محاسن أربيل ١٧٩.
٣. شذرات الذهب ٦/٢٦.
٤. الدرر الكامنة ٢/١١٢.
٥. معجم أعلام الكورد ٣٤٥

## شەفیع رەسول دێلزیان (٥٧١)

ناوی شەفیعە، کوڕی مەلا رەسولی کوڕی مەلا ئەحمەدە، لە گوندی (دێلزیان) ساڵی ١٩١٧ز هاتووتەدنیا، ساڵی ١٩٢٤ز دەستی بە خوێندن کرد، پاش خەتم کردنی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکان چووە (ڕۆستێ) لای مەلا ئەحمەد، دوایی چووە (ماویلیان) لای مەلا صادیق، پاشان چووە (ئێران) لای مەلا سەید حەسەن، دوایی گەڕاوە (عێراق) چووە (بیارە) لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس) ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوە (دێلزیان) ماوەی چل ساڵان مەلا بوو دەرسی دەدا، دوایی چووە (باتاس)، پاشان هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی حاجی عەبد لە گەڕەکی (ئازادی) بووە مەلا، ساڵی ٢٠٠٥ز کۆچی دوایی کرد، مەلا هبةاللّٰه‌ی کوڕی لە جێگای ئەو مەلایە، مەلا صبغةالله قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەرە، ئێستا لە دەرەوەی وولاتە، کوڕانی تریشی هەنە.

سەرچاوەکان:

١. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٤٢٢ – ٤٢٣.

## شەمسەدین عبدالغفار گۆشایش (٥٧٢)

ناوی شەمسەدینە، کوڕی عبدالغفاری کوڕی گۆشایشی کوڕی محەممەدی مەردۆخی یە، ساڵی ٩١٢ك – ١٥٠٦ز هاتووتەدنیا، زانایەکی بە دین و خواپەرست و دنیا نەویست بووە، زانیاری تایبەتی لە بابەت: ڕیازیات و حروف و زیج هەبووە، باری کرد بۆ گوندی (دەرهەرد) لە ناوچەی (کەلا تەرزانی) هەورامان، لەوێ خەریکی دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان بوو، لە ٩٨٥ك – ١٥٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سێ کوڕی هەبوو، ئەوانەن: شێخ عبدالغفاری دووەم (ئەردەلانی) و شێخ مصطەفای تەختی موهاجیر و شێخ حەسەن کە باپیری شێخەکانی مەردۆخی قەرەداغی یەکانە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٣٣ – ٢٣٤.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٢٢.

٣. تاريخ مشاهير كورد ١/١٦١.

## شەمسەدین عبدالغفار مەردۆخی (٥٧٣)

ناوی شەمسەدینە، کوڕی عبدالغفاری کوڕی شەمسەدینی کوڕی عبدالغفاری کوڕی مەلا گۆشایشی کوڕی شێخ محەممەدی مەردۆخی یە، ساڵی ١٠٢٣ك – ١٦١٤ز

لە شارۆچکەی (حەسەن ئابادی) پایتەختی ئەردەلانیان هاتووتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر پەروەردە بووە، خوێندیتی تا گەیشتیتە پلەی سەرەوە، خەتێکی خۆشی هەبووە، زۆربەی کتێبەکانی خوێندنی بە دەستی خۆی نووسیتەوە، بەشێکیان تا بەو دواییە مابوون، لە لای مەلا محەممەدی (آیةالله).

مامۆستا ساڵی ١١١٤ك - ١٧٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٣٤.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٢٣ - ١٢٤.
٣. تاريخ مشاهير كورد ١/٢١٦.

## شەمسەدین عبدالکریم بریفکانی (٥٧٤)

ناوی شەمسەدینە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی موسایە، باپیرەگەورەی شێخ نورەدینی بریفکانە، ساڵی ٩٩٧ك - ١٥٨٨ز هاتووتەدنیا، لە (ئەخلاط) ئاوارە بووە بۆ بریفکان، لە گوندی (گولی ڕومان)ی عەشیرەتی مزوری دانیشتووە، زانایەکی زیرەك و زمان زان و شاعیر بووە، دیوانی شیعری کوردی هەیە، ساڵی ١٠٨٥ك - ١٦٧٤ز کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی (بریفکان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٠٤ - ٦٠٦.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٣٢ - ٤٤١.
٣. الأكراد في بهدينان ٨٢ - ٨٤.

## شەمسەدین مصطفی ڕودباری (٥٧٥)

ناوی شەمسەدینە، کوڕی مصطفای کوڕی مەلا خضری ڕودبارییە، یەکە لە مەلایە چاکەکانی صەدەی سێزدەهەم، کتێبی (مباحث في خلق الأعمال وتبين حقيقة

الحال)ی بە عەرەبی داناوە، ساڵی ١٢٥٤ك – ١٨٣٨ز لە سەردەمی حکومەتی ڕەزا قلی خانی ئەردەلانی تەواوی کردووە.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر الکورد ١/ ٤٩٩.

## شوکر فەضلی کوردی ( ٥٧٦ )

مامۆستا شوکر فەضلی، ساڵی ١٢٩٩ك – ١٨٨١ز لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، زانیاری لە زۆر بابەتان هەبووە، لە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی زمان پاراو بووە، چەند ڕۆژنامەی دەرکردوون، شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیر بوو، سەرۆکی نووسەرانی ئەنجومەنی عێراق بوو، ئەو کتێبانەی داناون:

١. تأریخ العراق قدیما وحدیثا.
٢. ذیل في جغرافیة العراق التأریخیة.
٣. مکتبة الفضلي في طبقات الأرض والحکمة الطبیعیة والکیماء والفلك وعلم النفس والهندسة.

هەروەها شیعری هەیە، بۆ شێخ مەحمودی حەفیدی نووسیوە:

ئیش کە ئێستا ڕووی لە هەورازە بەرەو لێژی نەکەی
وردە فیکریشی ئەوێ، هەر بە دوعا و نوێژی نەکەی

مامۆستا لە ١/٧/١٩٢٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أعلام العراق ٣٧٦ – ٣٧٨.
٢. معجم المؤلفین ٤/٣٠٤.

## شەهابەدین ئەحمەد حەیدەری ( ٥٧٧ )

ناوی شەهابەدینە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا حەیدەری دووەمە، یەکە لە پێنج کوڕە زانایەکانی مامۆستا ئەحمەد ئەفەندی حەیدەری، ئەوەش هەروەك ئەوانی تر زانایەکی مەزن و پایەدار بووە.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ٤٥.

## شەهابەدین ڕەضیەدین شازەلی (٥٧٨)

ناوی شەهابەدینە، کوڕی ڕەضیەدینە کوڕی شێخ ڕەزای شازەلی یە، خەڵکی گوندی (کاکۆزەکەریا)یە،ساڵی ١٠٢٠ك - ١٦١١ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەسەر دەستی ئەو تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت و کرا (خەلیفە) دەستی کرد بە خزمەتی ئاینی پیرۆز و مێوانان و صۆفیەکان، شێخەکی دڵپاك و خواناس و خواپەرست بوو، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، نووسەر و شاعیر بووە، نازناوی شیعری دەنووسی (حاجی) لەبەر ئەوەی چوو بووە حەج، ساڵی ١٠٧٢ك - ١٦٦١ز کۆچی دوایی کرد چەند خەلیفەی بەدینی هەبوو، دوای ئەو ئامۆژگاری خەڵکانیان دەکرد، ڕێگای راستیان نیشان دەدان.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٣٦ - ٢٣٨.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٠٩ - ١١٦.
٣. تاريخ مشاهير کورد ١/٢٠٤ - ٢٠٥.
٤. گوڵزاری کوردستان ٨٦.

## شەهابەدین عبدالرحمان ئامێدی (٥٧٩)

ناوی شەهابەدینە، کوڕی عبدالرحمانی، کوڕی محەممەدی، کوڕی محەممەدی ئامێدی یە، ساڵی ١٠٠٧ك - ١٥٩٨ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە زانایەکی تەفسیر زان و شەرع زان بووە، دەرسی داوە، ماوەك قازی بووە، چوویتە سەفەری حەج، لە شیعر دەستی باڵا بووە، لە (١٠) ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٠٧٨ك - ١٦٦٨ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، ئەو کتێبانەی داناون: (کتاب في التفسير والفقه) و (مجموعة المدائح).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٤/٣٠٩.

٢. الأعلام ٥/١٩٠.

## شەهدە ئەحمەد دینەوەری (٥٨٠)

ناوی شەهدەیە، کچی ئەحمەدی کوڕی فەرەجی کوڕی عومەرە، خەڵکی (دینەوەر)ە، لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، زانایەکی بەرز و نووسەرەکی چاك بووە، دەرسی لە لای نەصری کوڕی ئەحمەد و حوسێنی کوڕی ئەحمەدی خوێندووە، دەرسی بە زۆر زانایان داوە، لە ١٣ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٥٧٤ك – ١١٧٨ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٢/١٧٢ – ١٧٣.

٢. شذرات الذهب ٤/٢٤٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٣٥١ – ٣٥٢.

٤. مشاهير الكورد ٤٣٩.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٣٢ – ٢٣٣.

## شێخ محەممەد داود بێتواتی (٥٨١)

ناوی شێخ محەممەدە، کوڕی مەلا داودی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا حوسێنە، یەکە لە مەلایە چاکەکانی بێتواتە، ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی چووە (زێوە) لەوێ باری کرد، چووە (کونەفلوسە) بۆیە ئەو بنەماڵە جار وایە بە بێتواتە هەڵدەدرێن، جاریش وایە بە (کونەفلوسە)یی ناودەبردرێن، مامۆستا شێخ محەممەد مریدی مەلا شێخ نەبی ماویلی بوو، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا لە (کونەفلوسە) کۆچی دوایی کرد، فەقێ سەعیدی کوڕی لە پاش بەجێما، ئەویش کۆچی دوایی کرد، وە سێ کوڕی لە پاش بە جێما:

١. مەلا ئیبراهیم: لە لای مەلا عبداللهو لای مەلا ئیسماعیلی ماویلی خوێند، بووە مەلا لە کونەفلوسە، دوا عومری چاوەکانی نەمان لەوێ کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا صادیق: لە زووەوە جوانەمەرگ بوو.

٣. مەلا شێخ محەممەد: پێش نوێژە لە مزگەوتی حاجی مەجید، لە گەڕەکی تەیراوە لە هەولێر.

سەرچاوەکان:

١. نادي الإسلام ٢ — ٤.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٦.

## شێخ محەممەد عومەر بێرکۆتی (٥٨٢)

ناوی شێخ محەممەدە، کوڕی عومەری کوڕی میکائیلی کوڕی لەشکرییە، عەشیرەتی کەلوڕە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (شاوێس) نزیك (هەولێر) هاتووتەدنیا.

لە لای مەلای گوندی دەستی بە خوێندن کرد، پاشان هاتە هەولێر لە مزگەوتی حاجی صالح یەگەن لە قەڵات خەریکی خوێندن بوو، دوایی چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مامۆستا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، ماوەکیش لای مەلا ئیسماعیل سوسەیی بوو، دوایی چووە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هێنا، بووە مەلا لە مزگەوتی صالح یەگەن، پاشان گەڕاوە (بێرکۆت).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبداللهی سێبەردانی، مەلا حوسێنی قۆڕیتانی، مەلا ئەحمەدی گردعازەبانی، مەلا ئیبراهیم قازی برای، مەلا محەممەدی برای.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بێرکۆت) بە خاك سپێردرا، کوڕێکی شاعیر و نووسەری هەیە، ناسراوە بە: (عبدالله پەشێو) لە دەرەوەی وڵاتە.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٦٠.

## شێرکۆ محەممەد مەلیك ئەییوبی (٥٨٣)

ناوی شێرکۆیە، کوڕی محەممەدی کوڕی شێرکۆیە کوڕی شادییە، کـوڕە ئـامۆزای سـولتان صـەلاحەدینی ئەییوبیـە، سـاڵی ٥٦٩ك - ١١٧٣ز هاتووتـەدنیا، زانایـەکی فەرمووده‌ناس بووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لە شاری (حومص) شا بووە، بـەهێز و ڕەشید بووە، وڵاتی پاك کردەوە، لە ئارەق و قومار و بی پەردەیی، قەدەغەی کرد ئافرەت بیٚ ئیش لە ماڵ دەرچی، بەردەوام بوو لەسەر خواپەرستی، شـایەکان لێـی دەترسـان، زۆر ڕێزیان دەگرت، لە ٦٣٧ك - ١٢٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٤٩.
٢. شذرات الذهب ٥/١٨٤.
٣. البداية والنهاية ١٣/١٥٧.
٤. معجم أعلام الكورد ٣٥٣.
٥. سير أعلام النبلاء ١٣/٢٣٢ - ٢٣٣.

بەیارمەتی خوای گەورە تا ئێرەم نووسی لە شەوی سیٚ شـەمەی ١٧ی مـانگی ذي القعدەی ساڵی ١٤٢٨ك بەرانبەر بە ٢٧/١١/٢٠٠٧ز.

خوای گەورە لەگەڵ ئەو زاتانە لـە بەهەشـت کۆمـان بکاتـەوە، لـە دیـتنی خـۆی مەحروممان نەکا، بەخزمەت خۆشەویست و یارانی بگەین، ئامین

## ١. ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

| لاپەڕە | دەقی ئایەتەکان |
|---|---|
| ٢٢٥ | ﴿انما أمره اذا أراد شيئاً أن يقول له كن فيكون﴾ يس / ٨٢ |
| ٣٦٠ | ﴿أنهم كانوا في شك مريب﴾ النساء / ٥٤ |
| ٣٣٥ | ﴿الله نور السموات والارض... ﴾ النور / ٣٥ |
| ٢٨٤ | ﴿الا يعلم من خلق وهو اللطيف الخبير﴾ الملك / ١٤ |
| ٥٤ | ﴿ختامه مسك وفي ذلك فليتنافس المتنافسون﴾ المطففين / ٢٦ |
| ٢٣٨ | ﴿ستدعون الى قوم اولى بأس شديد...﴾ الفتح / ١٦ |
| ٢٢٤ | ﴿كل من عليها فان... ﴾ الرحمن / ٢٦ |
| ٢٠٠ | ﴿يبشرهم ربهم برحمة منه ورضوان وجنات لهم فيها ...﴾ التوبه / ٢١ |

## ٢. فەرموودەکانی پێغەمبە (دروودی خوای لێ بێ)

| لاپەڕە | دەقی فەرموودەکان |
|---|---|
| ٣٢٥ | اذا أجتهد الحاكم فأصاب فله أجران، واذا أجتهد فأخطأ فله أجر واحد / رواه البخاري |
| ٤٢٠ | خياركم الذين اذا رؤا ذكرالله عز وجل / ابن ماجه |
| ٣٦٠ | دع ما يريبك الى ما لا يريبك / الترمذي |
| ١٥٣ | كان رسول الله صلى الله عليه وسلم ربعة ليس بالطويل ولا بالقصير / الترمذي |

٣. ناوی زانایان:

